


زنجیرەی کتێبی لاوان ٦

# یاشار کەمال • سوڵتانی فیلەکان و مێروولە شەلە ڕیشسوور

سەلاحەدین بایەزیدی

لە تورکییەوە کردوویە بە کوردی










# سوڵتانی فیلەکان و

# مێرووە شەلەی ڕیشسوور

یاشار کەمال




لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی

ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

زنجیرەی کتێب: **(٢٤٢)**

زنجیرەی کتێبی لاوان: (٦)

# سوڵتانی فیلەکان و مێرووە شەلەی ڕیشسوور

## یاشار کەمال

سەلاحەدین بایەزیدی

لە تورکییەوە کردوویە بە کوردی


- بەرگ: باسم ڕەسام
- نەخشەسازیی ناوەوە: غەزەلنووس
- ڕێنووس و هەڵەچنی: غەزەلنووس
- چاپ: یەکەم/ ٢٠١٨
- چاپخانە: تاران
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- نرخ: (٧٠٠٠) دینار
- بڵاوکار: ناوەندی **غەزەلنووس**- بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە




سلێمانی- مەیدانی پاسەکانی تووی مەلیک- نهۆمی زەمینی بازاڕی کتێب

ژمارەی تەلەفۆن: ٠٧٧٠٣٥٧٣٧٥٧

www.xazalnus.com

سـولتانی فیلەکـان، فیلێـک بـوو زەبەلاح، شـکۆدار و لە کۆترێکی سپی، سپیتر. لەسـەر تەختەکەی دانیشـتبوو و چاوەڕوانی قاسیدەکەی بوو، لە جموجووڵی ڕا دیـاربوو حەجمینی نییە.

ئینجـا، ئەو قاسـیدەی مـاوەیەک لەوەوپـێش چـاوەڕوانی دەکرد، بەدیـارکەوت. ئەم مەلە، سـەرکردەی پەپووەکـان بوو. دیاربوو باڵە پانە سپی و ڕەشەکانی هـیلاکن. شـان و بـاهۆی بەرزی وەک فەنەرێـک کەوتبـووە بـان سـەر و گەردنی نـارنجیرەنگی. پەڕەکـانی لەژێر تیریـژی زێڕینـی خـۆردا بریقەیـان دەهـات. پەڕە زراف و سـپییەکانی سینگی، خاڵخاڵ بوون.

پـاش ئەوەی سـێ جـار بە دەوری سـەری سـولتانی فیلەکاندا فڕی و سێ ئەڵقەی نارنجیرەنگی دروست کرد، لەسەر لقی دارێک، لە نزیک لووتی فیلەکە هەڵنیشت.

سولتانی فیلەکان بە پەلەپەل گوتی:

"قسه بکه... قسه بکه... بەخێر بێی، بان سەر و بان چاو... قسه بکه، دەنگوباسی مێروولەکان، ئاخۆ مزگێنییەکی خۆشت بۆ هێناوم؟"
پۆپەبەرز، زۆر شەکەت بوو، چوار جار لەسەر یەک باڵەکانی هەڵتەکاندن، گەڵا چنارەکانی ژێر پێی هەڵلەرزینەوە.
پۆپەبەرز گوتی:
"ساغ بی سوڵتانم. ڕاوەستاو بی. هەواڵی خۆشم لە مێروولەکانەوە هێناوە. حەوت مانگی تەواو لە وڵاتی ئەوان مامەوە. زۆر باش لەگەڵم جووڵانەوە، میوانداریيان کردم، نان و ئاویان پێ دام، دۆستایەتییان نواند. من لەم دونیایەدا هەرگیز بوونەوەری وەهام نەبینوە."
سوڵتانی فیلەکان گوڕاندی:
"ئەمانە چ جۆرە بوونەوەرگەلێکن، من تا ئێستا مێروولەم نەبینوە."
پۆپەبەرز سێ جار باڵەکانی لێک کردەوە و گوتی:
"شتی چکۆڵە چکۆڵەن. ئەو بوونەوەرانە هێند بچووکن ئەگەر لە نزیکەوە لە مێروولەیەک نەڕوانی، ناتوانی بیبینی."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"بۆم باس بکە. باسی هونەری ئەم بوونەوەرە بچووکانەم بۆ بکە. من ئیشم بەوە نەداوە وردن، یان درشت، هونەرەکەیانم گەرەکە..."

پـۆپەبەرز، ئیتـر مانـدوویەتی ڕێـگەی ڕەویبـووەوە. هەناسەی هاتبووەوە بەر. چریکاندی:
"چـاوەکەم، سـوڵتانم، دە ئێسـتە گوێـت لە هـونەری مێروولەکان بێ."
دەستی بە گێڕانەوە کرد. هەتا زیاتر لەسەریان دەدوا، سـوڵتانی فیلەکـان پتـر چاوەکـانی ئەبـڵەق دەمـان.
پەیتاپەیتاش لە پۆپەبەرزی دەپرسی.
"لە بن عەرز، شاری وایان دروست کردووە، مەپرسە سـوڵتانم... شـارگەلی بەشـکۆ و پێشـکەوتوو. عەمبارەکانیـان، سـاڵ دەری دوانـزە مـانگێ، پڕاوپڕە لە خواردەمەنی، لە هەنگوین، لە شیلەی گوڵ، لە دانەوێڵە و دەعبـای مـردوو. پایتەختەکانیـان ڕێـک لە نێوەڕاسـتی دەشـتە هەراوەکانـدا دروسـت کـردووە. ئەم دەشـتانە بەرەکەتیان لە کەنارەکانی نیل و چووکوورئۆڤاش پترە. بەتـایبەتی دەشـتێک هەیە، وڵاتێـک هەیە، هێنـدە بەپیـتە، فیلـی لـێ بچێنـی، شـین دەبێتەوە. بەشـی بـاکووری ئەم وڵاتە بە دارستانی زۆروزەبەند داپۆشراوە. لێڕەوارێکە پڵینـگ زەفەری پـێ نابـا. بەشـی باشووریشـی دوانـزە مانگی ساڵ کەسکە، بە درێژایی ساڵ، تەواوی دەشتەکە پڕاوپڕە لە گـوڵ، تـا چـاو هەتەر کـا ڕێـک و لـووس... ڕۆژهەڵاتی کێڵگە و ڕۆژئاوای کێڵگەیە، گیانی بنیادەمی لـێ بچێنـی، شـین دەبێـتەوە، پەلەوەری لـێ بچێنـی، مێروولەی لێ بچێنی، شین دەبێتەوە."

پۆپەبەرز بەدەم گێڕانەوەوە هاتە جۆش و تا زیاتر جۆشوخرۆشی بەسەردا زاڵ دەبوو، پتر دەچووەوە نێو باسەکەوە. ڕۆژێک و شەوێک بێ ڕاوەستان باسی مێروولەکان، شارەکانیان و وڵاتەکانیانی بۆ سوڵتانی فیلەکان گێڕایەوە. سوڵتانی فیلەکانیش ئاگای لە خۆی نەمابوو و بە تاسووقەوە گوێی بۆ مەلەکە ڕاداشتبوو.
پۆپەبەرز بینیی سوڵتانی فیلەکان لەناکاو لە جێگەی خۆی ڕاچەنی و هاواری کرد:
"فیلەکانم هەموویان کۆببنەوە."
بە گوڕەی دەنگی سوڵتان چیاکان هەژان.
فیلەکان هێدی هێدی کۆبوونەوە. تەنانەت هەندێکیان لە وڵاتانی دوورەوە هاتن. سێ ڕۆژ و سێ شەوی خایاند تاکو لە دەوری یەک خڕبوونەوە.
کە فیلەکانی سەروو ژوور هەموویان هاتنە لای یەک، سوڵتانی فیلەکان بە پۆپەبەرزی گوت:
"قسە بکە. باسی هونەری مێروولە وردەکان بکە، ئەو مێروولانەی هێندە وردن تەنانەت بە چاو نایانبینین."
پۆپەبەرز لە شەقەی باڵی دا و فڕی، بەسەر فیلە لێک کۆبووەکاندا چەندین جار سووڕایەوە و بازنەی نارنجیرەنگی دروست کردن. کە ئەو باسی مێروولەکانی دەکرد، فیلەکان خەیاڵ دەیبردن و لیکاویان بە زاردا دەهاتە خوار.
دواجار سوڵتان چووە سەر تەختایی ترۆپکی گردێک. کورسیە پان و کۆنەکەی لەوێ بوو. پاڵی وێ داوە و پرسیی:

"گوێتان لێ بوو؟ گوێتان لە هونەری مێروولەکان بوو؟"
فیلەکان گوتیان:
"گوێمان لێ بوو."
سوڵتان گوتی:
"فیلێک، تەنیا یەک فیل، ڕەنگە لە چەند ملیارد مێروولە مەزنتر بێ."
پاشان ڕووی کردە پۆپەبەرز و لێی پرسی:
"وا نییە؟"
پۆپەبەرز:
"ڕەنگە گەورەتریش بێ."
سوڵتان گوتی:
"لەم بارەوە دەڵێن چی؟ ئێوە چۆن بیر دەکەنەوە؟"
فیلەکان گوتیان:
"جا بڵێین چی، سوڵتانمان باشتر دەزانێ."
"کە وایە بۆ پێشەوە بەرەو وڵاتی مێروولەکان... خێرا کەن..."
سوڵتان لەپێشی پێشەوە بوو، ڕێک لەژوور سەری، سەرکردەی پەپووسلێمانکەکان، واتە پۆپەبەرز دەفڕی، لە پاشەوەش، سوپای فیلەکان ڕێیان دەکرد.
پۆپەبەرز لە سوڵتانی پرسی:
"دەڵێن چی منیش پەپووەکانم بانگ بکەم؟ ڕەنگە سوپاکەی ئێمەش یارمەتیدەر بێ."
سوڵتان گوتی:
"دەی لەسەر چی ڕاوەستاوی، خێرا بانگیان بکە پۆپەبەرزی برا. یانی چی ڕەنگە یارمەتیدەر بن، جا

ئەگەر سوپای پەپوولەکان نەبێ، ئەگەر ئەو تیژفڕە پۆپە نارنجییانە نەبن، من لەم دونیایە چیم لەدەست دێ...
خێرا بانگیان بکە، هەموویانم بێ کەموزیاد دەوێ."
پۆپەبەرز باڵی لێک دا و گوتی:
"باشە. تاوێکی تر هەر هەموویان کۆدەکەمەوە. تۆ ساغ بێ سوڵتانم. خوا پشت و پەنات. بەو هیوایەی سەفەرەکەمان بۆ وڵاتی مێروولەکان بە سەرکەوتوویی کۆتایی بێ."
سوڵتان گوڕاندی:
"بە سەرکەوتوویی کۆتایی دێ."
هەموو فیلەکانیش قسەکەیان دووپات کردەوە.
زۆری پێ نەچوو، ئاسمان پڕ بوو لە شەققەی باڵ. لەژوور سەری فیلەکان، هەورێک لە باڵی ڕەنگاوڕەنگ و پۆپەی نارنجیی پەپوولەکان دروست بووبوو. ئاسمان بە چاو نەدەبینرا.
پۆپەبەرز هاواری کرد:
"سەفەرەکەمان بۆ وڵاتی مێروان بە سەرکەوتوویی کۆتایی دێ."
سەرجەم پەپوو و فیلەکانیش، وەک ئەو و بە هەمان دەنگ، هاواریان لێ بەرز بووەوە.
بە کەیفخۆشییەوە درێژەیان بە ڕێگەکەیان دا. سوپای فیلەکان، پێی نابایە هەر خاکێکەوە، دونیا دەلەرزی. لە سەرەوە، پەپووەکان لە هێڵێکی ڕاستدا، باڵیان وە باڵی یەک دابوو، هەورێکی ڕەنگاوڕەنگ و نارنجییان پێک

هێنـابوو، دەدرەوشـانەوە و دەفـڕین، لە خـوارەوەش، فیلەکـان بە لەنـجەولار و ورگ بە ورگـی یەکتـر ڕێیـان دەکرد. جارجارە گوێچکە زلەکانیان وەک بایەوان لێک دەکردەوە.

سـوڵتانی فیلەکـان، سـپی سـپی، گەش گەش، پـاک و خـاوێن، بە تەنیـایی لە پێشـەوە دەڕۆیشـت، سـەرۆکی پەپووەکانیش، پۆپەبەرزی کۆنە هـاوڕێی، بستێک دوور، لەژوور سـەری دەفڕی و هەردووکیان پێکەوە قسەیان دەکـرد. سـوڵتانی ژێـری فیلەکـان لە گـژ فکـرەوە ڕۆچووبوو. ئیشی مێروولەکان هەر وا ئاسـان نەبوو. لە کاتێکدا ئەو هەموو مێروولەیە لە دونیادا هەبوون، ئاخۆ وەهـا ژیانێـک ڕەوا بـوو، بـۆچی خـوا ئەو هەمـوو مێـروولەیەی ئافرانـدووە؟ هەڵـبەت هۆکارێـک هەیە کە وەهـا زۆر خـوڵقێنراون. بە گـوێرەی قسـەکانی سـەرکردەی پەپووەکـان کە سـارد و گەرمـی ڕۆژگـاری چێشـتبوو، شـاخ و داخ هەمـووی مێـرووە و ئەو مێروولانە هێندە کار دەکەن، هێندە شاری دڵڕفێن بونیاد دەنـێن، هێنـدە خـواردەمەنی لەسـەر یەک کەڵەکە دەکەن نەبێـتەوە... هەڵـبەت گشـت ئەمـانە حیکمەتێکیـان هەیە. سوڵتانی فیلەکان بەدەم ڕۆیشتنەوە، لەگەڵ خۆیدا بیری لەم شـتانە دەکـردەوە و ئەسـەفی دەخـوارد پێشـتر بە گەنجێتـی ئەم مێـروولانەی نەناسـیوە. دەرفەتێکـی زۆر بەنرخ بە فیڕۆ درابوو. لاوێتی و ژیانی فیلەکان بێهوودە لەکـیس چووبـوو. باشـە ئەم فـیلە زل و زەبەلاحـانە

دەبوایە لەم دونیایەدا بەم جۆرە بن، بەم جۆرە ژیانێکی بەرتەسکیان هەبێ؟ بەلام سولتان چ بکا، شتێک بوو قەومابوو، گەنجێتی تێپەڕیبوو. دەبوایە ژیانی لەمەوبەدوا باش بەکار بهێنرێ.

پۆپەبەرز پاش ڕێپێوانێکی سێ ڕۆژە گوتی:

"گەیشتینە ولاتی مێروولەکان سولتانم."

سولتان پرسیی:

"کوانێ؟"

پۆپەبەرز:

"ئەم دەشتە دەبینن سولتانم، لە دەسپێک ڕا تا کۆتایی، بست بە بستی، تا ئەو شوێنەی چاو هەتەر کا، تا ئەوبەر کە وەک دەریایەکی هەراو پان بووەتەوە، ولاتی مێروولەکانە. لە نێوەڕاستی ئەم دەشتەدا چیایەک هەیە، لەودیوی ئەم چیایەش ولاتێکی بەرینتر لەمەیان... ئەو ولاتەش، ولاتی مێروولەکانی دیکەیە. لەولاش ولاتگەلی تر هەن..."

ئاوڕی لە ڕۆژهەلات دایەوە، تا چاو بڕ بکا لێڕەوار بوو، ئاوڕی لە ڕۆژئاوا دایەوە، مەزرایەک بوو پڕاوپڕ لە گولی پشکووتوو، ئاوڕی لە باکوور و باشوور دایەوە، چیا، گۆل، گول و درەختی بەدی کرد. فیلەکان ڕاوەستابوون و بە تامەزرۆییەوە نوقمی بینینی ئەم ولاتە چۆل و جوان و ڕووناکە بوون.

سولتانی فیلەکان گوڕاندی:

"ئامادە بن!"

فیلەکان ئامادە بوون.

"ئێستا لە سەری بڕوانن!"

فیلەکان تێکڕا قۆرتمەکانیان بەرز کردەوە.

"ئەم پۆپەبەرزە کە بەسەر ئێوەدا دەفڕێ، ڕێبەر و ڕێزانتانە. لە پێشتانەوە دەفڕێ و شارەکانی مێروولەتان نیشان دەدا. ئێوە ئادار بەسەر پاداری شارە مێروولەکان ناهێڵنەوە، تاوەکو مێروولەکان بە چۆک دادێن، کە بە چۆکیش داهاتن، دەبێ بێنە بەردەمم و کڕنووش بەرن. سەربازەکانم، فیلەکانم، جارێکی تر دووپاتی دەکەمەوە، تا ئەو کاتەی مێروولەکان دەستەودامێنتان نەبن، لە فرمێسکی چاوانیان مەڕوانن. فەرماندەکانم، لەگەڵ ئێوەمە، ئەو فیلەی بچووکترین بەزەیی بە مێروولەکاندا هاتەوە، بیکوژن. سەربازی فیل دڵی ناسووتێ. سەربازی فیل لەپێناو پاراستنی دوا دەوڵەتی فیلەکان، بەزەیی لە دڵی دوور دەخاتەوە. فیلەکان، برایانم، ئەمە یەکەم جەنگی گەورەی ئێوەیە. ئەگەر لەم جەنگەدا سەرکەوین، ئەوا دەبینە حوکمڕانی هەموو دونیا. فیلەکان، برایانم، گشت بوونەوەرەکانی دونیا و مێژوو ڕاوەستاون و سەیری ئێمە دەکەن. سەیری ئەم جەنگە پیرۆزەی ئێمە. ئەگەر ئەمڕۆکە مێروولەکان بە چۆکدا نەهێنین، هیچ کام لە بوونەوەرەکانی دونیا و مێژوو لێمان نابوورن. دیرۆک، سەرکەوتنی ئەمڕۆمان بە پیتی زێڕین دەنووسێتەوە. فیلەکان شایانی ئەوەن لە جەنگی ئەمڕۆدا سەرکەوتنی

گەورە بەدەست بێنن، چونکە فیلەکان بەهەیبەتن، چونکە فیلەکـان ڕەسـەنن، چـونکە ماندوونەناسـن. مێـژووی چوارسەد ساڵەی فیلەکان لە ئاسمانەوە سەیرمان دەکا. ئەگەر ئەمڕۆ لە جەنگی دژ بە مێروولەکان کە هێرشیان کردووەتە سەر نیشتمانی ئێمە و دوژمنایەتیمان دەکەن، سـەرنەکەوین، ئەوا مێـژوو، مێـژووی فیلەکـان نامـانبووری. فیلەکـان، برایـانم، سـەربازەکانم، ئەگەر لە جەنگی ئەمڕۆدا، شکستمان بدەن، ئەوا مێروولەکان کە بە خوێنی ئێمە تینوون، ناهێڵن هیچ کام لە ئێمە زیندوو بمێنیـنەوە، وردودرشـتمان دەخـۆن. ئینجـا وەچەی فیلەکـان دەسـڕدرێتەوە. جـا بـۆیە فیلەکـان، برایـانم، سـەربازەکانم، لەپێنـاو بەردەوامبـوونی وەچەکانمـان، دەبێ جەنگی ئیمڕۆ ببینەوە، لە وڵاتی مێروولەکان، بەرد لەسەر بەرد و کەللە لەسەر جەستە نەهێڵینەوە.

ئا بەم شێوەیە سوڵتانی فیلەکان لە کاتێکدا کە لەسەر دوو پێی پاشووی بەرز بووبووەوە، پێیەکانی پێشووی لێک کردبووەوە، قۆرتمەکەی درێژ کردبوو و دەهاتە گۆ، فیلەکانی دژ بە مێروولەکان ورووژاند و لە ناخی هەر فیلێکدا گڕی تۆڵەیەکی بێسنووری داگیرساند.

بە پێشانگەیەتی سەرکردەی پەپووەکان، پێنجسەد فیل، پێنجسـەد دێـوزمەی مەرگ، پێنجسـەد کـین کە وەک پێنجسـەد تەوری تیـژ دەدرەوشـانەوە، ڕوویـان کـردە شـاری مێروولەکـان. شـەڕێکی گەورە بەرپـا بـوو. مێـرووڵەی سـوور، ڕەش، زەرد، مێـروولە عەجەمە بە

ولات و شارەکانیانەوە لەژێر پێی فیلەکان، لەگەڵ خاکدا یەکسان بوون.

شەڕێکی گەورە داگیرسابوو، شەڕێک کە لە گوتن نایە و کەوتە نێو مێژووی فیلایەتیەوە. گەورەترین حەماسە لە مێژووی جەنگی فیلەکاندا تۆمار کرا.

لەناکاو شین و ڕۆڕۆ گەیشتە کەشکەلانی ئاسمان. کتوپڕ دووکەڵی مەرگ و وێرانی، باڵی بەسەر ولاتی مێروولەکاندا کێشا. بە ڕۆژی ڕوون، لەبەر تۆز و دووکەڵ، چاو چاوی نەدەبینی. لە کاتی خۆرئاوابووندا، ژمارەی مێروولەکانی ولات نیوە بووبووەوە. ئەوانەی ڕایانکرد، ڕزگاریان بوو، ئەوانەی نەیانتوانی ڕابکەن، پان بوونەوە.

سوڵتانی فیلەکان دووراودوور دانیشتبوو و سەیری مەیدانی جەنگی دەکرد، لووتبەرزانە لە شەڕ و ململانێی فیلەکانی دەڕوانی. تۆز و دووکەڵ تا دەهات زیاتر لەسەر ولاتی مێروولەکان کەڵەکە دەبوو.

سوڵتان، سەرکردەی پەپووەکانی بانگ کرد:

"کوا چ ڕووی دا، ئەگەر ئەم شوێنانەی لەبەر چاون، ولاتی مێروولەکان بێ، ئەگەر ئەوەی دەیبینم ڕاست بێ، ئەوا سەرجەم ولاتەکانیان لەگەڵ خاک یەکسان بوون. پێم سەیرە ئەمانە بۆچی دەستەودامێنی ئێمە نابن."

لە چاوەکانیدا جۆرێک شڵەژان و ترس بەدی دەکرا.

پۆپەبەرز گوتی:

"سوڵتانی من، سوڵتانم، کار لە دەستەودامێن و شتی وا تێپەڕیوە، دابنوێ و بڕوانە، لە سەرەتای جەنگەکەوە تا

ئێستا، بگرە بەر لەوەی جەنگ دەست پێ بکا، بە هەزاران مێروولە، بۆ ئەوەی لێیان ببووری، خۆیان هاویشتووەتە بەر پێت... دابنوێ و سەیر کە."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"هیچ نابینم."
پۆپەبەرز گوتی:
"ئەوان زۆر بچووکن. هەر بەقەد نووکەدەرزییەک دەبن. فیلێک لە مەودایەکی وەها دوورەوە ناتوانێ بیانبینێ."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"ئاخر دەنگیشیان نابیستم."
پۆپەبەرز گوتی:
"دەنگیان ناسکە. باشتر کە دەنگی ئەوانت گوێ لێ نابێ. ئەگەر دەنگی ئەوانت بیستبا، دڵت پێیان دەسووتا... وەها دەگرین و لە خۆ دەدەن کە خوا شاهیدە ئەوەی دڵی هەبێ، بەرگە ناگرێ، تەنانەت من بە مەلێتی خۆم، کە بوونەوەرێکم لە سەرەوە و دەرەوەی دونیا، بەرگەی شین و ڕۆڕۆیانم نەگرت و لە خەفەتان دڵم هەپروون بە هەپروون بوو. تۆ بە هیچ شێوەیەک، بە هیچ شێوەیەک بەرگەت نەدەگرت سوڵتانم، بە هیچ شێوەیەک! چ باشتر گوێت لە ئاخ و ناڵینی ئەوان نەبوو... سەربازەکانیشت گوێیان لە دەنگی گریانی ئەوان نابێ، خوێنی ڕژاو و سەری براویان نابینن... چ باشتر نایبینن، بەم جۆرە دەتوانن بێبەزەییانە درێژە بە شەڕەکە بدەن. سەیرێکی ئاسمان بکە، لە مەلەکانم

بڕوانە سوڵتانم، ئاخۆ هیچ کامیان بەسەر ئاسمانی وڵاتی مێروولەکاندا دەفڕن؟ گەلۆ دڵێک هەیە بەرگەی ئەم دۆخەی مێروولەکان و دارمانی شارەکانیان بگرێ، دڵێک دڵ بێ، دەتوانێ خۆ ڕابگرێ؟"
سوڵتان گوتی:
"خۆ ڕاناگرێ. باشتر کە نابینین و نابیسین."
"دیارە ئەگەر هەموو بوونەوەرەکان شەڕیان بینیبا و بیستبا، ئەگەر هەموو بوونەوەرەکان گوێیان لە هاواری شەڕ بوایە، لەم دونیایەدا شەڕ ڕووی نەدەدا. پوخڵەواتی شەڕ شتێکی نامۆیە... خراپییەکانی شەڕ، شتێکی شاراوەن، بۆیە بوونەوەرەکان شەڕ پەسەند دەکەن!"
سوڵتان گوتی:
"مێروولەکان سواری باڵەکانت بکە و بیانهێنە با بیانبینم. با قسەیان لەگەڵ بکەم. جێگەی داخە، کارێکی باش نەبوو سەرجەم وڵات و شارەکانی ئەوانمان وێران و لەگەڵ خاک یەکسان کرد."
پۆپەبەرز گوتی:
"جێگەی داخ نییە، چونکە مێروولەکان زۆر باش زانییان فیلەکان کێن، تا دونیا دونیا بێ، لە حاند فیلەکان سەر بەرز ناکەنەوە. بۆ مێروولە مردووەکانیش خەفەت مەخۆ، لەم دونیایەدا، وڵات و شاری مێروولەکان ئەوەندە زۆرن بە مێشکی ئەلەکترۆنییش لە ژمارە نایەن، بە پانکردنەوە و کوشتنیان پێیان ڕاناگەین..."

سوڵتان گوتی:
"باشە، ئەگەر وا بێ. ئێستە ئەو مێروولانە سواری باڵەکانت بکە و بیانهێنە، با یەک دوو قسەیان لەگەڵ بکەم. با بزانم ئەم مێروولانە چ کەسن."
پۆپەبەرز لە بن پێی سوڵتان نیشت، مێروولەکان لەوێ بە شینوزاری وە سەر یەک دەپەڕین.
پۆپەبەرز هاواری کرد:
"بێدەنگ بن."
مێروولەکان بە بینینی پۆپەبەرزی کۆنەهاوڕێیان، ئەوەندە خۆشحاڵ بوون، ئەوەندە خۆشحاڵ بوون نەبێتەوە. وازیان لە شین و گریان و ڕۆڕۆ هێنا و بە دڵخۆشی هاواریان کرد و گوتیان:
"لە ڕۆژی تەنگانەدا، باش بە فریامان گەیشتی، نەخاسمە کە زمانی فیلەکانیش دەزانی، ڕێگەیەکمان بۆ کن سوڵتان بۆ بدۆزەوە."
پۆپەبەرزیش گوتی:
"ئەمنیش هەر لەبەر ئەمە هاتم بۆ لاتان. دەتانبەمە کن سوڵتان. سوڵتان داوای ئێوەی کرد. سواری باڵەکانم ببن."
سەرەتا مێرووە ڕیشسوور سواری باڵی پۆپەبەرز بوو. بەدوای ئەویشدا، ڕیشسپی و سەرۆکی مێروولەکان، پەرێشان و شێواو، سواری باڵ و پشتی پەپووسلێمانکەکە بوون.
پۆپەبەرز فڕی، سێ جار بە دەوری سەری سوڵتاندا سووڕایەوە، سێ بازنەی نارنجیڕەنگ و بریقەدار وەکو

تاجێکی زێڕین لە بان سەری سوڵتان درەوشانەوە. پاشان لەسەر نووکی قۆرتمەکەی سوڵتان نیشتەوە.
سوڵتان فەرمووی:
"نزیکتر بنیشەوە، ئەم شتە بچووکانە نابینم، ناویان مێروولەیە، وا نییە؟"
سەرکردەی پەپووەکان گوتی:
"بەڵێ، ناویان مێروولەیە."
ئینجا کەمێک فڕی و ڕێک لە بن چاوەکانی فیلەکە نیشتەوە.
سوڵتان بە خۆشحاڵییەوە هاواری کرد:
"بینیمن، ئەمانە هەر بەقەد نووکەدەرزییەک دەبن، ئەمانە مێروولەن؟"
پۆپەبەرز گوتی:
"خۆیانن. دیارە ئەوانەی سەر باڵەکانم گەورە و سەرکردەی مێروولەکانن."
سوڵتانی فیلەکان بە سەرسوورمانەوە گوتی:
"حەی حەی! حەی حەی! ئەمە یانی چی، ئەمانە چۆن بوونەوەریکن کە هەر کامیان دونیایەک بە کۆڵ دەگێڕن؟ وا نییە دەنا؟"
پۆپەبەرز گوتی:
"وایە. هەر مێروولەیەک دونیایەک، بگرە دەتوانێ فیلێک لە کۆڵ بکا."
سوڵتانی فیلەکان جارێکی دیکە لە خۆشیان هاواری کرد:

"گوێم لە دەنگیشیان دەبێ. چ دەنگێکی سەیریان هەیە."
گوێچکە بایەوانەکانی لێک کردەوە و بەردەوام بوو:
"لە ویزەویز ناسکترە، وا نییە دەنا؟ دەڵێن چی، وشە بە وشە قسەکانیانم بۆ وەربگێڕە، قسەکانی منیش بۆ ئەوان وەربگێڕەوە."
پۆپەبەرز گوتی:
"بەسەر چاو. قسەکان وشە بە وشە وەردەگێڕم سوڵتانم. سەیری باڵم بکە."
"سەیرم کرد."
"ئەو مێروولەیەی لەسەر نووکی باڵم ڕاوەستاوە، ڕیشسوورە. سەرتاپا غەرقی خوێنە."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"دەیبینم."
پۆپەبەرز گوتی:
"مێروولەیەکی ئاسنگەرە."
فیل بە حەپەسانەوە گوتی:
"ئەها، کەوایە مێروولەکانیش ئاسنگەریان هەیە!"
پۆپەبەرز گوتی:
"هەیانە. مێروولەکان، سەرجەم پیشەکانی دونیایان هەیە. بیناسازی هەرە باش، ئەندازیاری هەرە باش، لەنێو سەرجەم بوونەوەرەکاندا، لەم مێروولانە هەڵدەکەوێ. دەڵێن یەکەم ئاسنگەرەکانیش لەنێو بوونەوەرەکاندا هەر مێروولەکان بوون. باب و باپیری ئەم ڕدێنسوورە سوڵتانم، لەوەتەی دونیا دونیایە هەر

ئاسنگەر بوون. ئەمیش بووەتە سوڵتانی ئاسنگەرەکان.
دەڵـــێ تاوێـــک لەمەوپـــێش فیلەکـــان دوکـــانی
ئاسنگەرییەکەیان بەسەر سەریدا وێران کردووە و لاقی
ڕاستی لە بن دیواردا ماوەتەوە و لێبووەتەوە."
سوڵتان گوتی:
"پەککوو، پێم ناخۆشە ئاسنگەرێک لاقی پەڕیوە. بەڵام
ئەگەر قۆڵی پەڕیبا چ دەبوو؟"
ڕیشسووری خەڵتانی خوێن هاواری کرد:
"ئەودەم بمردبایەم باشتر بوو. ئاسنگەرێکی بێقۆڵ، وەک
ئەوە وایە مردبێ."
ســـوڵتان کە دڵـــی بە ڕیشســـووری خەڵتـــانی خـــوێن
دەسووتا، گوتی:
"وەک ئەوە وایە مردبێ."
ڕیشسوور هاواری کرد:
"بۆچی دڵت پێم دەسووتێ؟"
سوڵتان گوتی:
"پـــێم ناخۆشـــە ئاســـنگەرێکی وەســـتا، تووشـــی وەهـــا
وەزعێـک دەبـێ. پەڕینـی قـاچی ئاسـنگەرێک، تەنـانەت
ئەگەر مێروولەیەکیش بێ، دەمژاکێنێ."
مێروولەی ڕدێنسوور سـەرەڕای ئێش و ژانێکی زۆر، قیت
بووەوە و گوتی:
"ئێمە چیمان لە تۆ کردووە، ئێمە چیمان لە تۆ کردووە
ئەی سوڵتانی سوڵتانەکان؟ ئێمە چیمان لە تۆ کردووە
ئاوات بەسەرهێناوین؟ سەیری پێش خۆت بکە، بڕوانە

وڵاتی مێروولەکان چیی بەسەرهاتووە، بڕوانە و لەبری ئەوەی دڵی بەردینت بە من بسووتیَ، با بەو جوانترین وڵاتانەی دونیا بسووتیَ کە لەنێو ئاگردا قرچەقرچیانە و خاپوور بوون."

پۆپەبەرز وە منگەمنگ کەوتبوو و نەیدەزانی چۆن قسەکانی ڕیشسوور وەربگێڕێتەوە کە سوڵتانی فیلەکان هاواری کرد:

"قسەکانی ئەم شەلەم وەک خۆی بۆ وەردەگێڕیتەوە. وشەیەکی بپەڕێنی، باڵەکانت دەگرم و دەتکەم بە دوو لەتەوە."

پۆپەبەرزیش قسەکانی ڕیشسووری موو بە موو بۆ سوڵتان وەرگێڕا.

سوڵتانی فیلەکان لە داخان لاقی ڕاستی لە عەرزی کوتا. جەستەی سپیی لە ڕقان سوور سوور هەڵگەڕابوو و ددانە درێژەکانی لە چیرەوە برد:

"من، ئێمەی فیل هێرشمان کردووەتە سەر ئێوە؟ ئەوە شێت بووی ئاسنگەر؟ نەتەوەی فیل، قەت، هێرش ناکاتە سەر هیچ نەتەوەیەک: نەتەوەی فیل، ئاشتیخوازە، خەباتکارە، جوامێرە. بۆچی، لەبەر چی، لە خورتوخۆڕایی هێرش بکەنە سەر وڵاتی مێروولەکان؟ باش بزانە سەرۆکی ئاسنگەران، ئێمەی فیل تەنیا خۆمان دەپارێزین. تۆ لەبەر ئێش، لە داخی پەڕینی لاقت، پەلامارەکە دەخەیتە ئەستۆی فیلەکان. ئەم کاولکارییەی بەرامبەرمان، ئەم تەپوتۆزە پەیوەندیی بە

ئێمەوە نییە، هیی هێرشی ئێوەی مێروولەیە. گشت دونیا ئەمە دەزانێ. یەکەم هێرش ئێوە دەستتان پێ کرد، ئێوە، ئێوە، ئێوەی مێروو، ماڵەکان و شارەکانتان بەسەر ئێمەدا ڕوخاند، ئێستەش سزاکەی دەبیننەوە. بەڵێ، هەڵبەت سزاکەی دەبیننەوە. فیلە ئاشتیخوازەکانتان تووڕە کرد. کە فیلیش تووڕە بن، ئەو شتە ڕوو دەدا کە دەیبینن. ئێوە بە زۆربوونی خۆتان دەنازی و هێرشتان کردە سەر وڵاتی فیلەکان. ئێوە یاسای بوونەوەرە یەککرتووەکانتان خستە ژێر پێ. فیلەکان کەمینە و ئێوە زۆرینە بوون، بەڵام نەتانزانی کەمینەی بەهەق لە زۆرینەی ناهەق بەهێزترە."

سوڵتانی فیلەکان ڕاوەستا. هەناسەیەکی هەڵکێشا، قۆرتمەکەی بۆ ڕاست و چەپ وەرسووڕاند و پاشان گوتی:

"ئێوە، بە هێرشکردنە سەر وڵاتی فیلەکان هەڵەیەکی گەورەتان ئەنجام دا. سزاکەشتان بە قورسترین شێوە بینی."

ڕیشسوور و مێروولەکانی دیکە زمانیان گیرابوو و تەنانەت قسەیان بۆ نەدەهات. جار نا جارێ وشەگەلی "ئێمە، ئێمە هێرشمان کردە سەر فیلەکان، ئێمە؟"یان لە زار دەهاتە دەر و هیچی تر.

دواجار ڕیشسوور کە زاری وشک بووبوو، هاتە گۆ:

"سوڵتانی مە، ئێمەی مێروولە چۆن دەتوانین هێرش بکەینە سەر ئەو فیلە زەبەلاحانە کە هێندەی خوا گەورەن؟"

"ئێوە پشتتان بەوە بەست کە زۆرینەن و هێرشتان کرد، ئێوە پەلامارتان هێنا."
"هێرشمان نەکردووە."
سوڵتانی فیلەکان گوڕاندی:
"چی؟ خۆ دژایەتیی قسەکانیشم دەکا! پۆپەبەرز ئەمانە لەسەر پشتت ڕا فڕێ بدە بن پێم..."
پۆپەبەرز پاڕایەوە و گوتی:
"تکایە سوڵتانم، تکایە سوڵتانم، خراپ تێگەیشتنێک لەگۆڕێیە. ئەوان مەبەستیان شتی تر بوو."
سوڵتان هاواری کرد:
"بەڕاست؟ بەڕاست؟"
بە دەنگی وی خاک، دارستان، ئاسمانەکان و چیاکان لە بن ڕا لەرزین.
سەرەتا مێرووە شەلە و پاشان مێروولەکانی دیکە گوتیان:
"قسەکانمان بە هەڵە فام کران. ئێمە هێرشمان کردە سەر فیلەکان،ماڵەکان و شارەکانمان بەسەردا ڕوخاندن. فیلەکانمان پان کردەوە و کوشتمانن، بەدوای ئەمەدا، فیلەکانیش قەڵس بوون و هێرشیان کردە سەر وڵاتی مە. ئاخ، خۆزیا تووڕەمان نەکردایەن."
سوڵتانی فیلەکان هاواری کرد:
"ئەها، ئەوە بوو بە شتێک!"
مێروولەکان بەڵێنیان بە سوڵتان دا:

"ئێمە خەتامان کرد، تۆ مەیکە سوڵتانم. ئیتر جارێکی دیکە قەت پێ نانێینە وڵاتی فیلەکان."
سوڵتان بە دەنگێکی وەها بەرز کە ئاسمانەکانی هەژاند، گوتی:
"پێ نانێنە وڵاتی فیلەکان."
مێروولەکان دووپاتیان کردەوە:
"پێ نانێینە وڵاتی فیلەکان."
"بە چاوێکی خراپ لە وڵاتی فیلەکان ناڕوانن."
مێروولەکان دووپاتیان کردەوە:
"بە چاوێکی خراپ لێی ناڕوانین."
"لەمەوبەدوا مێروولەکان دەبێ واز لەو هێرشانە بێنن کە بە درێژایی مێژوو ئەنجامیان داون. جارێکی دیکە هەرگیز بە چاوێکی خراپ سەیری وڵاتی فیلەکان ناکەن."
مێروولەکان هاواریان کرد:
"هەرگیز، هەرگیز بە چاوێکی خراپ ناڕوانین."
"تا دونیا دونیایە واز لە خووی پەلاماردان دێنن."
مێروولەکان پشتڕاستیان کردەوە:
"واز دێنن."
بۆ ماوەیەک بێدەنگییەکی قووڵ زاڵ بوو. نە مێروولەکان متەقیان لێوە هات و نە سوڵتانی فیلەکان. لە وڵاتی مێروولەکانەوە، قیژە و هەرا، ناڵەناڵ و شین و ڕۆڕۆ دەبیسترا. دووکەڵێک وەک دووکەڵی سووتان، قورس، سوور، باڵی بەسەر ئاسمانی وڵاتی

مێرووله‌کاندا کێشابوو. بۆ ساتێک هه‌موویان هۆش و بیریان چووه‌ سه‌ر ڕه‌وشی ئه‌و وڵاته‌.

"ئێمه‌ خه‌تامان کرد، تۆ مه‌یکه‌ سوڵتانم. بڕوانه‌، ئه‌گه‌ر شه‌ڕ به‌م جۆره‌ به‌رده‌وام بێ، ته‌نانه‌ت مێرووله‌یه‌ک له‌ وڵاتی ئێمه‌ نامێنێته‌وه‌. زۆربه‌یان ده‌مرن، بریندار ده‌بن، هه‌ندێکیشیان په‌نا بۆ چیا و لێڕه‌واره‌کان ده‌بن و شه‌ڕی ئێوه‌ ده‌که‌ن."

سوڵتانی فیله‌کان به‌ سه‌رسوورمانه‌وه‌ پرسیی:

"شه‌ڕی ئێمه‌ ده‌که‌ن؟ مێرووله‌کان دژ به‌ فیله‌کان شه‌ڕ ده‌که‌ن؟"

ڕیشسوور گوتی:

"شه‌ڕ ده‌که‌ن."

"که‌واته‌ مێرووله‌کان دژ به‌ فیله‌کان شه‌ڕ ده‌که‌ن! شتی وا چۆن ده‌بێ؟"

"ڕێگه‌یه‌ک ده‌دۆزنه‌وه‌."

"چلۆن؟"

"چوزانم، هه‌ر چۆنێک بێ ڕێگه‌یه‌ک ده‌دۆزنه‌وه‌."

سوڵتان دووباره‌ی کرده‌وه‌:

"ڕێگه‌یه‌ک ده‌دۆزنه‌وه‌! تۆ بڵێی، ڕێگه‌یه‌ک ده‌دۆزنه‌وه‌، تۆ بڵێی؟"

سوڵتان ده‌ستی کرد به‌ پێکه‌نین. ورگی گرتبوو و له‌ کاتێکدا لیکاو دڵۆپ دڵۆپ له‌ قۆرتمه‌که‌ی ده‌چۆڕاوه‌، پێده‌که‌نی. پێکه‌نینی ده‌هات که‌ بیری له‌وه‌ ده‌کرده‌وه‌ مێرووله‌کان دژ به‌ فیله‌کان شه‌ڕ ده‌ست پێ ده‌که‌ن و

لەپێناو بەردەوامبوونی ئەم شەڕەدا پەنا بۆ دارستان و چیاکان دەبەن. بێ پسانەوە قاقا پێدەکەنی.
دەکرا بەرگەی هەموو شتێک بگری، بەڵام ئەم پێکەنینە نا. ڕیشسوور هەر چەشنە مەترسییەکی دایە بەر چاو و هاتە گۆ:
"تۆڵەی ئەم وڵاتانە، ئەم شارانە و ئەم کۆمەڵکوژییەت لێ دەکەینەوە ئەی زاڵم، ئەی گەمژە، ئەی سوڵتانی بێئەقڵ. ئەم کردەوانەت بێ وەڵام نامێننەوە، ئەی لە نووکی پێ تا تەوقی سەر لە خوێن گەوزیو، هەی زلە، هەی چیای چەوسانەوە، هەی کوێرە. ئەم کردەوانەی تۆ و هیی پۆپەبەرزی پیر و پەککەوتەش بێ وەڵام نامێننەوە... زۆری پێ ناچێ بەڵای ئەم مێروولە وردانە کە هێندەی نووکەدەرزییەک بچووکن، دەبینن و لەپێش چاوی سەرجەم بوونەوەرەکانی دونیا ڕیسوا دەبن، سووک و ڕیسوا..."
وای گوت و لەسەر باڵی پۆپەبەرز خۆی فڕێ دا و هەڵات. کە ئەو ڕۆیشت، مێروولەکانی دیکە هاتنە سەر دین و دڵیان نەرم بووەوە، لە ناخی دڵەوە تکایان لە سوڵتان کرد:
"تۆ چ بفەرمووی، ئێمە دەیکەین سوڵتانی مە. بەس با ئەو شەڕە خوێناوییە ڕابگیرێ."
"ئەو مێروولەیەی تۆی توورە کرد، ئەو ئاسنگەرە شەلە ڕیشسوورە، تاوێک لەوەوپێش لێرەوە خۆی فڕێ دایە خوارەوە."

سوڵتان دەسبەجێ پرسیی:
"مـرد؟ مێرووولەکـان، ئەگەر لە شـوێنێکی وەهـا بەرزەوە خۆیان فڕێ بدەن دەمرن، وا نییە؟ ئەگەر نەمردبێ، هەر ئێستا مردوو یاخود زیندووەکەیم دەوێ."
پـۆپەبەرز بە ترسـەوە بەرەو خـوارێ فـڕی. بـاش لە مەبەسـتی سـوڵتان تێگەیشـتبوو، بەدوای مێـرووولەی ڕدێنسووردا گەڕان، مێرووولەکان، مێرووولەکانی دیکە و پۆپەبەرز، مەلەکانی دیکەی بانگ کرد، کوون بە کوون بەدوای ئاسنگەرە شـەلەی ڕدێنسووردا گەڕان، بەڵام نە مـردوو نە زینـدووەکەیان نەدۆزیـیەوە. شـوێنپێی ئەم مێـرووولە برینـدار و خوێنـاوییە ون بووبـوو. هەرچـی کردیان، هەرچی تەقەلایان دا و هەرچی گەڕان، پرس و ڕا و لێکۆڵینەوەیان کرد، تەنانەت شوێنەوارێکی بچووک لەو ئاسـنگەرە شـەلەیان دەسـت نەکەوت. بە دەسـتی بەتـاڵ و گوناهبـار، هەمـدیس لەسـەر شـان و بـاڵی پۆپەبەرز چوونەوە خزمەتی سوڵتان:
"ڕدێنسـوورمان نەدیـتەوە، بـووەتە تـۆز. ئەگەر بوونەوەرێک لەسەر باڵی پۆپەبەرز، لە بەرزاییەکی وەها ڕا خـۆی فـڕێ بـداتە خـوارەوە، چیـی لـێ نـامێنێتەوە، تۆزیشی لێ بەجێ نامێنێ سوڵتانی مە."
پۆپەبەرزیش گوتی:
"بووەتە تۆز."
سوڵتان ئەمری کرد:

"تا ڕۆژی قیامەت، تەنانەت شوێنی تۆزی پێی ئەو مێرووله ڕیشسووره هەڵدەگرن. نابێ تۆزەکەشی بمێنێتەوە، ڕووی قسەم لە ئێوەیە، باش گوێ بگرن مێروولەکان، مەسەلەی مان و نەمانی مێروولەکان لەگۆڕێیە. هەموو ڕۆژێ، هەر ئانوساتێ شوێن تۆزی پێی ئەم هیچوپووچە، ئەو ناڕەسەنە، ئەو سەگە هەڵبگرن."
مێروولەکان گوتیان:
"شوێنپێی هەڵدەگرین. ناوی وی بە واتای مەرگ و چەوسانەوە دێ."
گوتیان:
"ئەو مێرووله شەلە، دیارە هەر لە ئەزەلەوە بەلای نەتەوەی مێروولەکان بووە."
گوتیان:
"ئەو مێرووله شەلە، بە هۆی خیانەت ئەو لاقەی پەڕی."
چ شتگەلی تریان سەبارەت بەو مێرووله شەلە نەگوت. تەنانەت بۆنی تۆزی ئەو خیانەتکارەش لەم دونیایەدا نابێ بمێنێتەوە. مێرووله ڕەسەنەکان، دواجار تۆزی ئەو شەیتانە سەرکێشە دەدۆزنەوە و لەناوی دەبەن. مێرووله ڕەسەنەکان، تەنانەت مێروولەیەک لە وەچەی ئەو مێرووله شەلە ناهێڵنەوە.
سوڵتان گوتی:
"ئەم ئاسنگەرە شەلانە، ئەم ڕیشسوورانەن دونیایان شێواندووە. ئەم خیانەتکارانە فیلەکانیان ورووژاندووە و لە وڵاتەکەی ئێوەیان بەرداوە."

مێروولەکانی دیکە هاواریان کرد:
"نەمان بۆ مێرووە شەلەکان."
"نەمان بۆ ڕدێنسوورەکان."
"نەمان بۆ ئاسنگەرەکان."
"ئێستا پێم بڵێن چیتان لە من دەوێ."
"ساغ و سەلامەتیت سوڵتانمان."
"ساغ و سەلامەتیم سوودێکی ئەوتۆی بۆ ئێوە نییە. بڵێن چیتان دەوێ."
مێروولەکان گوتیان:
"کەواتە با ئەم شەڕە کۆتایی بێ. بەس ئەوەمان دەوێ."
"ئەها، هەر ئەوە؟"
گوتیان:
"بەڵێ؛ چونکە فیلە ئاشتیخوازەکان حەزیان لە شەڕ نییە."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"حەزمان لێی نییە."
مێروولەکان گوتیان:
"باجی خۆمان دا، ئیتر ئێمەش دەبینە ئاشتیخواز، جارێکی دی چۆن هێرش دەکەینە سەر وڵاتی فیلەکان، خوایە تووشی شتی وامان نەکەی. با ئەم شەڕە خێرا ڕابوەستێ، ئەگینا مێروولەیەک چییە زیندوو نامێنێتەوە. بمانبوورە سوڵتانی مە."
سوڵتان بە فیزەوە قۆرتمەکەی قووت کردەوە و گوتی:
"دەتانبوورم. با شەڕ ئیتر کۆتایی بێ."

مێرووله‌كان دڵخۆش بوون و گوتیان:
"بژی سوڵتانی مه‌."
سوڵتان گوتی:
"به‌ڵام بۆ ئه‌وه‌ی شه‌ڕ ڕابگیردرێ، كۆمه‌ڵێک شه‌رت و مه‌رج هه‌ن، چونكه‌ ئه‌و شه‌ڕه‌ ئێوه‌ ده‌ستتان پێ كرد و زیانێكی زۆرتان به‌ وڵاتی فیله‌كان گه‌یاند. بۆیه‌ ده‌بێ زیانه‌كانی وڵاته‌كه‌م قه‌ره‌بوو بكه‌نه‌وه‌."
مێرووله‌كان گوتیان:
"قه‌ره‌بووی ده‌كه‌ینه‌وه‌."
"كه‌وایه‌ گوێ له‌ داواكارییه‌كانم بگرن..."
"با ئه‌م جه‌نگه‌ ئێستا كۆتایی بێ سوڵتانم."
"مه‌رجه‌كانم په‌سه‌ند بكه‌ن."
"په‌سه‌ندی ده‌كه‌ین. شه‌ڕ كه‌مێكی تر به‌رده‌وام بێ مێرووله‌یه‌ک له‌سه‌ر ڕووی زه‌وی نامێنێته‌وه‌ كه‌ داواكارییه‌كانتان به‌جێ بێنێ... فه‌رموو، داواكارییه‌كانت له‌سه‌ر چاومان."
سوڵتان كه‌یفخۆش بوو و گوتی:
"كه‌وایه‌ گوێم بۆ ڕادێرن. هه‌موو مێرووله‌كان كۆده‌بنه‌وه‌ و كۆشكێكی بلوورینم بۆ دروست ده‌كه‌ن. كۆشكی بلوورین، له‌سه‌ر ترۆپكی ئه‌و شاخه‌ به‌رزه‌، ده‌بێ له‌وبه‌ری تری دونیاوه‌ ببینرێ. ئه‌م كۆشكه‌ وه‌ها بدره‌وشێته‌وه‌، ته‌نانه‌ت شه‌وانیش له‌ دونیادا شۆق بداته‌وه‌، وه‌ک ئه‌وه‌ی ڕۆژ هه‌ر ئاوا نه‌بووبێ. هه‌زار،

دوو هەزار، پێنج هەزار، دە هەزار فیل بچنە ناوی و ئەم کۆشکە نەڕوخێ."
مێرووولەکان کڕووزانەوە و گوتیان:
"ئێمەی مێرووولە بچووکین. زۆر زۆر بچووک. ئەوەندە بچووکین ئاژەڵەکانی دیکە تەنانەت بە بوونەوەرمان لە قەڵەم نادەن. وەها کۆشکێک چۆن ساز بکەین؟"
"جا دەبێ لە ماوەی ساڵێکیشدا دروستی بکەن."
"تکایە سوڵتانی مە..."
"تکا و مکا نییە، دروستی دەکەن."
"بە چاوی خۆتان دەبینن سوڵتانی مە، چەند لەر و لاواز و بچکۆلەین."
هەموویان پێکەوە، لەسەر باڵی پەپوو، پەیتاپەیتا لەبەر فیل پاڕانەوە، ناڵاندیان، ڕۆندکی ژانیان ڕشت، بەڵام نەیانتوانی دڵی بەردینی سوڵتان نەرم بکەنەوە.
سوڵتانی فیلەکان هاواری کرد:
"نابێ. نابێ! ئەمەیان نەبوو. شوورەییە، ئاوا لەبەر من مەپاڕێنەوە. شایانی ئێوەی مێرووولە نییە. من بیستوومە ئێوە بوونەوەرگەلی زۆر بەهێزن."
"بەڵام کۆشکێکی وا، لە ساڵێکدا..."
سوڵتان بە پێکەنینەوە گوتی:
"دروستی دەکەن. دەبێ دروستی بکەن. پێیان گوتووم هەر کام لە ئێوە سێ، پێنج، بگرە دە هێندەی خۆتان بار هەڵدەگرن."
"ڕاستە سوڵتانی مە، بەڵام..."

"دروستی دەکەن. نەتەوەی مێروولەکان لەم دونیایەدا لە خاک و خۆڵ زیاترە."
"زیاترە سوڵتانی مە، بەڵام لە ماوەی ساڵێکدا..."
لەناکاو، ڕقێکی بێسنوور سوڵتانی سوور سوور هەڵگەڕاند. کتوپڕ ددانە درێژەکانی لە چیرەوە بردن و هاواری کرد. مێروولەکان لەم دەنگەوە ترسێکی وەهایان ڕێ نیشت کە پێیان وا بوو دونیایان بەسەردا ڕماوە.
"دروستی دەکەن. دروستی دەکەن! ئێوە بەهێزترین بوونەوەرەکانی سەر ڕووی زەوین."
مێروولەکان لەسەر باڵی پەپووەکە لە ترسان هەڵلەرزین و گوتیان:
"دروستی دەکەین، بێگومان دروستی دەکەین، بەڵام کۆشکێکی بلوورین، ئەویش لە ماوەی ساڵێکدا، نەک هەر کاری مێروولە نییە، بگرە لە توانای بنیادەمیشدا نییە. بمانبوورە سوڵتانی مە."
سوڵتانی فیلەکان بەدەم بزەوە گوتی:
"دروستی دەکەن. دروستی دەکەن، لەسەر ترۆپکی ئەو شاخە کۆشکێکی بلوورینم بۆ ساز دەکەن، عەمبار و ژێرزەمینەکانی کۆشکەکەش تەژی دەکەن لە هەنگوین، لە ڕۆن، لە ئێکسیر، لە خواردەمەنی جۆراوجۆر و ئاوی ژیان. ئەویش، ئەویش لە ماوەی ساڵێکدا. بێجگە لەوەش، گەورەترین ئەڵماس، مرواری، یاقووت و زومرروودی دونیام بۆ دێنن. خەزێنەم لە ئێوە دەوێ

خەزێنە... ئێوە هەموو کونوکەلەبەرێکی دونیا شارەزان و بە شوێنی گەنجینەکان دەزانن. زۆربەی شارەکانی ئێوە، کانەئاڵتوونە، بۆیە گشت ئاڵتوون و گەنجینەکانی گۆی زەویم بۆ دێنن."
"تکایە سوڵتانی مە..."
سوڵتانی فیلەکان کە ئارام بووبووەوە، گوتی:
"تکا و مکا نییە. گوێ لە هیچ ناگرم. ئێوە قەرەباڵغترین بوونەوەرەکانی سەر ڕووی ئەم زەوییەن. بەقەد خیز و خۆڵ زۆروزەوەندن. بە شایەتی ئەم سەرکردە پڕ شانوشکۆیەی پەپووەکان، ئەگەر قسەکانم یەکسەر جێبەجێ نەکەن، ئەگەر یەکسەر وەخۆ نەکەون، لە ماوەی ساڵێکیشدا ئەم ئیشانە تەواو نەکەن، ئەم جەنگە کۆتایی نایە. مادام ئێوەی مێروولە وردن، بۆچی هێرشتان کردە سەر نیشتمانی بەرینی فیلەکان، هەر بەوەش نەوەستان و ئەو نیشتمانەت ئاگر دا و وێرانتان کرد؟ ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا داواکارییەکانم جێبەجێ نەکەن و کۆشکەکە ڕادەستی من نەکەن، خوا شاهید بێ، لەسەر عەرز و بن عەرز تەنانەت یەک مێروولە نامێنێتەوە، وەچەی مێروولەکان لەم دونیایەدا دەسەرپدرێتەوە. لە بن پێی قورسی فیلەکان و سەربازەکانم پان دەبنەوە، پان دەبنەوە."
مێروولەکانی سەر پشتی پەپووەکە دەستیان بە گریان کرد و بەدەم پاڕانەوەوە گوتیان:

"هەمـــوو ئەم ئیشـــانە چـــۆن لە مـــاوەی ســـاڵێکدا تەواو بکەین؟"
سوڵتان بە دەنگێکی بەرز گوتی:
"دروستی دەکەن، دروستی دەکەن. واز لە شین و ڕۆڕۆ بێنن و دەسبەجێ بکەونە خۆ."
مێرووولەکـــان ئـــاخفین و پـــۆپەبەرز، بە هەمـــان دەنگـــی گریانـــاوی قســـەکانی ئەوانـــی بـــۆ ســـوڵتان وەرگێـــڕا. مێرووولەکان گوتیان:
"ســوڵتانی مە، ئەی ســوڵتانی واڵا، خــاوەن شــکۆ، بەڕێــز، بەهێز و دڵبەبەزە!"
مێرووولەکان گوتیان:
"ئەگەر هەر ئێســـتا، بـــێ دەقەیەک خـــافڵان، ئەم شـــەڕە ڕانەوەســـتێنرێ و پێش بە مەرگـــی میلیۆنـــان مێرووولە لە ژێـــر پێـــی تەنیـــا فیلێکـــدا نەگیـــردرێ، نەک هەر مێـــرووولە، بگـــرە مێشـــوولە، بگـــرە مێـــرووولەی باڵـــداریش نـــادۆزنەوە ئەم کۆشـــکەتان بـــۆ دروســـت بکـــا. تـــۆ شـــەڕی فیلەکـــان ڕابگـــرە، بـــا ئـــێمەش بچـــین کێشـــەکە لە کۆبـــوونەوەی مێرووولەکانـــــدا تـــــاوتوێ بکەیـــــن و ڕێگەچـــــارەیەک بدۆزینەوە. ئەگەر گوتمـان نـایکەین، ئەوا هەمـوو شـتێک بەدەست خۆتـانە، دەتوانن سـەرلەنوێ شـەڕ دەسـت پـێ بکەنەوە و هەموومان بکوژن."
سوڵتان گوتی:
"باشـە. تەواوە، هەر ئێسـتە شـەڕ ڕادەگـرم. کرێکـارێکم، یانی مێرووولەیەکم هەموو دونیا دێنێ. ئەممـان، تەنـانەت

با مێرووله‌یه‌کم نه‌مرێ! لاقی مێرووله‌یه‌ک به‌ر به‌ردێ بکه‌وێ، دڵـم هه‌پـروون به هه‌پـروون ده‌بـێ. له‌مه‌وبه‌دوا چاوپۆشـی ته‌نـانه‌ت له کوشـتنی مێـرووله‌یه‌ک نـاکه‌م. ئه‌وه‌ی ئـازاری به مێرووله‌یه‌کم بگا، پانی ده‌که‌مه‌وه. کێ، کام بوونه‌وه‌ر زه‌ڕی بۆ مێرووه‌کانم هه‌بێ، وه‌جاخی کوێر ده‌که‌مه‌وه."

سوڵتانی فیله‌کان، فیکه‌ی سمێڵانی ده‌هات. ئیتر هه‌تا ئه‌م مێروولانه هه‌بن، سـه‌ر و بنـی دونیـا هییـی ئه‌و ده‌بـێ. له ناخیشـه‌وه ئه‌سـه‌فی ده‌خـوارد تـا ئێسـتا مێرووله‌کـان به مێشکی نه‌گه‌یشتبوون، ئاخ، ئاخ، ئاخ. ئێسـتا چ کۆشـک و سه‌رایه‌کی شکۆداری ده‌بوو، فیله‌کـان ده‌سـتیان له ڕه‌ش و سـپی نه‌ده‌دا. عه‌مبـار عه‌مبـار خـوارده‌مه‌نی ده‌بـوو، سندووق سندووقیش، زێڕ و خشـڵ و ئه‌ڵمـاس و به‌ردی یه‌شم و یاقووت. ئاخ، ئاخ، ئاااخ!

ده‌ستوبرد فه‌رمانی به په‌پووه‌کان دا:

"خێـراکه‌ن، خێـراکه‌ن، ئه‌و فـیلانه‌ی ولاتـی مێرووله‌کـان وێران ده‌که‌ن، ئاگادار بکه‌نه‌وه، خێرا، بـا یه‌کسـه‌ر واز له شــه‌ڕ بێـنن. ده‌ســبه‌جێ بــا شــه‌ڕه‌که ڕابگــرن و بـۆ برینپێچیکردنـی مێـرووله برینـداره‌کان یارمه‌تیـده‌ر بـن. ئێوه‌ش یارمه‌تییان بده‌ن، برینـی مێرووله‌کـان بپێچـنه‌وه. مێرووله‌یه‌کی من هه‌موو دونیا دێنێ."

مێرووله‌کان تێکڕا ده‌ستیان به سرته‌سرت کرد و پاشان به شیوه‌نوزاری گوتیان:

"ده‌خیلـت سـوڵتانی مه، ده‌خیلـت پاشـای مه، بـا ئه‌وان هاوکاریمان نه‌که‌ن، هه‌ر ئه‌وه‌نده بکشێنه‌وه و بڕۆن بۆ

ئێمە بەسە. فیلەکان ئەگەر بیانەوێ یارمەتیمان بدەن، تەنیا بە پێدانوانـدنێک سـەد هەزارێکمـان لـێ دەکـوژن. تکایە سولّتانی مە، ئەم فیلانە بە ناوی یارمەتیدان، بە شێوەیەکی نەخوازراو، هەموومان دەکوژن. پەپووەکانیش هەموومان دەخۆن.˙

سولّتان:

˙کەوایە فیلەکان بێ ئەوەی خۆیان لە شتێک هەڵبقورتێنن با بکشێنەوە و بچنە نێو لێڕەوارەوە، با لەوێ سمتیان لە دارەکان بخشێنن و خۆیان بخورێنن. بەڵام با دارەکان نەشکێنن، ئەو لێڕەوارە و دەریاکەی خوارەوەم پێشکەش بە کرێکارە مێروولەکانم کردووە. دەی خێرا پەپووەکان، بکەونە ڕێ.˙

پەپووەکان هەڵفڕین و هەر لە سولّتانی فیلەکان دوورکەوتنەوە، بە دەنگێک کە زەوی و ئاسمانی دەلەرزاند، ڕاچەنین:

˙بگەڕێنەوە.˙

پەپووەکان بە مێروولەکانی سەر پشتیانەوە دەسبەجێ گەڕانەوە.

˙با یەکسەر کۆبوونەوە بکرێ و تا ئێوارە لە ئەنجامی کۆبوونەوەکە ئاگادارم بکەنەوە. لێرە چاوەڕوانی ئەنجامی کۆبوونەوەکە دەبم. دەی خێراکەن.˙

مێروولەکانی سەر پشتی پەپووەکان هاتنەوە بۆ وڵاتی مێروولەکان، هاتنەوە بەڵام چ ببینن، لەنێو تەپوتۆز و دووکەڵدا نە شارەکان دەبینران، نە فیلەکان، نە

لێرەوارەکەی تەنیشتیان. لەبەر تەپوتۆز، تەنانەت ئاسمانیش بەدی نەدەکرا. تەنیا هەراوزەنایەکی بێسنوور ئەو ناوەی داگرتبوو، هەراوزەنایەک کە تەنانەت لە دوورەوە، لە کەنارەکانی دەریا، لەوبەری دونیاوە دەبیسترا.

پەپووەکان دەستیان بە جاڕدانی فەرموودەی سوڵتانی فیلەکان کرد. هاواریان کرد و قیژاندیان، تەنانەت خۆیان گەیاندە نێو گوێچکەی فیلەکان کە لە تەپوتۆزدا ون بووبوون و پڕ بە گەروو فەرمانی سوڵتانیان بەوان ڕاگەیاند، لەگەڵ ئەوەشدا هیچ شتێک نەیتوانی پێش بە فیلە تووڕەکان بگرێ. ئێستا دەبوایە چ بکەن، کەمێکی تر ئاوا تێپەڕیبا، لە وڵاتی مێروولەکان نە دارێک دەما، نەماڵێک، نە دیوارێک، نە سەرایەک، نە عەمبارێ. تەنانەت بوونەوەرێک لێرە زیندوو نەدەمایەوە.

جارێکی دیکە بەرەو لای سوڵتان فڕینەوە و پێیان گوت سوڵتانی مە حاڵ وەهایە. سوڵتان وەخۆ کەوت، تا بڵێی تووڕە بوو و لە ڕقان، جەستە زەبەلاحەکەی بەرز کردەوە و گوڕاندی، چیا و دەشت بە گوڕەی ئەو لەرزین، دەنگەکەی لە دونیادا زایەڵەی دایەوە، بە بیستنی، فیلە تووڕەکان کە جەنگ و تاڵان، شێت و دێوانەی کردبوون، لە جێگەی خۆیان وشک بوون.

کەمێک دواتریش سوڵتانی شەکەتبوو گوتی:

"دەی ئێستا بچنەوە، هەتا دەگەنە وێ، تەنانەت فیلێکیش ناتوانێ لە جێگەی خۆی ببزووێ، بڕۆن و فەرمانەکەمیان پێ ڕابگەیەنن."

پەپووەکـان هەمـدیس فـڕین و خۆیـان گەیانـدە وڵاتـی مێروولەکان. ئەو تۆز و دووکەڵەی ئاسمانی داپۆشیبوو، هێدی هێدی دەنیشـتەوە. فیلەکـان لە پشـت تەپوتـۆزدا لەبەر چـــاو ڕیشکەوپیشـــکەیان دەکـــرد. مەلەکـــان لە ئاسـمانەوە بە قورسـی بەرەو فیلەکـان شـۆڕبوونەوە و فەرمووودەکـانی سـوڵتانیان پـێ ڕاگەیانـدن. فیلەکـان کە خەڵتانی خوێن و ئارەقە بووبوون و لەنێو خاکوخۆڵدا گەوزابوون، یەکسەر لە وڵاتی مێروولەکان پاشەکشەیان کرد.

وڵات نوقمی شین و ڕۆڕۆ بوو. لە بن پێی هەر فیلێکدا تۆپەڵێک مێروولەی بریندار و مردوو بەدی دەکرا... ئەو شـــارە جوانـــانە بووبـــوونە خـــۆڵەمێش. نە هـــێلانە مێروویەک مـابووەوە تێیـدا بـژی، نەک ڕێـگەیەک پێیـدا بڕۆی. دەتگوت چیایەکیان هەڵگرتووە، بەم وڵاتانەیاندا داوە و ئەم شـارانەیان پـێ سـەراوژێر کـردووە. وەهـا بەسەر ئەو شارانە هاتبوو. بێجگە لە مێروولەی زامدار و مردوو، هیچ شتێکی تر لەو ناوە نەدەبینرا.

پـۆپەبەرز کە شـەلاڵی خـوێنی مێروولەکـان بووبـوو، گوتی:

"وەیش، وەیش، خۆ مێروولەیەکی زینـدوو نەمـاوەتەوە. یـان ئەوەتـا مـردوون، یـان برینـدارن. وەیـش، ئەو وڵاتە بەشکۆیەی مێروولەکان تەفروتوونا بووە. وەیش، وەی، وەی بە حاڵی مێروولەکان، وەی!"

پەپوەوەکانی دیکەش، بە بینینی دۆخی ئەم شارە کە سەردەمانێک وەک بەهەشت وا بوو، کزەیان لە جەرگی هەستا و فرمێسکی گەرم لە چاوەکانیان لووزەوی بەست. هەر کەس چاوی بەم شارە وێران و سووتاوە کەوتبا، نەیدەتوانی پێش بە ڕژانی ڕۆندکە گەرمەکانی بگرێ.

یەکێک لەو مێروولانەی لەسەر پشتی مەلەکان بوو و سەراپای گیانی خوێن بوو، بە ڕق و ژانەوە گوتی:

"فەرموون ئەوەش سولتان و ماریفەتەکەی، ئێستا با مێرووله مردووەکان کۆشکەکەی ساز بکەن، با مێرووله مردووەکان، ئەو مێروولانەی کوشتوونی، هەموو خەزێنە و گەنجینەکانی دونیا کۆ بکەنەوە..."

ئەمەی گوت و لەسەر باڵی مەلەکەوە خۆی فڕێدایە خوارەوە.

مێروولەی سەر پشتی مەلەکان بە بینینی ئەم دۆخە، نەیانتوانی پێش بە خۆیان بگرن و لەسەر پەڕ و باڵەکان ڕا وەک باران فرمێسکیان هەڵوەڕاند.

زۆری پێ نەچوو وڵات هێور بووەوە، تەپوتۆز هێدی هێدی نەما، شارەکان بینران، پەنا بە خوا، کەس چاوی بینینی نەبوو. ئەو مێروولانەی لەسەر پشتی پەپووەکان بوون، کە چاویان بەم وڵاتە خاپوور و سووتاوە کەوت، گوتیان:

"دەبێ شتێک بکرێ، دەبێ شتێک بکرێ، دەبێ شتێک لەم فیلانە بکرێ."

ئەم قسەیان دەگوت و دەگوتەوە، بەلام جا میروولە بچووکەکان لە هەمبەر ئەم فیلە زل و زەبەلاحانە چییان پێ دەکرێ؟

پەپووەکان لە فڕین بەسەر ولاتی میروولەکان و بینینی ئەم کاولکارییە سامناکە تاقەتیان لێ بڕا، بە میروولەکانی کۆلیانەوە بە مەبەستی پشوو بەرەو دارستان فڕین، میروولەیەک چییە لەو ولاتە نەمابووەوە، دەبوایە چی بە سولتانی فیلەکان بلێن، لە دارستان میروولەکان و مەلەکان شانبەشانی یەک هەم پشوویان دەدا و هەم مشووریان دەخوارد... چلۆن دەیانتوانی لە ڕقی سولتان خۆیان ڕزگار بکەن؟ سولتان ئەگەر بیستبای وەچەی میروولەکان تەواو بووە و میروولەیەک لەو ولاتە نەماوەتەوە، نە پەپووەکان و نە میروولەکانی کۆلیان نەیاندەتوانی لە چنگی قوتار بن. لە کاتێکدا بەم جۆرە بیریان دەکردەوە، بە ترس و خۆفەوە ڕێی دارستانیان گرتە بەر، بەلام کە لە دارستان نزیکبوونەوە، چ ببینن باشە، لایەکی دارستان ڕەش ڕەش، لایەکی زەرد و لایەکی سوور سوور دەچووەوە. هێشتا نەیانگوتبوو ئەمە چییە، گەیشتنە دارستان، خوایە هاوار، سەرتاپای دارەکانی دارستان هەر لە داوێنەوە تا گۆپکە بە میروولە تەنرابوون... لە ترسان وەها بە دارەکانەوە نووسابوون، دەتگوت بەشێکن لە توێکڵ و تەلاشی درەختەکان. لەو شوێنەی دارستان کە ڕەش دەینواند، میروولەی ڕەش، لەو شوێنەی زەرد دەینواند،

مێـرووڵەی زەرد، لەو شـوێنەی مـۆر مـۆر دەینوانـد مێـرووڵەی مـۆر و لەو شــوێنانەی ئـاڵ دەیاننوانـد، مێرووڵەی سـوور کـۆم بووبـوونەوە. لێـڕەوار پـارچە پارچە و ڕەنگ ڕەنگ بووبوو، تۆسقاڵێ شینایی بەدی نەدەکـرا. مێـرووڵە عەجەمەکـان بە لاقە درێـژ و باریکەکانیـان پەیتاپەیتـا بە دارەکانـدا هەڵدەڕووسـکان و دەهـاتنەوە خـوارێ، بە خـورت و خـۆڕایی هەوڵ و تەقەلایان دەدا... ئیتر دارستان، دارستان نەبوو، تـا چـاو هەتەر کـا گڵـۆڵەی مێـرووڵە بـوو. ئەرز و ئاسـمان بە مێـرووڵە داپۆشـرابوو، دەرزیـت فـڕێ دابـایە لەبەر مێـرووڵان نەدەکەوتە ئەرز. بڵێسـەی ڕق دونیـای داگرتبـوو. بە میلیـارد چـاو، بریسـکەی قین و ئازاریـان تێـدا دەدرەوشـایەوە، بە میلیـارد بریسـکە پـێکەوە هەڵـدەبوون و دەکـوژانەوە. قـاچ، پاشـەڵ و لەشـەکان لەسەر لق و گەڵای دارەکـان پێکەوە دەلکان و ئـاوێتەی یەک دەبوون.

دارستانی زۆروزەبەند کەیلی خوێن و ڕۆڕۆ بووبـوو و دەینالاند. لەو کـاتەوەی دارسـتان دارسـتان بـوو، جـووڵە جـووڵ و هەرا و هەنگـامەیەکی لەو چەشـنەی بە خـۆوە نەبینیبوو.

کاتێـک مێرووڵەکـان چـوونە نێـو دارسـتانەوە، پەلەوەرەکـان، مێش و مەگەز، مارەکـان، چەقەڵ، ڕێـوی، گورگ و سـەرجەم بوونەوەرەکـانی نێو دارسـتان وەک ئەوەی لە ئاگرێک ڕایان کردبێ، لە دارستان هەڵاتبـوون.

ئیتر لەنێو دارستاندا بێجگە لە مێروولەکان هیچ بوونەوەرێکی دیکە هەناسەی نەدەدا.
مێروولەکانی سەر پشتی پەپووەکان، سەیری مێروولەکانی خوارەوەیان کرد کە چەشنی دەریا شەپۆلیان دەدا و لە جموجوڵدا بوون و لەبەر خۆیانەوە گوتیان لەم دونیایەدا، لەم ولاتەی لەمەڕ خۆمان، زۆر زیاتر لەوەی بیرمان دەکردەوە مێروولە هەن. ئەوان کە ولاتی سووتاو و ڕماو، هەروەها مێروولە مردوو و برینداره‌کانی ولاتیان بینیبوو، پێیان وا بوو ئیتر لە دونیادا تەنانەت مێروولەیەکیش نەماوەتەوە. لە کاتێکدا ڕەنگە هەزار بگرە دە هەزار ئەوەندەی مێروولە کوژراو و بریندارەکان، مێروولە لە ولات ڕایانکردبوو و پەنایان بۆ دارستان هێنابوو.
مێروولەکان لەسەر باڵی پەپووەکانەوە هاواری خۆشیان لێ بەرز بووەوە:
"شەڕ وەستاوە. فیلەکان لە کوشتنمان پاشگەز بوونەتەوە."
لەسەر باڵی پەپووەکانەوە، قسەی خۆشتر، بە جۆشتر و شادیبەخشتریان بە مێروولەکانی نێو دارستان گوت. پاشان ڕایانگەیاند:
"با هەمووومان لە نێوەڕاستی دارستان کۆببینەوە و بئاخفین. سوڵتان کوشتاری ئێمە و وێرانکردنی ولاتەکانمانی ڕاگرتووە. شەرت و مەرجی قورسمان لەپێشە، ئەگەر بەجێیان نەهێنین، تەنانەت مێروولەیەک

لەسەر گۆی زەوی نامێنێتەوە، وەچەی مێروولەکان لەناودەچێ."
خۆشی و شایی مێروولەکان لە قورگیاندا مایەوە و لە نێوەڕاستی لێڕەوار لە شوێنێک کۆبوونەوە کە هێندەی دەشتێک هەراو بوو.
مێروولەی بان پشتی پەلەوەرەکان نەهاتنە خوار و بەسەر دەریای خرۆشاوی مێروولەکانی مەیدانەکەدا سووڕانەوە و داواکارییەکانی سوڵتانی فیلەکانیان هێنایە زمان. ماوەیەکی زۆر هیچ بوونەوەرێک نەیتوانی لە جێی خۆی بجووڵێتەوە. بێدەنگییەکی قووڵ بەسەر ئەو ناوەدا زاڵ بوو.
ئەو مێروولانەی بەسەر مەیدانەکەدا دەسووڕانەوە، گوتیان:
"دەی جا، ئێستا دەڵێن چی؟"
هیچ کام لە مێروولەکان نەیاندەتوانی سەر بەرز بکەنەوە و وەڵامی پرسیارەکەیان بدەنەوە. مێروولەکانی سەر باڵی بە نەخش و نیگاری پەپووەکانیش بێ پسانەوە بە مەیدانەکەدا دەسووڕانەوە و دەیانپرسی،
"دەڵێن چی، دەڵێن چی؟"
لەناکاو دەریای مێروولەکان شەپۆلی دا، هەراوزەنا و نەعرەتەیەک ئەو ناوەی داگرت. نەعرەتەیەکی وەها گەورە کە تەنانەت سوڵتانی فیلەکانیش لەو شوێنەی لێی دانیشتبوو، بیستی و گوێی بۆ شل کرد.

فەرماندەی فیلەکان کە ماوەیەک پێشتر لە وڵاتی فیلەکانەوە هاتبووە کن سوڵتان، گوتی:
"سوڵتانم، هەموو مێروولەکان لە دەوری یەک کۆبوونەتەوە، لەنێو دارستان گفتوگۆیانە، ئەم نەعرەتەیە لەوێوە دێ."
سوڵتان پێکەنی و بە خۆشحاڵییەوە گوتی:
"دە با گفتوگۆ بکەن بۆ خۆیان، دواجار کۆشکەکەم بۆ دروست دەکەن و داواکارییەکانم بەجێ دێنن. هێشتا زۆر شتی تریشیان پێ دەکەم."
مێروولەکانیش لەوێ، لە مەیدانەکەی نێو چەقی دارستان، بێ خۆراک و خورد و خەو، سێ ڕۆژ و سێ شەو گفتوگۆیان کرد و بنجوبناوانی مەسەلەکەیان شیتەڵ کردەوە. تێگەیشتن هیچ ڕێگەچارەیەکیان نییە، یان دەبێ داخوازییەکانی سوڵتان بەجێ بێنن، یان دەنا بە کۆمەڵ قەتڵوعام دەکران. فیلەکان بەهێز بوون، زل بوون، ڕەنگە فیلێک بە تەنیا هێندەی میلیارد مێروولە بوایە. چۆن دەیانتوانی بە گژیاندا بچنەوە، کوو دەکرا داواکارییەکانیان جێبەجێ نەکەن!
بەس مێروولەیەک بە جلوبەرگێکی سەیرەوە، چەند وشەیەکی کردبووە بنێشتەخۆشکە و پەیتاپەیتا دەیپرسی:
"یانی هیچ ڕێگەچارەیەکمان نییە، هیچ، هیچ ڕێگەچارەیەک؟ هیچ هێزێکمان نییە دژ بە فیلەکان شەڕ بکەین؟"

دەریای مێروولەکانی ئەو مەیدانە گەورەیە بێدەنگ دەبوو، لە شەپۆلدان دەکەوت، مێروولەکان بیریان دەکردەوە، بیریان دەکردەوە و پاشان بە یەک گەروو هاواریان دەکرد:
"هیچ ڕێگەچارەیەکمان نییە، هیچ ڕێگەچارەیەکمان نییە..."
سوڵتانی فیلەکان دڵخۆشانە ئەم هاوارە بێهیوایەی مێروولەکانی دەبیست.
مێروولە جلسەیرەکە دواجار لەسەر باڵی مەلەکەوە گازی خوارەوەی کرد و گوتی:
"برادەران، هەرچی بێ ئەم ڕووداوەمان لێ دەقەومێ. ئێمە ساڵانی دوورودرێژ بێجگە لە شانازی بە کارکردنمان، بە بەختەوەریی خۆمان و وڵاتەکەمان، هیچ شتێکی ترمان نەکرد. ئەو کاتانەی بەختەوەر دەژیاین، هیچ تەگبیرێکمان بۆ پێشگرتن لە ئەگەری بەڵایەکی لەم چەشنە وەرنەگرت. دیارە کاتمان زۆر بوو، ڕۆژی وا هەبووە خرپ بۆی خەوتووین، دەمانتوانی بیر لە ڕا و تەگبیر لە بارەی ئەو بەڵایانە بکەینەوە کە لە داهاتوودا بەسەرمان دێن، وەک چۆن بەرامبەر بە سێڵاو، باران، شڵێوە، بەفر و بوومەلەرزە بە تەگبیر بووین، دەمانتوانی لە بەرامبەر فیلەکانیش ڕێگەچارەیەک بدۆزینەوە، وامان نەکرد، ئەوەتا بووینەتە کۆیلە و بەخسیر."
مەیدانە زەبەلاحەکە یەک بەخۆ ناڵاندی:

"یەخسیر کراین."
"لەمەوبەدوا تا دونیا دونیایە، یەخسیری فیلەکان دەبین."
"لەمەوبەدوا ئێمە کار دەکەین و بەری ڕەنجمان دەدەین بە فیلەکان."
"بۆ لەمەودوا دەشێ کۆشک، پەرستگە و ئارامگە بۆ فیلەکان دروست بکەین."
"بۆ لەمەودوا دەبێ مرواری، ئەڵماس، یاقووت، یەشم و زومڕوود بۆ فیلەکان بگوازینەوە."
"بۆ لەمەودوا دەبێ گەنجینە و خەزێنەکانی سەر زەوی و بن زەوی بۆ فیلەکان بگوازینەوە."
"بۆ لەمەودوا تەنانەت شیری مریشکیش لەسەر سوفرەی فیلەکان کەم ناهێنێ..."
"ئێمە بەدەستی دێنین، ئەوان دەیخۆن."
"ئێمە کار دەکەین و فەقیر دەبین، ئەوانیش پاڵی بۆ دەدەنەوە و دەوڵەمەند دەبن."
ناڵەیەکی درێژ و بێهیوا، لەوێوە تا ئەوسەری دونیا پێل بە پێل بڵاوبووەوە...
پۆلێک مێروولە هاواریان کرد:
"مردن لەمە زۆر باشترە."
مێروولە جلسەیرەکە سەرسەختانە و بە پێداگرییەوە گوتی:
"دەبێ ڕێگەچارەیەک هەبێ."
دەریای مێروولەکان هاواری کرد:

"هیچ چارەیەکمان نییە. سەیرێکی خۆت بکە، لە قەڵافەتی خۆت بڕوانە. بزانە چیت بەسەر هاتووە... ئاخر خۆتت نەبینیوە، لە نووکی پێ تا تەوقی سەر خەڵتانی خوێنی."
مێرووله جلسەیرەکە گوتی:
"فیلەکان بە جارێ سێ لاق، سمێڵ و ڕیشیان هەڵقەندم."
مێرووله عەجەمەی هەرە پیر گوتی:
"وەرە خوارێ با برینەکانت بپێچمەوە. مێرووله سەیرەکە، لە دڵم چەقیوە تۆ دواجار بەکەڵکی ئێمە دێی. وەرە خوارێ با زامەکانت تیمار بکەم."
پۆپەبەرز یەکسەر مێروولەکەی هێنایە خوارێ و گوتی:
"هانێ، چ لەم مێرووله ژیرەتان دەکەن بکەن، بەڵام ئەگەر هەر ئێستا نەچینە لای سوڵتان و ئاگاداری نەکەینەوە، ئەم دارستانە سەر و بن دەسووتێنێ و لە دونیادا تەنانەت مێروولەیەکیش نامێنێتەوە، دەستوبرد بکەن."
مێرووله عەجەمە پیرەکە پاش ئەوەی جێ لاقە هەڵقەنراوەکانی مێرووله جلسەیرەکەی مەرهەم کرد، داهاتەوە و بە گوێیدا چرپاند:
"ئەی مێرووله سەیرەکە، تۆ کێی؟"
مێرووله سەیرەکە بە سامەوە سەیرێکی ڕاست و چەپی کرد و گوتی:
"من، شاگردی ڕدێنسوورم، ئەو لە هەموومان ژیرتر و بوێرترە."
مێرووله عەجەمەکە بە جۆشەوە پرسیی:

"ئەو لە کوێیە؟"
مێرووولە سەیرەکە گوتی:
"هەڵات. نەمردووە. لەسەر باڵی مەلێک بوو، لەوێوە خۆی هەڵاویشت، هەڵات و خۆی شاردەوە، نەمردووە."
مێرووولە عەجەمەکە گوتی:
"خاسە. خاسە. با ڕدێنسوور زیندوو بێ... پێویستیمان پێی دەبێ. ئەو هاوڕێمە. گەورەترین و شارەزاترین ئاسنگەرێکە هاتبێتە سەر ڕووی زەوی. ئاسنگەرێکی ئەوەندە وەستایە لە ئاسن مێرووولە دروست دەکا، پاشان ڕۆح وەبەر ئەو مێرووولە دروستکراوە دەنێ، هەروەها کەسی هەرە بەورە و هەرە ئاقڵی گەردوونە، کەیلە لە خۆشەویستی و دۆستێکی چاکە. ئەو نەبێ چۆن دەتوانین ئەم کۆشک و مۆنومێنت و گڵکۆ و عەمبارانە چێ بکەین، چلۆن دەتوانین وڵاتە وێرانەکانمان بە ئەقڵ و زانستی وی بونیاد بنێینەوە؟ باشە نەمردووە."
"نەمردووە"، مێرووولە جلسەیرەکە وای گوت. پاشان بەردەوام بوو، "ئاخ، ئاخ، چۆن بیرمان لەم ئافاتەی فیلەکان نەکردەوە، چۆن بە فیکری ڕیشسوور نەگەیشت؟ باشە ئێستا چ بکەین؟"
مێرووولە عەجەمەکە گوتی:
"چ بکەین؟"
مێرووولە جلسەیرەکە لەپڕێکدا وەک فەنەر لە جێی خۆی دەرپەڕی، بێ ئەوەی گوێ بە قاچە پەڕیوەکەی بدا،

سواری باڵی پەپوولەکە بوو و توند بە پەڕەکانییەوە نووسا:
"ئامان با پەلە بکەین پەپووی برا، زۆری نەماوە تاریکان دابێ، ئامان ها، جارێکی تر سوڵتانی فیلەکان تووڕە بێ، مێروولەیەک لەسەر ڕووی زەوی ناهێڵێتەوە، ڕەگوڕیشەمان هەڵدەکێشێ، وەچەمان توونا دەکا. با خێرا خۆمان بگەیەنین و پێی بڵێین داواکارییەکانی جێبەجێ دەکەین. پێشی بڵێن، ئەم فیلانە، ئەم تێکدەرانە دەسبەجێ لە وڵاتەکەمان بکشێنێتەوە."
دوابەدوای ئەم قسانەی وی، پەپوولەکان لە شەقەی باڵیان دا و زۆری پێ نەچوو گەیشتنە لای سوڵتانی فیلەکان.
سەرەتا مێروولە قەڵافەتسەیرەکە دەستی بە قسە کرد و گوتی:
"سوڵتانی مە، باشترین مزگێنیم بۆ هێناوی، مێروولەکان سەرایەکت بۆ دروست دەکەن کە دونیا تا ئێستا بە خۆیەوە نەبینیبێ. وەکوتر چی داوا بکەی، جێبەجێی دەکەین. قەبووڵمانە پەیڕەوی تۆ بین. مانەوە لە سایەی ئێوەدا بۆ نەتەوەی مێروولە مایەی شانازییە."
سوڵتانی فیلەکان لە خۆشیان زگی خۆی گرت و قاقا پێکەنی، بە قاقاکەی چیاکان، لێڕەوارەکان و وڵاتی مێروولەکان ماوەیەکی درێژ لەرزینەوە.
پاشان لە مێروولە قەڵافەتسەیرەکەی پرسی:

"تۆ کێی، تۆ کێی ئەی باڵوێزی ژیر، پێم بڵێ تۆ کێی؟ تۆ باڵوێزێکی هێندە ئاقڵی کە ئەگەر هێندە ورد نەبوایەی و دەسـتم پێـت گەیشـتبا، شـان و پێلـتم دەلاوانـدەوە و بەرگێکی پیرۆزم بە باڵادا دەبڕی. حەزم دەکرد دیاریت پـێ بدەم، پلە و پـایەت بەرز بـکەمەوە، بتکەمە مـایەی شانازی و فیلێکت لێ دروست بکەم."

مێرووله قەڵافەتسەیرەکە گوتی:

"پـێم دەڵـێن مێـرووله سـەیرەکە. مێروولەیەکـی ئـاوام و شتێکی تایبەتم نییە."

سوڵتانی فیلەکان گوتی:

"سەیرە."

مێرووله سەیرەکە دەمبەپێکەنین وەرامی دایەوە:

"بەڵـێ، سـەیرە. سـوڵتانی مە، چما مـاوەیەک لەمەوپێش پێم نەگوتبووی هەموان پێم دەڵێن مێرووله سەیرەکە؟"

سوڵتانی فیلەکان هەمدیس دووپاتی کردەوە:

"سەیرە! یانی تۆ هیچ تایبەتمەندییەکت نییە؟"

مێرووله سەیرەکە گوتی:

"نەخێر. سەیربوون نەبێ."

سوڵتانی فیلەکان گوتی:

"جـا ئەمەم زۆر بەدڵە. کەوایە لەنێـو ئەو مێـروولانەی تـازە هـاتوونەتە ژێـر دەسـتی مـنەوە، تـۆی هـیچ تایبەتمەنـدییەکت نیـیە... ئەی ئەوانەی تایبەتمەنـدییان هەیە کێن؟"

مێرووله قەڵافەتسەیرەکە گوتی:

"ڕاوەستاو بێ، پایەدار بێ. سوڵتانی مە، من بەس یەک تایبەتمەندییم هەیە، ئەویش سەیربوونە."
سوڵتانی فیلەکان کەمێک لە گژ فکران ڕاچوو و پاشان فەرمووی:
"لەمەوبەدوا تۆ دەبیتە باڵوێزی نێوان من و مێروولەکان."
مێروولە قەڵافەتسەیرەکە گوتی:
"ناتوانم، ناتوانم سوڵتانی خۆمان. من مێروولەیەکی سەقەتم، هەروەها زۆر پیرم. لەمەوبەدوا ئیتر ناتوانم لە جێی خۆم بجووڵێمەوە."
سوڵتانی فیلەکان پرسیی:
"چ بووە، کوێت سەقەتە، چیت بەسەر هاتووە؟"
"سوڵتانم، کاتێک فیلەکان وڵاتی ئێمەیان خاپوور کرد، لاقەکانی منیشیان لە بنەوە هەڵقەند. مێروولە عەجەمەیەک ماوەیەک لەمەوپێش برینەکانی پێچامەوە و شۆڕابەی خوێن وەستا و جارێ لە مەرگ قوتار بووم."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"وەی، وەی، وەی، زۆر بەداخەوەم. کەوایە لەبری خۆت مێروولەیەکی بەتەگبیر و ئاقڵی خۆتئاسا بدۆزەوە. ئەگەر لێم دەپرسی بۆچی، دەبێ پێت بڵێم من نامەوێ لەبەر هەڵەیەک سەرجەم مێروولەکانی سەر زەوی بکوژم. مێروولەکان بۆ لەمەودوا بیلبیلەی چاومانن. ئێمەی فیل نەتەوەیەکین دڵمان سیخناخە بە خۆشەویستیی مێروولەکان. مێروولەکان ئیدی گلێنەی

چاومانن. خوا یارمەتیی داین بۆ ئەوەی ئەم مێروولانە بدۆزینەوە. لەمەوبەدوا لەم دونیایە شتێک نییە بۆ ئێمە مەحاڵ بێ. بۆیەش بەڕێز مێروولە سەیرەکە، مێروولەیەکی ئاقڵم بۆ دەدۆزیتەوە کە ئەرکەکانی باڵوێزێک بە باشی ڕاپەڕێنێ."
مێروولە سەیرەکە ڕواڵەتێکی دووقات سەیرتری بەخۆوە گرت و گوتی:
"بان چاو سوڵتانم، خوا ئاگادارت بێ سوڵتانمان."
سوڵتانی فیلەکان پێی گوت:
"ماڵئاوا مێروولەی ژیری برام. زۆر سەیر و سەمەرەی بەڵام... هەر لە خۆشیدا بێ شێری مێروولەکان. بە مێروولەکانیش بڵێ، یەکسەر و هەر ئێستا دەست بە سازکردنی کۆشکەکەم بکەن. لەمەوبەدوا من بێ کۆشکی بلوورین هەڵناکەم. من ئیتر هەم سوڵتانی فیلەکان، گەورەترین گیانلەبەرەکانی دونیا و هەم سوڵتانی مێروولەکان، قەرەباڵغترین نەتەوەی دونیام."
دەسبەجێ لەسەر لاقەکانی پاشووی قیت بووەوە، دەستەکان و قۆرتمەکەی ڕاوەشاند و بەم جۆرە درێژەی بە قسەکانی دا:
"ئاخۆ دەکرێ سوڵتانی مێروولە ڕەسەنەکان، مێروولە مەزن و گەورەکان بێ کۆشک و سەرا بێ؟"
گشت بوونەوەرەکان بە دەنگەکەی هەڵلەرزین. ئەویش قسەی کرد و قسەی کرد، گوراندی و شایی گێڕا:
"مێروووولە ڕەسەنەکان..."

فیلەکانی دیکەش تێکڕا هاواریان کرد:
"مێرووووله ڕەسەنە جوانەکان..."
لە کاتێکدا هاواری خۆشی فیلەکان لە دونیادا دەنگی دەدایەوە، مێرووله قەڵافەتسەیرەکە بەسەر باڵی پەپوولەکە گەڕایەوە وڵاتی مێروولەکان، کە گەیشتە ئەوێ چ ببینێ باشە، مێروولەکان ملیان نابووە بەر ئیش و خەریک بوون وڵاتیان ئاوەدان دەکردەوە.
پۆپەبەرز لە بازاڕی ئاسنگەران نیشتەوە و مێرووله قەڵافەتسەیرەکە قورس و گران لە باڵی مەلەکە هاتە خوار، لە پشت سەریشی مێروولەکانی تر پێیان نایە سەر زەوی. هێشتا قاچیان بە تەواوەتی لەسەر ئەرزەکە دانەنابوو، مێروولەکانی شار ئاپۆرایان بەست و بە هیوا و مەراقەوە پرسییان:
"چ هەیە، چ نییە؟ دەنگوباس ئەی برادەری سەیروسەمەرە؟"
مێرووله سەیرەکە وەرامی دانەوە:
"دەنگوباسی چی و شتی چی. ئیتر فەوتاوین، نەتەوەی مێروولەکان خاشەبڕ بووە. نەتەوەکەمان کە بە درێژایی مێژوو یەخسیر نەبووە، ئێستا گرفتاری دەستی فیلەکانە. کۆیلە بووین، کۆیلە. ئەقڵ و دڵم پێم دەڵێ خۆزیا شەرت و مەرجەکانی سوڵتانی فیلەکانمان پەسەند نەکردایە... با پەسەندمان نەکردبایە و فیلەکان هەموومانیان بکوشتایە. ئیتر تا قیامەت ئەسیر و کۆیلە دەژین. ئیتر مێروو ڕیشسووریش نەماوەتەوە. لەسەر

باڵی پەلەوەرەکە خۆی هەڵاویشت و سەری خۆی هەڵگرت. لەوانەیە مردبێ. لەوانەشە نەیتوانیبێ بەرگەی یەخسیری بگرێ و لەداخان خۆی کوشتبێ."
مێروولەکان هەموو تێکڕا هاواریان کرد:
"ڕدێنسوور نەمردووە."
"ئەو نامرێ."
مێروولە سەیرەکە بە گوتنی ئینشاڵڵا ئەوەندەی دی سەیرتر بوو و لەسەری ڕۆیشت:
"تا قیامەت وەک کۆیلەی فیلەکان بژی... ئاخۆ وەها ژیانێک نرخی هەیە؟"
مێروولەکان گوتیان:
"هەیەتی، ژیان هەموو شتێک دێنێ. مەرگ، بێهیواییە. تەنانەت لە خراپترین دۆخی ژیاندا هیوا هەموو ڕۆژێ وەک گوڵەبەڕۆژە دەپشکوێ."
مێروولەی هەرە پیر گوتی:
"دونیا شیرنە."
پاشان بەردەوام بوو:
"مێروولە سەیرەکە، مێروولە سەیرەکە... بڕوانە، سێ قاچت، ڕیشت، سمێڵت، چاوێکت، گوێچکەیەک و لووتت هەڵقەنراوە، ڕووتوقووت لەگۆڕی کەوتووی، ئەی تۆ بۆچی خۆت ناکوژی؟ ژیان شیرین نییە مێرووە سەیرەی کوڕی سەیر؟ سەگی هیوابڕاو. فیلەکان ئەم بێهیواییەیان فێری تۆ کردووە؟"
مێروولە سەیرەکە گوڕاندی:

"من دەڵێم یەخسیری لە مردن ئەستەم ترە. من وا دەڵێم و ئێوەش هەڵدەکوتنە سەر من. ئەمە چ فڕی بە بێهیواییەوە هەیە؟"
مێروولە پیرەکە گوتی:
"بێهیوایی لە مردن دایە... لەبری ئەوەی خۆمان بکوژین، دەجەنگین و دەکوژرێین."
مێروولە سەیرەکە گوتی:
"دەی منیش وا دەڵێم. کەوایە دەبێ ڕێگەچارەیەک بۆ ڕزگاربوون لە چنگ فیلەکان بدۆزینەوە."
مێروولە پیرەکە گوتی:
"جارێ ڕاوەستە، سەبرت هەبێ."
هەموو مێروولەکان بە یەک زار دەنگیان هەڵبڕی:
"بۆ ڕزگاربوون لە چنگ فیلەکان چۆن ڕێگەچارەیەک هەیە؟"
مێروولە پیرەکە گوتی:
"گەڕان بەدوای ڕێگەچارەدا، لە مەرگی هەرەوەزی باشترە. بۆ قوتاربوون لە چنگ فیلەکان منیش ڕێگەچارەیەکم پێ شک نایە، بەڵام..."
مێروولەیەکی گەنج هاواری کرد:
"دەبێ هەبێ. بێگومان ڕێگەیەک دەبێ، دەشێ هەبێ، نەتەوەی مێروولە تا قیامەت نابێ یەخسیر و کۆیلەی فیلەکان بێ، مەحاڵە."
مێروولەکان لە هەموو وڵاتەکانەوە هاواریان کرد:
"مەحاڵە."

مێرووله سەیرەکە بە تاساوی گوتی:
"ڕاوەستن، هێدی هێدی، ئاوا هاتوهاوار مەکەن."
"ئەگەر بێت و فیلەکان گوێیان لەم قسانە بێ..."
وڵات بە یەک دەنگ گوڕاندی:
"فیلەکان گوێیان گرانە، دەنگی ئێمە نابیستن."
مێرووله سەیرەکە هۆشداری پێ دان:
"پەپووەکان پێیان دەڵێن. ئەوان لەژێر ئەمری فیلەکان دان. نابێ هیچ کەس گوێی لە ئێمە بێ، نابێ کەس بزانێ دەڵێین چی..."
سەرجەم وڵاتانی مێروولەکان بە یەک دەنگ هاواریان کرد:
"نابێ گوێیان لێ بێ."
مێروولەکان بە گوێی یەکتریاندا چرپاند:
"تا ڕۆژی ڕزگاری، تا ڕۆژی ڕزگاری."
لە یەک ساتدا، وشەکانی "تا ڕۆژی ڕزگاری" بە گشت وڵاتەکاندا بڵاوبووەوە و بە گوێی مێرووله سەیرەکە گەیشتەوە.
ئەو مێروولانەی لەگەڵ مێرووە سەیرەکە لە لای سوڵتانی فیلەکانەوە گەڕابوونەوە، یەکسەر هاوکاریی هاوڕێیانی تریان کرد کە خەریکی ئاوەدانکردنەوەی شار بوون.
چل ڕۆژ و چل شەو، بە کاری بێوچان پایتەختیان ئاوەدان کردەوە. پاشان دەستیان بە نۆژەنکردنەوەی وڵات کرد. زۆری پێ نەچوو وڵاتیش ئاوەدان کرایەوە.

له لایەکی دیکەوە، کۆشکی سوڵتانی فیلەکان لەسەر چیایەکی بڵیند بەرز دەکرایەوە. وڵاتە وێرانبووەکانی دیکەش هێدی هێدی بونیاد نرانەوە...
مێروولەکان بەردەوام ڕێگەکانی ڕزگاربوون لە چنگ فیلەکانیان تاوتوێ دەکرد. ئا لێرەدا، هەر وشەیەکی حەکیمانە لە چرکەساتێکدا، بە چەپەدوو بە وڵاتاندا دەسووڕایەوە و هەمدیس دەگەڕایەوە.
فیلەکان زۆر گەورە بوون و مێرووەکان زۆر گچکە. ئەویش تا بڵێی گچکە بوون، تا بڵێی گچکە...
فیلەکان زۆر گەورە بوون بەڵام خۆ نەدەکرا هەتا ڕۆژی قیامەت نەتەوەی مێروو ئاوا ئەسیر و کۆیلەی فیلەکان بن و کاریان بۆ بکەن! دەبوایە و دەبێ کۆتاییەکی هەبێ.
هەر کاتێ نسکۆ و نائومێدی بەسەر مێروولەکاندا زاڵ دەبوو، لەبەرامبەردا، هەمان ئانوسات، وشەیەکی هیوابەخش وەک شۆقێک بە وڵاتەکانی مێروولەکاندا بڵاودەبووەوە... مێروولەکان دەیانتوانی بێ نان، بێ ئاو، بێ هەوا بژین، بەڵام بێ هیوا نەیاندەتوانی.
بۆ ئەم مەبەستەش، بۆ ڕزگاربوون لەم ئافاتە، مێروولەکان لە حەوت تا هەفتا ساڵییەوە بیریان دەکردەوە. دەیانزانی گەر ئەقڵیان پێکەوە بەکار بێنن، سەر دەکەون.
فیلەکان بوونەوەرگەلی بەهێزن، بەڵام ئەوانەی ئەقڵیان بەکار دێنن بەهێزترن. ئەقڵی مێروولە بچووکەکان، دەبوایە فیلە زەبەلاحە خودائاساکان تێک بشکێنێ.

سولتانی فیلەکان پۆپەبەرزی سەرکردەی پەپووەکانی بانگ کرد و گوتی:

"فەرمــوو وەرە لەســەر ئەم شــانەم بنیشــە ســەرکردەی پەپووەکان. کارێکی تایبەتم پێتە پۆپەبەرزی برام."

"هەر کارێکــت هەبــێ بەســــەر چــاوان،" ســـەرکردەی پەپووەکــان وای گــوت، فــڕی و لە بــان لقێکــی پەنــا قۆرتمەکەی سولتانی فیلەکان نیشتەوە.

سولتانی فیلەکان گوتی:

"ســەرجەم پەپووەکــان بەپێــی ئەمــر و فەرمــانی مــن هەڵســوکەوت دەکەن. لەمەوبەدوا ئیــدی ڕۆژانە بەدوای مێشــێک، بەرســووورکەیەک و زەردەواڵەیەکــدا نــافڕن. مێروولەکان هەرچی مێش، بەرسوورکە و زەردەواڵە و ئەو خواردنــانەی ئێــوە پێتــان خۆشــە، کــۆبکەنەوە، هەمــــووی هیــــی ئێــــوەیە. نەتەوەی پەپووەکــــانیش لەمەوبەدوا، وەک فیلەکان پاڵ دەدەنەوە و دەخەون."

سەرکردەی پەپووەکان پۆپەبەرز کە لەسەر لقەکە هەڵنیشتبوو، لە خۆشیان نەیدەزانی چ بکا و بە جۆشوخرۆشەوە جریواندی:

"هەر فەرمووودەیەکی هەتانبێ بەسەر چاو. تۆ بەس ئەمر بکە سوڵتانم."

"ئێستا، پێش هەموو شتێ، چی پەپووسلێمانکەی ژێر فەرمانی تۆ لەم دونیایەدا هەیە، دەیانهێنێ. ئەم دارستانە و ئەو ئەشکەوتە گەورەیەی پێشەوەم دا بە ئێوە. بێجگە لە خۆتان لەم دارستان و ئەشکەوتەدا ڕێ بە کەسی تر نادەن. ئەگەر داڵێک، شەهێنێک، بازێک، سیسارکەکەچەڵەیەک هاتە نێو ژینگەی ئێوە، ناوی من بێنن، دەترسێن و جارێکی تر ڕوو ناکەنەوە ئەوێ."

"یارەبی هەر ئاواتێکی هەتە بەدی بێ، ئەی خاوەن شکۆ."

"ئاواتم ئەوەیە لەنێو مێروولەکاندا وەچەیەک بدۆزیتەوە کە لایەنگر و پابەندی من بن، ئەو مێروولانە بە ڕادەیەک پابەندی من بن ئەگەر گوتم بمرن، دەبێ بمرن، گوتم بژین دەبێ بژین. هەروەها بە ڕادەیەک ببنە دوژمنی مێروولەکانی دیکە، ئەگەر لەبەر چاویان هەموو نەتەوەی مێروولەکان پان بکەمەوە، بڵێن ئۆخەی. بێجگە لەمە دەبێ مێروولەیەکی زۆر بدۆزینەوە پابەندی من بن، لە مێروولەی جۆراوجۆر."

سەرکردەی پەپووەکان گوتی:

"باشە. فیکری چاکە، فەرموودەکانت لەسەر سەرم."

"سـەرجەم نەتەوەی پەپووەکـانم کـردە بەرپرسـی پڕوپاگەنـدەی خـۆم، هەروەهـا نەتەوەی فیلەکـان. لەم دونیـایە بـێجگە لەمە کـارێکی تـر نـاکەن. هەتـا زووە سەبارەت بە مردوو و زیندووی مێروولە ڕدێنسوورەکە هەواڵێکم لێ بگێڕنەوە... سەرهەڵداوەکان، ئەوانەی کار نـاکەن و ئەوانەی دوژمنـایەتی فیلەکـان دەکەن، دەستنیشـان بـکەن. سـەرەتا هەوڵ دەدەیـن مێـروولەی سـەرهەڵداو بکـرینەوە، ئەگەر نەکـرا یەکسـەر بە ئەشکەنجە دەیانکوژین... ئێستا بفڕە و بڕۆ، جارێ بزانە مێروولەکـان چ دەکەن و هەواڵێکم بـۆ بێنە. لەمەوبەدوا یەکەم ئەرکـت ئەوە دەبـێ سـەبارەت بە دۆخـی مێروولەکـان زانیـاریم پـێ بـدەی. پاشـان دەبـێ ئەو مێـرووولانەی بـوونەتە پیـاوی ئـێمە، یەکە یەکە بە وڵاتـی مێروولەکاندا بڵاو بکەیتەوە. مێروولەکانی دارودەستەی ئێمە دەبێ لەسەر ئەرز و بن ئەرز، لە ئاسمان و دەریا بەردەوام لە ڕدێنسـوور بگەڕێـن. مـن لەو ڕدێنسـوورە دەترسێم. دەبێ گەمەیەک بلیزین مێروولەکان بە دەستی خۆیان ڕیشسوور بگرن و ڕادەستی ئێمەی بکەن، جا چ مردوو بێ، چ زیندوو... بەڵێ، ڕیشسوورم بە مردوویی یـان بە زینـدوویی گەرەکە. بـا هەمـوو دونیـا بزانـێ تـا ڕیشسـوور بە مردوویـی یـان بە زینـدوویی نەدۆزراوەتەوە، مـن ئاسـوودە دانانیشـم. نـاهێڵم مێروولەکانیش بە ئاسوودەیی دابنیشن. تێگەیشتی؟"
پەپووەکە جریواندی:

"تێگەیشتم سوڵتانی مە."
"دامەزراندنی ڕێکخراوێک لە وڵاتانی مێروولەکان بۆ ئەو مێروولانەی لایەنگری ئێمەن، ڕۆژ بە ڕۆژ وەرگرتنی زانیاریی لە مێروولەکان و تەنانەت گوێگرتن لە هەناسەیان گرنگترین کارە. ئەمە لە سەرووی هەموو شتێکەوە دێ. ئەگەر ڕێکخستن لە ناوەوە و پووکاندنیان کە مرۆڤەکان بەمە دەڵێن شۆردنەوەی مێشک، دەست پێ بکەین، یانی ئەگەر مێشکی مێروولەکان بشۆینەوە، وایان لێ بکەین لە بیریان بچێتەوە مێروولەن، ئەوا لە هەموو ڕوویەکەوە قازانجمان کردووە. ئەم سیستەمە تا قیامەت بەردەوام دەبێ، ئێوە و ئێمەش لەسەر پشتی مێروولەکان، بە ڕەنجی شان و ئارەقەی نێوچەوانیان لە دونیایەکی بەهەشتئاسادا دەژین. وا نییە؟"
"وایە سوڵتانی مە."
"ئێستا باش گوێم بۆ ڕادێرە..."
"بان سەرم خاوەن شکۆ!"
"دەزانی وشەی داگیرکاری چ مانایەک دەگەیەنێ؟"
"دەزانم سوڵتانم."
"جا ئەم وشەیە دەبێ لە فەرهەنگەکان بسڕدرێتەوە، نابێ هیچ مێروولەیەک ئەم وشەیە بێنێتە سەر زمان. ئەم سیستەمە نوێیەی ئێمە، سیستەمێکە کە نەتەوەی مێروولەکان سەدان هەزار ساڵە هەرچی کردوویانە نەیانتوانیوە پێی بگەن. ئێمە سیستەمی ئازادیمان پێشکەش کردوون کە سەرجەم بوونەوەرەکان سەدان

هەزار ساڵ ئاواتەخوازی بوون و پێی نەگەیشتوون.
لەمەوبەدوا گشت مێروولەکان، گشت فیلەکان،
پەپوولەکان و سەرجەم گیانلەبەرانی سەر گۆی زەوی
ئازادانە پێکەوە دەژین."
سەرکردەی پەپوولەکان، پۆپەبەرز لەسەر لقەکە
خوێندی:
"لە سایەی سەری سوڵتانەکەمان، ژیاوین و دەژیین."
"ئازادی سەرەتای هەموو شتێکە. لەمەودوا تا ڕۆژی
قیامەت هەموو گیانلەبەران پێکەوە ئازادانە دەژین. بۆ
ئازادی، تەنیا و تەنیا بۆ ئازادی گیانمان فیدا دەکەین."
سەرکردەی پەپوولەکان باڵەکانی لێک دا و وشەی
"ئازادی" جریواند.
سوڵتانی فیلەکان گوڕاندی: "ئازادی". چیاکان، دەشتەکان
و لێڕەوارەکان هەژان، زایەڵەی "ئازادی، ئازادی" لە
دونیادا بیسترا.
"هەر کەسێ وشەی چەوسانەوەی هێنایە سەر زمان،
دەبێ دەسبەجێ بکوژرێ. تەنانەت ئەگەر مێروولەیەک
بە هەڵە وشەی چەوسانەوەی بەکار هێنا، یەکسەر دەبێ
بکوژرێ. ئەوەی ئەم وشەیەی هێنایە سەر زمان، بە
دەستەکانی خۆت دەیکوژی."
"خۆم دەیکوژم."
"چەوسانەوە نییە."
"چەوسانەوە، ڕیسواییە."
"ئازادی هەس."

"تەنیا و تەنیا ئازادی هەس سوڵتانمان."
"ئازادی هەس... دەی بەخێر بچی. ڕیشسوورت بە هیچ شێوەیەک لە بیر نەچێ!"
"لە بیرم ناچێ."
"دەی بفڕە!"
پۆپەبەرز فڕی، یەکسەر ڕووی کردە وڵاتی پەپووەکان و خۆی بە هێلانەکانیاندا کرد. پەپووەکان لە دەوری یەک کۆبووبوونەوە و چاوەڕوانی وی بوون. بە بیستنی مزگێنییەکە هەزاران باڵ لە خۆشییان بە شەقەشەق کەوتن، خێرا ڕووەو ئەو دارستانەی سوڵتانی فیلەکان پێشکەشی کردبوون، فڕین، پەلەوەرەکانی پێشووی دارستانیان وەدەر نا و خۆیان خزاندە نێو هێلانەکانیانەوە. هەندێک لە مەلەکان ویستیان بەرەنگاری پەپووەکان ببنەوە، ئەوانی دی یەکسەر فیلەکانیان نیشان دان. مەلەکان بە بینینی ئەم فیلە زلانە، لە ترسان زراویان تۆقی، خێرا دارستانیان جێهێشت و تێیان تەقاند.
پەپووەکان لەنێو هێلانە چۆلوهۆلەکانی دارستانەکەدا بە ئاسوودەیی جێی خۆیان خۆش کرد. لە کاتێکدا پێشتر لە ترسی مەلەکانی دی تەنانەت نەیاندەتوانی نزیکی ئەم دارستانە ببنەوە. جاران نەیاندەتوانی لە بێشەڵانە وشکوبرینگەکەی خۆیان بێنە دەر و ئێستاش دەستیان بەسەر خواردەمەنیی کەڵەکەکراوی ئەو مەلانەدا گرتبوو کە ڕاویان نابوون.

سەرۆکی پەپووەکان پاشان بەرەو وڵاتی مێروولەکان لە شەققەی باڵی دا. بە درێژایی ڕێگەکان ڕیزی ڕەش و سوور و زەردی مێروولەکانی دەبینی کە تا دامێنی چیاکان درێژ بووبوونەوە. ڕووی لە وڵاتی مێروولەکان وەرگێڕا و بەرەو ئەو شوێنە چوو وا بڕیار بوو سەرای سوڵتای فیلەکانی لێ ڕۆ بنرێ. مێروولەکان بەقەدەر بستێک دیواری بلوورینی بناغەیان بەرز کردبووەوە، ئا لێرەدا بە هێزی ئەوان سەرسام ما. کە ئەم نەتەوەی مێروولانە خاوەنی وەها هێز و تەقەلایەک بن و هێندە ماندوونەناس بن، پێویستە لێیان بترسی. سوڵتانی فیلەکان ناهەقی نەبوو، ئەم مێروولانە ڕۆژێک هەرچۆنێک بێ، هەرچییەکی کردبێتان، خۆیان لەژێر چنگی فیلەکان ڕزگار دەکەن. خەریک بوو بڵێ لە چنگ داگیرکەری... دەیزانی ئیتر بۆی نییە تەنانەت بیر لە وشەی داگیرکەریش بکاتەوە...

پۆپەبەرز مەلێکی پیر و بەساڵاچوو بوو. چاوەکانی بچووک بووبوونەوە بەڵام کەم حوکم نەبووبوون. ئەوەتەی بووبووە سەرکردەی پەپووەکان، ئەوەتەی لە هێلکە هاتبووە دەر، کاروباری بووبووە بیرکردنەوە. بە مەبەستی پاراستنی وەچەی پەپووەکان، لە ئاسمانەکانەوە بیرچان بیری کردبووەوە، ئێستاش لە فیلەکان کە دەیانویست سەرجەم بوونەوەرەکانی سەر ڕووی زەوی بکەنە کۆیلەی خۆیان، نزیک بووبووەوە. ئەم چاخە چاخی فیلەکان بوو. بەسەر گۆیی زەویدا زاڵ

دەبوون، هەموو بوونەوەرەکانی ڕووی زەوی، مێروو، مەل، دار، جڕوجانەوەر، گوڵ و مرۆڤیان دەچەوساندەوە. بۆ ئەم مەبەستەش سەرەتا مێشکەکانیان، هەستەکانیان، خاک و ئاو و جەستەیانیان تەفروتوونا دەکرد. سوڵتانی فیلەکان زۆر ژیرانە هەڵسوکەوتی دەکرد، باش دەفکری. دەبوایە یارمەتیی بدا. دەبێ سەرەتا مێروولەکان بکرێنە پانزە، بیست، چل، هەزار پارچە، پاشان هەر کام لەم پارچانە بکاتە دوژمنی قەستەسەری ئەوانی تر. مێرووڵەی پارچەپارچەبوو، هەرگیز ناتوانن ببنە هێز، تا هەتایەش کوێلە دەمێننەوە.

ئینجا پۆپەبەرزی سەرکردەی پەپووەکان بەرەو وڵاتی مێروولەکان هەڵفڕی. لە نێوەڕاستی شاری نیشتەوە، پیاوماقووڵانی مێروولەکانی لە دەوری خۆی کۆکردەوە. گوتی:

"بڕوانن، هاوڕێیان، چ یارمەتییەک لە توانامدا بێ بۆ ئێوە دریغی ناکەم. ئەگەر من نەبوایەم، ئێوەم سواری شانەکانم نەکردایە و نەمبردبایەن بۆ لای سوڵتانی فیلەکان، لای ئەو کەسە گەورەیە، ئەو بەهێزترین بوونەوەرەی دونیا، کە بوون و مردنی بەدەستە، ئاخۆ تا ئێستا تەنانەت مێروولەیەک لەسەر ڕووی زەوی دەمایەوە، وەچەی مێروولەکان لە جیهان نەدەسڕدرایەوە؟ ئینجا چ بووە، بەرامبەر بە بەخشینی نەتەوەیەکی مەزنی وەک هیی مێروولەکان، کۆشکێک

ساز دەکەن، هەندێکیش خواردەمەنی دەگوازنەوە بۆ عەمباری فیلەکان. توخوا ئەمەش کارە، مەگین سوڵتانی فیلەکان کە بوون و مردنی بەدەستە، گیانتانی نەبەخشی... زۆر شوکر سوڵتانی فیلەکان..."

هەموو تێکڕا گوتیان:

"زۆر شوکر سوڵتانی فیلەکان."

"هێزی بوون و نەبوون بەدەست ئەوە."

دیسان مێروولەکان تێکڕا گوتیان:

"بەدەست ئەوە."

لەناویاندا مێرووڵەی زەردی پیاوماقووڵیش بەدی دەکران. نیگایان بەدەهۆ، خۆ بەزۆرزان و خایینانە بوو. سەرکردەی پەپووەکان بێ ئەوەی مێروولەکانی تر هەست پێ بکەن، ئاماژەیەکی بۆ کردن. مێروولە زەردەکان هەموو شتێک تێگەیشتن، لە خۆشیان فیکەی سمێڵانیان دەهات.

مێروولەکان گوتیان:

"پێی بڵێ، بە سوڵتان بڵێ، بە ساڵێک کۆشکەکە تەواو دەکەن. بە هۆی ئەوەی گیانمانی بەخشیوە، کۆشکەکەی گەورەترین و بەشکۆترین کۆشکی سەر گۆی زەوی دەبێ. کۆشکەکەی بە خۆر و مانگ دەڵێ ئێوە دەرمەکەون، چونکە من لەسەر زەوی هەڵاتووم."

مێروولەکان شارە وێرانەکانیان ئاوەدان کردبووەوە، زامی برینداره‌کانیان پێچابووەوە، هەما هەما

گەڕابـــوونەوە بـــۆ دۆخـــی پێشـــوویان. چـــی نەمـــابوو بەختەوەرییەکانی پێشوویان دەست پێ بکەنەوە.
هەر وا کە مێروولەکـــــــان قســـــــــەیان دەکـــــــــرد، پەپووســـــلێمانکەکە لەناویانـــــدا بەدوای ڕدێنســـــووردا دەگەڕا. بـــۆی هەبـــوو قەڵافەتـــی گـــۆڕیبێ و وێـــڕای مێروولەکـــــان لەو مەیـــــدانە بـــێ. مەلەکە بە چـــــاوە شەهێنئاســاکانی یەکە یەکە مێروولەکـانی تـاوتوێ کـرد، لەو ناوەدا کەسـی نەبینـێ شـێوەی ڕدێنسـوور بـدا. گەلۆ دەبوایە لەناکاو پرسیاری ویی بکردبایە، مێروولەکانی حەپەســـاندبا و قســـەیەکی ســـەبارەت بەو هەڵهێنجابـــا؟
خوتوخافڵ، بەدەم بزەوە و بە نەرمی پرسیی:
"ڕیشسوور لە کوێیە، لەنێو ئێوەدا نایبینم."
مێروولەکـان پێشـان سـەراسـیمە بـوون، پاشـان لە جێـی خۆیان ڕەق بوون و وەڵامی پۆپەبەرزیان نەدایەوە.
سەرکردەی پەپووەکان پێداگریی کرد:
"ڕیشسوور لە کوێیە؟ لەکنەخۆ من سواری پشتم کرد و وڵات بە وڵات گێـــــــــڕام. خـــــــــوێنەکەی هەر وا بە باڵەکـانمەوەیە، بە نـووکی پەڕەکـانمەوە وشـک بـووە و ڕەق هەڵـگەڕاوە. بـۆچی نـایەتە جڤـاتی مـن؟ منێـک کە ڕاوێژکـــاری گشـــتیی ســـوڵتانی فیلەکـــانم. مـــن بـــووم نەمهێشــت شــارەکانتان لەگەڵ خــاک یەکســان بــن، مــن بـــووم نەمهێشـــت وەچەی مێروولەکـــان لەســـەر ڕووی زەوی بســـڕدرێتەوە، مـــن بـــووم، مـــن... مـــن نەبـــم چـــۆن دەنگتان دەگەیەننە سوڵتانی بەشەوکەتی فیلەکان؟"

پۆپەبەرز وەها هاواری کرد و گوڕاندی، هەموو ئەو ناوەی شێواند، بەڵام سەبارەت بە ڕیشسوور تەنانەت نەیتوانی وشەیەک لە زاری مێروولەکان دەربێنی. زۆری مەراق وررووژابوو، چی بەسەر ئەم ڕدێنسوورەدا هاتبوو؟

"تۆ بڵێی ڕدێنسوور مردبێ؟ دەزانم کە لەسەر باڵم ڕا خۆی فڕێ دا و نەمرد. لە کوێندەرە؟"

دیسان کەس وەڵامی نەدایەوە. کە قسە دەهاتە سەر ڕیشسوور، فزەیان لێ دەبڕا.

پۆپەبەرز هەڵچوو:

"پاش تەواوبوونی کۆشکەکە، ئەشکەوتەکان و کونی نێو دارەکان بە هەنگوین بئاخنن. سوڵتان ئاشقی هەنگوینە. هەموو کوللەکانی دونیاش بێننە ئەم دارستانەی خۆمان. میوەی گەورە بدۆزنەوە، میوەی وا هەنگوینیان لێ بتکێ و بێ ئەوەی پەڵەیەکیان تێکەوێ، تۆن تۆن بیانگوازنەوە بۆ کۆشک... ئێوە و چاکەیان نەگوتووە. ئەگەر گشت ئەم گوتانەم لە ماوەیەکی کورتدا بەجێ نەهێنن بۆ خۆتان دەزانن. وەک بڵێی بوونی نەتەوەی مێروولە لەم دونیایەدا زۆر گرنگ بێ! نەشبن دەبێ، لە دونیادا بوونەوەر هێند زۆرن نەبێتەوە، هەموویشیان بە مەبەستی کارکردن بۆ فیلەکان، ئەم گیانلەبەرە مەزن و بەشکۆ و پایەبەرزانە، ئامادەن گیان بەخت بکەن، بوونەوەرەکان گشتیان بۆ سازکردنی کۆشک و سەرا و کۆکردنەوەی هەموو خواردەمەنییەکانی دونیا بۆ

فیلەکان پێکەوە ململانێیانە. دوێنێ پاشای هەڵۆکان هاتە لای سوڵتانمان، بە باڵە زەبەلاح و پانەکانیەوە خۆی بە ئەرزدا دا و گوتی ئەمر کە سوڵتانم، ئەمرم پێ بکە تا لەسەر ڕووی زەوی چی هەیە و چی نییە بۆت بێنم. شاباڵەکانمان پانن، بە گشت ئاسمانەکاندا دەفڕین، چاوەکانمان تیژن، بچووکترین ئامانج دەبینین، لووتمان بچووکترین بۆنی بۆ دێ، بۆیە دەزانین لە دونیا چ هەیە و چ نییە. بە سەدان هەزارین، بۆ فەرمانی تۆ ئامادەین. جا دەزانن سوڵتانی فیلەکان چیی پێ گوت، ئێوە هەڵیدەن مێرووولە بەڕێزەکان، چ وەڵامێکی دایەوە، دەڵێن چی، دە بڵێین لە وەلامی هەڵۆکاندا چیی گوت؟ گوتی مێرووولەکانی من سەلامەت بن، ئەوەتەی دونیا دامەزراوە، مێرووولەکان هەموو کارێکیان بۆ ڕاپەڕاندووم. من لەگەڵ مێرووولەکانی عەبدم وەک ئێسک و گۆشت، باران و خاکم لێ هاتووە. خۆی بن و بناوانی ئێمە دەگەڕێتەوە بۆ سەر مێرووولەکان، باب و باپیرانی ئێمە سەرەتا مێرووولە بوون. لەوەتەی دونیا دونیایە نە مێرووولە لە فیل دابڕاون، نە فیل لە مێرووولە... ئامان، کارتان بە برایانی مێرووولەمان نەبێ، ئەی هەڵۆکان، ئەگەر بێت و لە مێرووولەیەکی برامان هەڵپێچن، ئەوسا من دەزانم و ئێوە. شەق بەو ئاسمانانە دەبەم کە پێیاندا دەفڕن، ئەو گابەرد و شاخانەی لەسەریان هەڵدەنیشن، دەیانڕوخێنم و دەیانکەمە دەشتێکی تەختوڕاست. هەڵۆ گوتیان ئەیەڕۆ سوڵتانمان،

کـێ خـۆ لە مێـرووولە پیرۆزەکـانی تـۆ دەدا. ئەگەر لە دەسـتمان بێ هەمـوو مێرووولەکـانی ئێوە بە باڵەکانمـان هەڵـدەگرین. سـوڵتانمان گـوتی ئیتـر بـاش بـزانن، لەو ڕۆژەوەی دونیـا هەیە مێـرووولە وەچەی ئـێمە بـوون و ئـێمەش وەچەی مێـرووولە... مـن لەم دونیـایەدا شـانازی بەو مێرووولانەوە دەکەم کە وەچەی من لەوانە. من نەزم و نیزامـی خـۆم نـاگۆڕم، لەگەڵ مێرووولەکـان دوو دیـوی یەک دراوین... لەوەتەی دونیا دامەزراوە، ئاوایە."
سـەرکردەی پەپوولەکـان، پـۆپەکەی هەڵمسـابوو و بە توورەییەوە لە مێرووولەکانی پرسی:
"لەوەتەی دونیـا دونیـایە ئێـوە لەگەڵ فیلەکـان یەک نەبـوون، کارتـان بـۆ فیلەکـان نەکـردووە، لەگەڵ ئەوان یەک نەبوون، پێم بڵێن بزانم، ئەی مێرووولەینە..."
مێرووولەکان چاوێکیان لە یەکتری کرد، بە نیگای چاو لە یەکتریـان پرسـی ئـاخۆ قسـەکانی مەلەکە ڕاسـتن و ماوەیەکی زۆر پێکەوە سرتوخورتیان بوو.
"ئەوە دەڵێ چی؟"
"ئێمە لەوەتەی دونیا دامەزراوە لەگەڵ فیلەکان یەکین؟"
"فیلەکان لە مێرووولە بوون؟"
"لەوەتەی دونیا دونیایە ئێمە کۆشک و سەرای فیلەکان دروست دەکەین؟"
"ئێمە پێخۆریان پێ دەدەین؟"
"ئێمە سکیان تێر دەکەین؟"
"کێ دەزانێ، ڕەنگە..."

"ڕەنگە ئێمە فیلمان هێنابێتە دونیا."
"ئێمە جەدی فیلەکانین..."
"مێرووڵەیەک یانی فیلێک."
مێرووەکان تێک ئاڵان، قسە و ڕاوێژیان کرد، ئینجا کەمێک دواتر تێکڕا هاواریان لێ بەرز بووەوە:
"هەڵۆ چ کارەن، ئێمە لەوەتەی دونیا دامەزراوە هاوشانی فیلەکان بووین."
"هەڵۆکان چ کارەن باشە..."
"لە کوێوە هاتوون؟"
"ئێمە هەبین، فیل چ پێویستییەکیان بە هەڵۆ هەیە؟"
"هەتا ئێمە هەبین..."
"باشە هەزار ساڵ، دە هەزار ساڵ ئێمە خواردەمەنی بۆ فیلەکان ناگوازینەوە؟"
"ئێمە کۆشکیان بۆ ساز ناکەین؟"
"هەر ئیشێکیان هەبێ ئێمە ڕایناپەڕێنین؟"
پۆپەبەرز لە خۆشیان باڵەکانی ڕاتەکاند:
"هەر مێرووە و فیلێکە."
مێرووڵەکان هەموو پێکەوە هاواریان کرد:
"هەر مێرووە و فیلێکە."
گشت ئەو مێرووڵانەی لەسەر ڕێوبانان بوون، ئەمەیان بیست و تێکڕا دووپاتیان کردەوە: "هەر مێرووە و فیلێکە، فیلێکە، فیلێکە."
پۆپەبەرز:

"ڕۆژی سەد کەڕەت ئەمە دەڵێنەوە. هێندەی دووپات بکەنەوە بەشکم ئێوەش ببنە فیل، ئەگەر نەشبوون هەست دەکەن بوونەتە فیل، هیچ نەبێ خۆتان بە فیل دەبینن."

"هەر مێرووە و فیلێکە، هەر مێرووە و فیلێکە، فیلێکە، فیلێکە..."

هێندە بە دووپاتکردنەوەی ئەم قسانە دڵخۆش بوون، هێندە دڵخۆش بوون کە زۆری نەمابوو مێرووولەکان خۆیان بە فیل بزانن. مێرووولەی سەر ڕێگەوبانانیش دووپاتیان دەکردەوە:

"هەر مێرووە و فیلێکە، هەر مێرووە و هەر مێرووە و فیلێکە، فیلێکە."

پۆپەبەرز ویستی سوود لەم جۆشوخرۆشە وەربگرێ و دیسان هێمنانە پرسیی:

"جەنابی مێرووە شەلەی ڕدێنسوور مردووە، زیندووە، لەم وڵاتەیە یاخود بزر بووە؟"

مێرووولەکان یەک دەنگ وەڵامیان دایەوە:

"هەر مێرووە و فیلێکە."

"من پرسیاری مێرووە شەلەتان لێ دەکەم."

"هەر مێرووە و فیلێکە."

"زۆر خراپ لەسەرتان دەکەوێ ئەگەر چارەنووسی مێرووە شەلە نەدرکێنن."

"هەر مێرووە و فیلێکە."

"ئەم هەڵوێستەی ئێوە سەبارەت بە مێرووە شەلە بۆ سوڵتان دەگێڕمەوە."
"هەر مێرووە و فیلێکە."
"وای نـاخۆن"، پـۆپەبەرز ئەمەی گـوت و بە ڕقەوە لە شەقەی بـاڵی دا و فـڕی. لە کـاتی فڕینیشـدا لە یـادی نەچوو چاوێک لە مێروولە زەردەکان دابگرێ.
فڕی، لەسەر دارچنارەکەی دەرەوەی شـار نیشتەوە و لەوێ چـاوەڕوانی مێـروولە زەردەکـان مـایەوە. بەرەبەرەی ڕۆژئـاوابوون مێـروولە زەردەکـان لەسـەر ڕێ بەدەرکەوتـن، پـۆپەبەرز دەسـبەجێ بەرەو پیلیـان بـاڵی گـرت، لەسـەر ئەرز نیشـت، مێروولەکـانی سـواری باڵی کرد و هەڵفڕی.
"کاتێک لە شار هاتنە دەرێ خۆ کەس ئێوەی نەبینی؟"
"بۆ دەهێڵین بمانبینن، یەکسەر تێگەیشتین مەبەستی تۆ چییە."
"سوڵتان ئێوەی، ڕەچەڵەکی ئێوەی، بە پارێزەری هەموو مێروولەکـان دەستنیشـان کـردووە. لەمەوبەدوا ئێـوە دەبـنە پـارێزەری سـەرجەم مێروولەکـانی دونیـا. کە چوونە حزوور سوڵتان، پێی بڵێن ئێمە هەر لە ئەزەلەوە، بەپێـی فەرمـانی سـوڵتانی فیلەکـان، بە پـارێزەری مێروولەکـان دەستنیشـان کـراوین. ئەم ئەرکەمـان تـا دوایی بەجێ هێناوە. ئێمە بەرپرسی مێروولەکانین لەم دونیـایەدا. ئەوەی ڕاسـتی بـێ، ئـێمە بە هـۆی ئەو گوناهـانەی تووشـیان بـووین، ئەو فـیلانەین بە ئەمـری

سوڵتانی فیلەکان بووینەتە مێرووله. ڕەچەڵەک و جەدی ئێمە فیلن."
مێرووله زەردەکان تێکڕا لەسەر باڵەکانی پەپووەکەوە هاواریان کرد:
"ڕەچەڵەک و جەدی ئێمە فیلە."
"ئەگەر ڕاستگۆیانە کار بکەین، سوڵتانی فیلەکان دیسان دەمانکاتەوە فیل."
مێروولەکان دووپاتیان کردەوە:
"ئەگەر ڕاستگۆیانە کار بکەین، سوڵتانی فیلەکان دیسان دەمانکاتەوە فیل."
"بڕوا و ئیمانمان بەمەیە."
مێرووله زەردەکان دووپاتیان کردەوە:
"بڕوا و ئیمانمان بەمەیە."
"ئیمانمان پێیەتی!"
پۆپەبەرزی سەرکردەی پەپووەکان لەپڕێکا قسە بە جۆشوخرۆشەکانی پێ بڕین و بێ پێشەکی پرسیی:
"چ بەسەر ڕدێنسووردا هات؟"
مێروولەکان بە هیچ شێوەیەک چاوەڕوانی وەها پرسیارێک نەبوون و وە لاڵەپەتی کەوتن.
مەلەکە یەک بە خۆی گوڕاندی:
"بێژن چ ڕووی دا؟"
لە ڕقان وەک مێوژۆکە دەلەرزی. وا دەلەرزی چیی نەمابوو مێروولەکانی سەر باڵی بکەون. چا نەبوو مێروولەکان باش خۆیان بە پەڕەکانەوە گرتبوو.

"بەو جـۆرەی ئێـوە بێـدەنگن، ئەم ڕیشسـوورە شـتێکی بەدەستەوەیە."
"ئێمە ڕیشسـوور هەر ناناسـین"، مێروولەیەکـی زەلامـی سـەر بـاڵی ڕاسـتی وای گـوت. "نە بینیومـانە، نە دەیناسین."
مەلەکە باڵەکانی شێتانە ڕاوەشاند و گوتی:
"دەیناسن. دەیناسن. لە دونیای مێروولەکاندا، لێرەوە تـا چین و ماچین، کەس نییە ڕدێنسوور نەناسێ. ئەو پیری گشـت مێـرووله ئاسـنگەرەکانی دونیـایە. هەمـوان دەیناسن."
"نە بینیومـانە، نە بیسـتوومانە و نە ئاسـنگەرێکی وەهـا دەناسین. ڕەنگە هیی وڵاتێکی تر بێ."
پۆپەبەرز هاواری کرد:
"مەحاڵە، هیی وڵاتی ئێوەیە."
مێروولە زەلامەکە گوتی:
"کەوایە ئێمە مێروولەی زۆر گەنجین، پێش ئەوەی ئێمە لەدایک بین، ئەو مردووە."
پۆپەبەرز گوڕاندی:
"ئەوەی دوێنـێ لەگەڵ سـوڵتان قسـەی کـرد، ئەو بـوو. دوێنێ لەسەر باڵی من بوو، لەو شوێنەی ئێوەی لێن."
مێروولە زەردە زلە پیرەکە گوتی:
"ئەهـا، تێگەیشـتم. دەزانـم، ئەو خـۆ لە ئـێمە نیـیە، ئەو مێروولەیەکـی ئـاڵە... ئەو هیـی ئەوبەری وڵاتە. ئـێمە ئەوێندەرێ ناناسین. لەنێو ئەم هەموو مێروولەیەدا چۆن

ڕدێنسوور بناسین؟ ئێمە بە ملیارد مێرووڵەی زەردین لەسەر ئەم گۆی زەوینە، ئەگەر سوڵتان ئەمر بکا، بەدوای ئەو ڕدێنسوورەدا دەگەڕێین و دەیدۆزینەوە."

پۆپەبەرز ڕقەکەی فەرامۆش کرد و گوتی:

"چاکە، چاکە. کەوایە ڕیشسوور دەدۆزنەوە؟"

"مردوو یان زیندوو دەیدۆزینەوە و دەیهێنینە بەردەم سوڵتان. بن و بناوانی ئێمە فیلن. ئێمە دواتر بووینەتە مێرووڵەی زەرد و ورد."

مێرووڵەکانی تریش دووپاتیان کردەوە:

"بن و بناوانی ئێمە فیلن. ئێمە دواتر..."

"مردوو یان زیندوو..."

بەم جۆرە گەیشتنە بەردەم سوڵتانی فیلەکان. سوڵتان وەک چیایەکی سپیی ماسیاو دەهاتە بەرچاو. کەفەڵی بە نێوقەدی دارچنارێکی سەد ساڵەوە دابوو و خۆی دەخوراند، چنارەکە وەک ئەوەی بوومەلەرزەی لێ دابێ لەنێو تەپوتۆزدا ون بووبوو، لق و گەڵاکانی دەشکان و دەوەرین، چنارەکە تا سەر ئەرز دادەهاتەوە و پاشان بە تەقوتۆق دەگەڕایەوە بۆ جێی خۆی.

پۆپەبەرز ماوەیەکی زۆر ڕێک بە بەرچاوی سوڵتانەوە فڕی، هاوار و قیرەقیڕی کرد، بەڵام فیلەکە نەیبینی. کەمێک دواتر، چنارەکە لە ڕەگەوە هەڵکەنرا و لە کاتێکدا دەوروبەری دەهەژاند ڕمب کەوتە سەر زەوی، ئا لەو ساتەدا فیل لە مەستی و شیرینخەوی خۆخوراندن

خەبەری بـــووەوە و مەلەکەی بینـــی کە بە قـــاوقیژ بە دەوری سەریدا دەسووڕایەوە:

"ئۆۆ، پەپووی برام، ڕاویژکارم، بەخێر هاتی، بـان سـەر و بان چاو هاتی، دەنگوباس چییە، ئەی هەواڵی مێروولە عەبدەکانم؟"

پۆپەبەرز گوتی:

"کە مـن دەهـاتم مێـروولەی سـەرجەم وڵاتـان تێکـڕا هاواریـان دەکرد هەر مێرووە و فیلێکە. هەر مێـرووە و فیلێکە، فیلێکە..."

فیل لە خۆشیان گوێچکەکانی ڕاتەکاند و گوتی:

"ئەمە هەواڵێکی باشە. ڕاستە، هەر مێرووە و فیلێکە."

مێروولەکـانی سـەر باڵەکـانی پـۆپەبەرز بە بیسـتنی ئەم قسەیە بەیەکەوە گوڕاندیان: "هەر مێرووە و فیلێکە. هەر مێرووە و فیلێکە. هەر مێرووە و..."

سوڵتان گوتی:

"دەنگێکم بیست. دەڵێی هەندێک قسە دەکەن."

پۆپەبەرز گوتی:

"حەی، کە ڕووی گوڵی سوڵتانم بینی، شـۆقی سـیمای وا مات و حەیرانی کردم زۆری نەمـابوو لە بیرم بچێتەوە، گەورەکانی ڕەچەڵەکی مێروولە زەردەکـانم لەگەڵ خـۆم هێناوە و ئەوە لەسەر پشتمن."

سوڵتان پرسیی:

"دەڵێن چی؟"

"تا ئێرە لەسەر پشتم پەیتاپەیتا هاوار دەکەن، ئێستاش هەر ئەو قسانە بە دەنگی بەرز دووپات دەکەنەوە، بن و بناوانی ئێمە فیلە، فیلە، سوڵتان دیسان دەمانکاتەوە فیل ئەگەر بێت و ڕاستگۆیانە خزمەتی بکەین..."

"باشە، جوانە، هەموو شتێ باش دەڕواتە پێش. لەسەر پشتت دایانبەزێنە و وەرە لام. مێروولە زەردەکانم لە بن تۆکلاشی ئەم دارە دابنێ با پشوو بدەن. پێیان بڵێ ئەو دارەم بۆ ئەوان دەمەونخوون کردووە، با بە دڵی خۆیان لەسەر پەلک و نێو تۆولەکانیدا بحەسێنەوە و ماندوویەتییان دەربکەن."

کاتێک پۆپەبەرز ئەم قسانەی سوڵتانی بۆ مێروولەکان وەرگێڕا، مێروولەکان لە خۆشیان مەست و سەرخۆش بوون. هاواریان کرد:

"هەر بژی سوڵتانی مە! بن و بناوانی ئێمە فیلە، فیلە. ئێمە فیلین و بووینەتە مێروولە."

"دەڵێن چی؟"

"دەڵێن ئێمە فیلین و بووینەتە مێروولە."

"چ قسەیەکی جوانە، وا نییە؟"

"قسەکەیان زۆر جوانە سوڵتانی مە."

"ئەمنیش دەبێ زمانی مێروولەکان فێر بم، وا نییە پۆپەبەرزی برام؟"

"ڕاستە، پادشام."

"مادەم لەوەتەی دونیا دونیایە من پادشای مێروولەکانم..."

"پادشای سوڵتانم."
"بۆ فێربوونی زمانی ڕەعیەت زۆر درەنگ کەوتووین، زۆر درەنگ کەوتووین، زۆر..."
پۆپەبەرز ئاخێکی هەڵکێشا و گوتی:
"زۆۆۆر درەنگ کەوتووین."
سوڵتان گوتی:
"وەرە با ئێستا قسان بکەین هاوڕێ. زۆر شت هەیە قسەی لەسەر بکەین. بەڵام بە نهێنی..."
پەپوو گوتی:
"با بە زمانی فیلان قسە بکەین سوڵتانم. ئەمە لە هەمووی نهێنیی ترە. مێروولە هێشتا فێری زمانی فیلان نەبوون. سەرەتا من ئەوەی بینیومە و دەیزانم بۆ سوڵتانی خۆمانی دەگێڕمەوە و پاشان باسی ئەو شتە نهێنییانە دەکەین."
سەرکردەی پەپووەکان، پۆپەبەرز، پاش ئەوەی هەرچی بینیبووی و دەیزانی، هەرچی سەبارەت بە مێرووە سوور بیستبووی و هەڵوێستی مێروولەکانی موو بە موو بۆ سوڵتان گێڕایەوە، گوتی: "ئەوەی دەمویست بیڵێم ئەمە بوو سوڵتانی خۆمان." ئینجا بێدەنگ بوو.
سوڵتان سوپاسی کرد و هاتە گۆ:
"جا ئێستا گوێم لێ بگرە پۆپەبەرزی برام. ئەممان، یەکەم کارمان ئەوەیە زمانی فیل فێری مێروولەکان بکەین. مێروولە خۆیان زمانیان نییە، هەشیانبێ، نوقسانە، تێگەیشتی؟ هەشیانبێ چوار پێنج وشەیەکە. بە

چوار پێنج وشە ناتوانی لەم جیهانەدا بژی. لە دونیادا تەنیا زمانێک هەیە، ئەویش زمانی فیلەکانە."

پۆپەبەرز پۆپە بەشکۆکانی هەڵمساند و دووپاتی کردەوە:

"زمانی فیلەکانە."

"لەمەوبەدوا ئێوەش بە زمانی مەلان قسە ناکەن. زمانی مەلانم لە نەتەوەی پەپوو قەدەغە کرد. هەر کەسێ بە زمانی مەلان بئاخفێ، هەردوو باڵ و زمانی لە بنەوە هەڵدەقەنرێ. هیچ مەلێک، لەمەودوا بە زمانی مەلان ناپەیڤێ، دەبێ بە زمانی فیلەکان بدوێن."

"بەڵێ سوڵتانم، ئێستە بەرەو ئەو دارستانە دەفڕم وا پێت بەخشیوین، بە ڕەعیەتی پەپوان دەڵێم خێرا خۆیان فێری زمانی فیل بکەن."

"دەی، خێرا بڕۆ و وەرەوە."

سەرکردەی پەپووەکان کە گەیشتە دارستان چ ببینێ، گشت مەلەکانی دارستان، تەنانەت چۆلەکەکانیش، دەمێک بوو دەستیان بە فێربوونی زمانی فیلەکان کردبوو و هەژدەر قسەیان دەکرد:

"بیستمان، فەرموودەی سوڵتانمان بیست. ئاخر زمانی مەلەکانیش بوو بە زمان...؟ دیارە زمانی مەلەکان زمانێکی قەبە، ناخۆش و بێکەڵک بوو. لە کاتێکدا گشت دونیا بە زمانی فیلەکان قسەیان دەکرد، ئێمە پێداگریمان لەسەر ئەم زمانە ناخۆشەی مەلەکان دەکرد. لە ماوەی چەند مانگێکدا، پێش مێروولەکان، پێش بوونەوەرەکانی

دی و مرۆڤەکان، فێری زمانی فیلەکان دەبین. سەد و شەست مامۆستای زمانی فیلمان دۆزیوەتەوە، لە بەیانییەوە تا ئێوارە، لە شامەوە تا سەحەر فێری زمانی فیل دەبین."

سەرکردەی پەپووەکان هاواری لێ بەرز بووەوە:

"بژی پەپووەکان! سولّتانی فیلەکان شانازیتان پێوە دەکا."

پەپووەکان گوتیان:

"دیارە ئێمە لە وەچەی فیلین. فێربوونی زمانی فیلەکان بۆ ئێمە قەت ئەستەم نابێ. لە کاتێکدا هەموو دونیا بە زمانی فیلەکان دەدوێ، دواکەوتن لە کاروانی شارستانییەت شایانی ئێمە نییە. فیلەکان بە هۆی ئەوەی زمانی فیلیان دەزانی، چوونە سەر مانگ. کەچی ئێمە، تەنانەت ناتوانین لەم دارستانەوە تا دەریا بفڕین، بەس لەبەر ئەوەی زمانی فیلەکان نازانین."

"زمانی فیلەکان فێر دەبین و بۆ سەر مانگ دەفڕین، لەسەر لقەکانی مانگ دەنیشینەوە، ڕێک وەک فیلەکان."

دارستان نالاندی:

"وەک فیلەکان."

"مێروولەکانیش زمانی فیلەکان فێر دەبن، دەچنە سەر مانگ، لەوێ کۆشک بۆ پاشای مانگ ساز دەکەن، عەمبارەکانی پاشای مانگ بە هەنگوین دەئاخنن..."

دارستان نالاندی:

"مێروولەکانیش."

"بۆ سەر خۆر دەفڕین."
دارستان نالاندی:
"بۆ سەر خۆر."
"مێرووولەکانیش..."
دارستان دەنگی دایەوە:
"مێرووولەکانیش."
سەرکردەی پەپووەکان بێدەنگ بوو، پاشان لە خۆشیان هەمدیس هاتەوە گۆ:
"بەرامبەر بەم تێگەیشتن و هۆشەتان سوڵتانی فیلەکان سێ عەمباری تری پڕ لە کوللەمان پێ دەدا، سوڵتانمان بەشێکی زۆر لە مێرووولەکانی بۆ کۆکردنەوەی کوللە ڕاسپاردووە، بەس بۆ ئێوە."
دارستان سەدای دایەوە:
"هەر بژی سوڵتانی باوک، سوڵتانی وەلینیعمەت."
"پێشنیارێکم بۆ ئێوە هەیە."
"پێشنیارەکەت لەسەر سەرمان..."
"ئێستا هەموو تێکڕا هەستن، هاوڕێ لەگەڵ مامۆستای زمانی فیلەکان، بەرەو مەملەکەتی مێرووولەکان بفڕن، ئێوە و مێرووولەکان، زمانی مێرووولە و زمانی مەلەکان دەسبەجێ لە بیر دەکەن و فێری زمانی فیلەکان دەبن."
دارستان بە دەنگی "ئەڵلا" سەراوژوور بوو. هەرچی پەپووە وە حەوا کەوت، ئاسمان لەپڕێکا نارنجی هەڵگەڕا. شەقەی باڵەکان ئاسمانی هەژاند. ئەوسا پەپووەکان بەرەو وڵاتی مێرووولەکان هەڵفڕین. بە هۆی

ئەوەی زمـانی ناخۆشـی مێروولە و مەلەکانیـان لە بیـر دەکرد، زمـانی ڕەسـەن و فەرامۆشـکراوی فیلەکـان فێـر دەبوون و زمانەکەیان فێر دەکرد، نوقمی شادی بوون.
پـۆپەبەرز کە مەسـتی سـەرکەوتن بـوو و لە خۆشـیان سـەری لە گێـژەوە دەهـات، بە پەلەپـڕوزێ بەرەو سـوڵتانی فیلەکـان فڕی، کە گەیشـتە جێ، ڕووداوەکـانی یەک بە یەک بۆ گێڕایەوە، سـوڵتانیش بـێ ئەوەی گـوێ بەو قەڵافەت مەزن و بەقەد چیا زەبەلاحەی بدا، لە جێی خۆی دەرپەڕی، لەسەر پێیەکـانی پاشـووی قیت بـووە و قۆرتمەکەی بـۆ حەوا بەرز کـردەوە، گوێچکەکـانی لێـک کردەوە و بە قریوەقریو دەستی کرد بە هەڵپەڕین.
پۆپەبەرز:
"هەر بمێنی سولتانی خۆمان".
وای گـــــوت و هەر وا کە بە دەوری ســـــــەریدا دەسووڕایەوە، هێلێکی نـارنجیی درەوشـاوەی کێشـایەوە و دەستی بە سووڕانەوە کرد.
"هەر بمێنـی، هەر بمێنـێ، زۆر بمێنـی سـوڵتانی مە، هەر بمێنی، هەر بمێنی..."
ســـوڵتان پـــاش ئەوەی مـــاوەیەکی زۆر قنگـــی بـــادا و هەڵـپەڕی، گەڕایەوە و لەســـەر کورســـییەکەی دانیشـــت. کورسـییەکەی گاشـەبەردێکی مۆری ناڕێـک بـوو. بـۆیە لەسەری ئاسوودە نەبوو.
پۆپەبەرز لە ڕووی دڵسۆزییەوە گوتی:
"کورسییەکی ئاوا شایانی سوڵتانی دونیا نییە."

سوڵتانی فیلەکان قۆرتمەکەی لوول دا و گوتی:
"نەخێر، شایانی نییە."
"هەر ئێستا فەرمان بە مێروولەکان دەدەم، بۆ قووڵایی زەوی ڕۆ بچن، لەوێ کانە ئەڵماسەکان بدۆزنەوە، لە گەورەترین ئەڵماسی شین کورسییەک بۆ سوڵتانی خۆمان داتاشن، کورسییەکەی سوڵتانمان بە جۆرێک بێ لە دونیادا وەک خۆر بگەشێتەوە. لە هەر گەشانەوەیەکیشدا تیریژی شین بە دونیادا بڕشێنێ. دونیا بە ڕەنگی شین بدرەوشێتەوە."
سوڵتان بێسەبرانە هاتە گۆ:
"هەر ئێستا فەرمان بە مێرووەکان بدە. هەر ئێستا، هەر ئێستا، خێرا."
ئەوسا پۆپەبەرز فڕی و خۆی گەیاندە ولاتی مێروولەکان. یەکسەر دەستەی بەڕێوەبەرایەتیی مێروولەکانی کۆکردەوە و فەرمانەکەی ڕاگەیاند. مێروولەکان بۆڵەبۆڵیان لێوە هات: "ئاخر چۆن بە قووڵایی دونیادا ڕۆبچین و ئەڵماسی شین بدۆزینەوە کە درەوشاوەتر بێ لە خۆر و کورسیی لێ داتاشین؟"
سەرکردەی پەپووەکان تەنانەت گوێ لە بۆڵەبۆڵی ئەوان نەبوو، گەڕایەوە بۆ لای سوڵتان. بە هەناسەبڕکێ گوتی:
"پێم گوتن. پێش کۆشکەکە کورسییەکە ساز دەکرێ. قەت دەشێ ئیمپراتۆرێکی ئاوا بێ تەخت بێ؟"
سوڵتان گوتی:

"نابێ. با پەیکەرەکەشم دابتاشن مێروولەکان، پەیکەرەکە دەبێ کتومت وەک خۆم بێ."
پۆپەبەرز پرسیی:
"هەر ئێستا بچمە لای مێروولەکان؟"
سوڵتان گوتی:
"ڕاوەستە. هەموو پێکەوە نابێ. با جاری نیوەڕاستی دونیا بدۆزنەوە و کورسییەکی شینی بریقەدار دابتاشن. نابێ چاوترسێن بکرێن."
سەرکردەی پەپووەکان گوتی:
"وایە."
"ئەی زمان چۆن دەڕواتە پێش لە وڵاتی مێروولەکان؟"
پۆپەبەرز گوتی:
"بینیم. بینیم، سەرجەم مێروولەکان و ئەوانەی ئێمەش، لە ڕێوبان، لە شاخوداخ، لەسەر کار، لەسەر جێ، لە ماڵێ، بێوچان فێری زمانی فیلەکان دەبوون و زمانی خۆیان واتە زمانە بەدەوییەکەیان فەرامۆش دەکرد."
سوڵتان گوتی:
"ئەوە چاکترین شتە. پەپووی برام، تۆ ڕاوێژکارێکی پایەبەرزی. هەموو فیلەکانیش دەخەمە ژێر ئەمر و فەرمانی تۆوە. ئەوان، فیلەکانی ڕەعیەتم ئێستا چ دەکەن؟"
"هەموویان خزاونەتە دارستانە مەزنەکەوە، هەر کامە و پاڵی بە دارێکەوە داوە و خۆی دەخورێنێ. مێروولەکانیش بێ ڕاوەستان خواردەمەنییان بۆ دەبەن

و دەیانخەنە بەر دەمیان. فیلەکانیش بەس قورتمەکانیان درێـژ دەکەنەوە، بەس ئەوەنـدە، هەروەهـا بە خورانـدن مەسـت دەبـن و لەسـەرخۆ دەچـن. ژیـانی بەهەشـت دەژین."

سوڵتان گوتی:

"تەنیا من کار دەکەم و تۆ. ڕاگرتنی ئەم مێروولانە بەم جۆرە تا قیامەت ئەستەمە... لانیکەم لەبری ئەوەی بخۆن و بنـوون و قـون بـادەن، بـا بە دونیـادا بـڵاو ببـنەوە و زمـانی فیـل فێـری سـەرجەم بوونەوەرەکـان بـکەن. بـا لانـیکەم بەکەڵکـی ئەمە بـێن، هەروەهـا بـا کۆمەڵێـک مەشـــخەڵ دابهێـنن بـۆ ئەوەی مێرووڵەکـان بەردەوام سەرقاڵ بکا و هێزی بیرکردنەوەیان لە چنگ دەربێنێ. مێرووڵەکـان بە کـۆیلەیی ڕابێـنن... فیلەکـان ژیـرن، لە دونیـــادا ژیرتـــرین بـــوونەوەر فـــیلە. دەبـــێ هەنـدێک مەشغەڵیان بۆ بدۆزینەوە بە جۆرێک هیچ مێرووڵەیەک نەتـــوانێ چـــاو بتـرووکێنـــێ، بـــۆ ســـاتێک نەتـــوانێ بیـــر بکـاتەوە. مێرووڵەکـان ئەگەر هەلـی بیرکردنەوەیـان بـۆ بڕەخسێ، زوو یان درەنگ ڕێگەیەک بۆ قوتـاربوون لەم سیسـتەمی ئـازادییە دەدۆزنەوە. لەم دونیـایەدا هەمـوو شـتێک بـۆ فیکـر و بیـر بێسـنوورە. فیکـر دەبێـتە هـۆی ئەوەی تەنـانەت مێـرووڵە ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕێـگەیەک بدۆزێتەوە و بەسـەر فیلدا سـەربکەوێ. بۆیە ئێمە ڕێگە نادەین بچووکترین بیـر ختووکەی مێشکی مێرووڵەکان بدا. بۆ ئەوەی ئیزنیشیان پێ نەدەین، دەبێ مێشکمان

بخەیــنە گەڕ، گشــت فیلەکــان و پەپووەکــان، مێــرووە زەردەکـان، یـانی سـەرجەم داگیـرکەران، نەخێـر نەخێـر ڕزگـارکەران، داهێنـانی نـوێ بـدۆزینەوە تـاوەکو دونیـا دونیایە مێرووولە بیر نەکەنەوە، هەروەها من مردوو یان زینـدوو ئەو مێـرووە شــەلە ڕدێنســوورەم گەرەکە. کە وڵاتــی مێروولەکــان کــاول دەبــوو، ئەو نەبــوو قســەی لەگەڵ کردم؟ دەنگە تووڕەکەی کە سووکایەتیی بە من دەکرد، هەر وا لە گوێمدا دەزرینگێتەوە... خۆی بوو وا نییە؟"

"خۆی بوو."

"گوتبووت ئاسنگەرە وا نییە؟"

"لە ســــەردەمی حەزرەتــی داوود بەولاوە پشتاوپشـــت ئاسنگەر بوون."

"ئەمە خــراپە، ئاســنگەر هەم دەســتیان بە کــارە، هەم مێشــــکیان دەشــــوغڵێ. ئەمـــانە مەترســــیدارترین بــوونەوەرانی ســــەر ڕووی زەویــن. جــگە لەمە، بیــر و ڕامـانی ئەمـانە وەک میکرۆبی تەشـەناکەر هێندەی بڵێی یەک و دوو بە دونیادا بڵاو دەبێتەوە."

"مێـرووە شــەلەی ڕدێنســوور دەدۆزیـنەوە. ئەگەر مردبــێ مــردووەکەی دێنیــنە بەردەم ســولتانی خۆمــان. پاشــانیش مردووەکەی لە نێوەڕاستی وڵاتی مێروولەکان هەڵدەواسین. بـۆ ئەم کــارە مێـرووولە زەردەکــان کە مێروولەکــانی تــر بە چاوێکی سووک سەیریان دەکەن، پارمەتیمان دەدەن."

سوڵتان پرسیی:

"مەگەر تەنیا ئەوانەی سووکایەتییان پێ کراوە، ئەوانەی لاوازن، ئەوانەی بەتەماحن و ئەوانەی فریان بە مێروولایەتییەوە نەماوەتەوە، بتوانن خیانەت لە ڕەگەزی خۆیان بکەن. ئەم مێروولە زەردانە چۆن بوونەوەرێکن؟"
سەرکردەی پەپووەکان گوتی:
"خۆزیا دەتبینین سوڵتانی خۆمان. خۆزیا دەتبینین، هێند زەردن هێند زەردن، نەبێتەوە، ڕوون ڕوونن، مێروولەن، بەڵام قەت لە مێروولە ناچن. تا بڵێی تەوەزەلن..."
سوڵتان گوتی:
"تەوەزەل بن باشترە. پتر بەکەڵکی ئێمە دێن. لەپێناو لەتەگەنمێ، یان پارچە دەعبایەک دەبنە عەبد و کوێلەی ئێمە."
"ئەگەر کەسێک هەبێ شوێنپێی ڕدێنسوور هەڵبگرێ، مێروولە زەردەکانن و بەس."
"ئادەی بیانهێنە بۆ ئێرە بزانم."
سوڵتانەکان زوو شتیان بیر دەچێتەوە. سوڵتان لەمێژ بوو لە بیری چووبووەوە کە پۆپەبەرز مێروولە زەردەکانی لەگەڵ خۆیدا هێناوە. سەرەڕای ئەمەش، پۆپەبەرز فڕی، مێروولە زەردەکانی لەسەر تۆکلاشی دارەکە هەڵگرت و لەگەڵ خۆی هێنانی.
گەورە و سەرکردەی مێروولە زەردەکان و سوڵتان و پۆپەبەرز، سێ ڕۆژ و سێ شەو دانیشتن، تێروتەسەل قسەیان کرد و پێک هاتن، ڕێگەکانی کارپێکردن و

بەستنەوەی مێرووڵەکانیان بۆ هەتاهەتایە تاوتوێ کرد و دۆزییانەوە. ڕێگەی دیکەشیان پاشان دەدۆزییەوە. بۆ ئەم مەبەستە، سوپایەکی فیلەکان، سوپایەکی پەپووەکان و سوپایەکی مێرووڵە زەردەکانیان بۆ بیرکردنەوە بانگهێشت کرد. هەر فیلێک، هەر پەپوویەک، هەر مێرووڵەیەکی زەرد دەبوایە بیستوچوار سەعات لەسەر بیستوچوار سەعات بیریان بکردایەتەوە بۆ ئەوەی بەربەست بۆ بیرکردنەوەی مێرووڵەکان بنێنەوە.

سوڵتان گوتی:

"پرسی سەرەکی زمانە. ئەوەتان لەبیر نەچێ، پێش هەموو شتێ دەبێ زمانەکەیان فەرامۆش بکەن، لە مێرووڵەبوون دەربێن و بۆ بوونە فیل خۆ بە دەرودیواردا بدەن. پەیتاپەیتا لاسایی فیلەکان بکەنەوە. لە ناخی هەر مێرووڵەیەکدا پاشایەکی فیل بخەوێ. لەبری پەڕاندنی سەری مێرووڵەکان، باشتر وایە زمانیان ببڕدرێ. لە مەبەستم تێگەیشتن؟"

"تێگەیشتین سوڵتانی خۆمان."

"کەوایە مل وەبەر ئیش بنێن. سەرەتا ڕیشسوور... لە کوێ ڕیشسوورتان بینی، بۆ منی بێنن، مەیکوژن. پاشانیش بەدوای مێرووە شەلەی ڕدێنسووردا بگەڕێن، تێگەیشتن؟"

پۆپەبەرز و گەورەی مێرووڵە زەردەکان گوتیان:

"بەڵێ."

"بیرتان نەچێ دەبێ زمانەکەیان لە یاد بکەن."

گوتیان:

"ئەمە هەنگاوی یەکەمە. زۆری پێ ناچێ زمانەکەیان لە یاد دەکەن. بگرە لە ئێستاوە لە بیریان چووەتەوە."

"هەر کام لە مێروولە زەردەکان دەبێتە فەرمانـدەی یەکینەیەکی مێروولەکان. ئەمە فەرمانی منە. زەردەڵەکان سەربازی منن لەنێو مێروولەکاندا. سەرکردەی پەپووەکان، بڕۆ و ئەم فەرمانەی من لە وڵاتی مێروولەکان جاڕ بدە. نابێ تاقە مێروولەیەک مابێتەوە گوێی لەم فەرمانەی من نەبووبێ. بەگژداچوونەوەی هەر مێروولەیەکی زەرد، بەگژداچوونەوەی منە. ئەمەش بە مێروولەکان ڕابگەیەنە."

"فەرمانەکەت بان سەر سوڵتانی خۆمان."

سەرکردەی پەپووەکان مێروولە زەردەکانی لە کۆڵ کرد و بەرەو وڵاتی مێروولەکان کەوتنە ڕێ.

سولتانی فیلەکان بەسەر سەرکردەی پەپووەکاندا گوڕاندی و بە نەعرەتەی چیا و دەشت هەژان، ئەو مێروولانەی گوێشیان لە دەنگی بوو وەک مێوژۆکە هەڵلەرزین. سولتان دەیگوت:

"تەنانەت مێروولەیەک ناهێڵمەوە. ئەگەر ئەمساڵ کۆشکەکەم تەواو نەبێ، وەچەی مێروولەکان لەسەر ڕووی زەوی لە ڕیشە دەردێنم... وەچەیان، وەچەیان لە ڕیشە دەردێنم."

پۆپەبەرز بە دەوری سەریدا هەڵدەفڕی و دەیگوت:

"دەستم بە دامێنت سولتانی خۆمان. ئەمان سولتانی مە، دەتەوێ چ بکەی؟ مێروولەکان زۆر کار دەکەن، ئەمان سولتانمان."

"ئەگەر زۆر کار دەکەن، ئەی کوا کۆشک؟ چاو دەگێڕم، چاو دەگێڕم، نایبینم."

"ها بڕوانە، سوڵتانی خۆمان، بڕوانە چۆن لەسەر دوندی چیا دەدرەوشێتەوە... دیوارەکەیان بەقەد باڵای مرۆڤێک هەڵچنیوە."

سوڵتانی فیلەکان گوڕاندی:

"زیاتر، خێراتر. دەنگوباسی مەلیکەی مێرووڵەکان؟"

"مەلیکەی مێرووڵەکان، بێ وەستان مێرووڵەی دەبێ. هەموو ڕۆژێ بە ملیارد مێرووڵە بەشداری سازکردنی کۆشکەکە دەبن... زەوی، ئاسمان، شاخ، بەرد، دەریاکان، کانیاوەکان، زەلکاوەکان، دارستانەکان، هەموویان لە مێرووڵە جمەیان دێ. دونیا تەژی بووە لە مێرووڵە..."

"هەواڵێکی خۆشە، کەوایە ئەو هەموو مێرووڵەیەش بەس نییە بۆ ئەوەی کۆشکەکە زوو تەواو بێ، وا نییە؟"

سەرکردەی پەپووەکان وەڵامی دایەوە:

"کۆشکەکە تەواو دەبێ. ئەمساڵ تەواو دەبێ."

"ئەی کورسییەکەم؟"

پۆپەبەرز گوتی:

"دوێنێ مێرووڵە قەڵافەتسەیرەکە پێی گوتم مێرووڵەکان لە حەوت شوێنەوە دونیایان کون کردووە، لە حەوت لاوە بەرەو قووڵایی زەوی دەچنە پێش. زۆریان نەماوە بگەنە شاخی ئەڵماسی شین."

سوڵتانی فیلەکان لە جێی خۆی دەرپەڕی و گوتی:

"زۆریان نەماوە بگەنە شاخی ئەڵماسەکە؟"

پۆپەبەرز گوتی:

"چیی وایان نەماوە. چیی وایان نەماوە بگەنە شاخی ئەڵماسی شین، شاخی ئەڵماسی کەسک، مۆر، پەمەیی و نارنجی. لە نێوەڕاستی دونیادا شاخە ئەڵماسی ڕەنگاوڕەنگ و دڵڕفێن هەن. هێندە زۆرن لە ژمار نایەن، گەردەنکەش و بە بریقەن... هەر شاخێکی درەوشاوە، وەکو تیشکی خۆر، وەکو تیشکی بەستووی خۆر وایە سوڵتانی خۆمان، وەک تیشکی بەستووی خۆر، ئەویش ڕێک لە نێوجەرگەی زەویدا..."

سوڵتانی فیلەکان بە ترس و دڵەڕاوکێ و بە ئەسپایی گوتی:

"وست بە مەقوولێنە. وس بە پەپووی برام، وس‌س‌س! وەرە پێشێ، گوێت بە قۆرتمەکەمەوە بنێ با قسەیەکت پێ بڵێم، قسەیەکی نهێنی." سەرکردەی پەپووەکان گوێی بە قۆرتمی فیلەکەوە نا. "بڕوانە پۆپەبەرزم، قسەیەکی زۆر گرنگت پێ دەڵێم، گوێم لێ بگرە، ئاخۆ مرۆڤەکان ئاگایان لەم شاخە ئەڵماسانە هەیە؟"

پۆپەبەرز گوتی:

"ئەوەندەی من بزانم ئاگایان لێ نییە. هێشتا پێیان نەزانیوە."

سوڵتانی فیلەکان گوتی:

"ئەمان ها! ئەمان ها، با ئەوان پێ نەزانن، با نەبینن، با نەبیسن! هەر ئەوەندە بە گوێیان بکا، ماڵوێران دەبین ها! ماڵوێران دەبین."

پۆپەبەرز قسەکەی پشتڕاست کردەوە:

"ماڵویران دەبین."
"لەپێناو ئەڵماسەکاندا سەرلەبەری دونیا دەتەقێننەوە."
"دەیتەقێننەوە سوڵتانی من."
"بە مێروولەکان بێژە، با مرۆڤەکان گوێیان لێ نەبێ، با بە شوێنی شاخە ئەڵماسەکان نەزانن."
"پێ نازانن سوڵتانم."
"ئەڵماسەکان تەنیا هیی منن پۆپەبەرزی برام، تەنیا هیی منن. هیی منی سوڵتانی فیلەکان."
"ئەو ئەڵماسانە بەس لە تۆ جوانن سوڵتانی ئێمە، سوڵتانی مەزنی پەپووەکان."
"هەڵۆکانیش با نەبیسن."
"پێیان ئێژم سوڵتانم."
"تەنانەت ئەو نەهەنگانەش وا ئاو بۆ حەوا دەپرژێنن..."
"گوێیان لێ نابێ سوڵتانم."
"سیسارکەکان بوونەوەرگەلی سەیرن، بەو گەردنە زل و خەمبارەیان..."
"ئەوان ئەڵماسیان نە گەرەکە."
"ئەسپەکانیشت بیر نەچێ."
پۆپەبەرز گوتی:
"ئەسپەکان لێیان دێتەوە. ئەو مەخلووقە جوانانە..."
"چ لێیان بێتەوە و چ نا... نابێ ئەوانیش بە هەواڵی شاخە ئەڵماسەکان بزانن."
پۆپەبەرز ملی شۆڕ کردەوە و گوتی:
"پێ نازانن."

"پڵینگەکان بەڵای ئەم دونیایەن، هۆڤن، چاو بە گرفەن، شێتن، ئەگەر بێت و گوێیان لێ بێ، بە ددانەکانیان هێندە ئەرز هەڵدەکۆڵن تا دەگەنە شاخە ئەڵماسەکان..."

"دەگەنێ سوڵتانی ئێمە، بەڵام قەت بە گوێیان ڕاناگا."

"مارەکان، شەهێنەکان، ماسییەکان، سەرمازەڵەکان، مێشوولەکان، چۆلەکەکان و مامووتەکانیش نابێ پێ بزانن."

"مامووت نەماون سوڵتانی خۆمان، ئەوان باب و کاڵی ئێمە بوون."

سوڵتانی فیلەکان گوتی:

"حەیفێ مردن. باب و باپیری بەشکۆمان. بەڕاستی مخابن. جیکجیکەکانیش نابێ پێ بزانن..."

پۆپەبەرز گوتی:

"با ئەو گەوجانە پێ نەزانن..."

سوڵتان گوتی:

"تووتی هەر نابێ فڕیان بەسەر ئەم ئیشەوە بێ. ئەوان تا بڵێی لووتبەرزن."

سەرکردەی پەپووەکان گوتی:

"ڕەنگاوڕەنگن. خۆنوێنن. لاساکەرەوەن."

سوڵتان گوتی:

"لاساکەرەوەم خۆش ناوێن. با لاساکەرەوە نەمێنن."

پۆپەبەرز گوتی:

"چۆنە کۆشکەکە لەم ئەڵماسانە ساز بکەین. شایانی سوڵتانی خۆمانە."

سوڵتان پێکەنی و گوتی:
"شایانە، بەڵام مێروولەکان بە چەند ساڵ کۆشکی ئەڵماسیان بۆ ساز دەبێ؟"
پۆپەبەرز گوتی:
"زۆری پێ دەچێ."
سوڵتان گوتی:
"ئێستا با لە بلوور بێ. بلووریش وەک ئەڵماس وایە."
پەپوو گوتی:
"کۆشکی سوڵتان سولەیمان لە مس بوو. هەر ئەو سوڵتان سولەیمانەی بنی ئیسرائیلی... "
سوڵتان بە فیزەوە گوتی:
"بیستوومە. بیستوومە."
پۆپەبەرز گوتی:
"کۆشکی بەلقیس بە ئاڵتوون ساز کرابوو. من خۆم بینیومە. لەسەر ترۆپکی چیایەک بوو. سولەیمان ئاشقی وی نەبوو، ئاشقی کۆشکەکە بوو."
سوڵتان گوتی:
"کۆشکی من بە ئاڵتوون، زمڕووت، یاقووت، ئەڵماس، برلیان و بلوور دروست دەکرێ."
"بەلقیس زۆر شۆخ بوو، ئەسمەر بوو، پێستی نەرم بوو، چاوەکانی درشت و ڕەش بوون. باڵابەرز بوو. بەلقیس ئاشقی ئەو سولەیمانە قوڵەیە بوو. سولەیمان پرچی لوول بوو."
کە ئەوان بەم جۆرە بە گفتوگۆوە مژوڵ بوون، بایەک هەڵیکرد و لەملاوە بۆ ئەولا جێگۆڕکێی بە ئەستێرەکان

کرد. له ئاسمان ئەستێرەکان تێکەڵوپێکەڵ بووبـوون و بازرەقەیان دەبەست. له ئاسمانی شیندا دەخووشین و دەکەوتن. له لێرەوار شۆقێکی کەسک فیچقەی دەکرد. پزیسکی شین له پانتایی شینەوە لەم سووچەی دونیاوە بۆ ئەو سووچەی تر بڵاو دەبوونەوە. دوورتر، خاکی نەرم و بڵاو، هەراو، جوان، بەپیت و ناسک، وەک ژنێکی دووگیان، لەبەر چاوان ڕاخرابوو.
ئەولاتر، دارچنارێکی بڵند هات، له دامێنی چیا، له کن بەردەڵان دانیشت، گەڵاکانی خشپەخشپیان لێوە هات. شۆقی کارەبای شارە گەورەکان داگیرسا و کوژایەوە، غەڵبەغەڵبێک ئەو ناوەی داگرت. دەنگی هۆشیارکەرەوە یەکـــدا بەدوای یەک بەرز بـــووەوە. ئەســـتێرەیەک ڕاخووشـــی و هـــات له بەردەم ســـوڵتان و پـــۆپەبەرز نیشتەوە. سوڵتان چاوەکانی مۆڵەق مان، قەدەرێک چاوەکانی هیچ شتێکیان نەبینی. ڕووبارێکی گەورە هات و بەسەر ئەستێرەکەدا تێپەڕ بوو. شوێنی ئەستێرەکە بـــوو بە مێرگـــوزارێکی بەریـــن. داری بـــادام لەســـەر مێرگوزارەکە ڕوان و سەرتاپا نوقمی شکۆفە بوون. گوڵ له ئەستێرە، شین له ئاسمان، شینی ئاسمانی له سپیی کۆترین، سوور له مار هاتەوە. سوڵتانی فیلەکان قۆرتمەکەی درێژ کردەوە، بۆنی هەڵمژی و گوتی:
"لەم دونیایەدا هیچ کورسییەک نابێ له کورسییەکەی مـن بچـێ. کورسییەکیشم دەوێ بۆ ئەو ئەستێرەیەی تاوێک لەوەوپێش هاتە ئێرە."

"بە مێروولەکانی ڕەعیەتت دەڵێم سوڵتانی خۆمان..."
"بە مێروولەکانی ڕەعیەتم بڵێ... هەر مەخلووقێک چاوی بە کورسییەکەم کەوت، دەبێ بە ئێرەیی و حەپەسان بدڕێ و بمرێ."
پۆپەبەرز گوتی:
"دەمرێ."
دونیا بۆنی نێرگزی لێ هات. چ بۆنێکی خۆش بوو.
سوڵتان قۆرتمە درێژەکەی ڕاداشت و بۆنی دونیای هەڵمشت.
"لەم بۆنەشم گەرەکە پۆپەبەرز..."
"کۆشک بێ باخچە نابێ..."
سوڵتان لە ناخی دڵەوە پێکەنی و گوتی:
"نابێ."
"تۆ لە هەموو بوونەوەرەکان گەورەتری، سوڵتانی گشت خولقاوانی، لە هەموویان بەشکۆتر دەبی، خاوەن کۆشک، کورسی و هاوڕێیانی خۆت دەبی..."
سوڵتان گوڕاندی:
"بژی مێروولە. من باش بەو مێروولانەم ڕادەگەم، خواردەمەنییان پێ دەدەم. ئەوان..."
پۆپەبەرز گوتی:
"وسسسس، وسسسس سوڵتانم!"
سوڵتان بێدەنگ بوو. لەگەڵ بێدەنگبوونیدا، پۆپەبەرز لە پرمەی گریانی دا. هەم دەگریا و هەم دەکڕووزایەوە:
"ئەی من چی بکەم، من چی بکەم، من، من، من."

"بێدەنگ، مەگری برام، وس‌س!"
پۆپەبەرز هەر وا دەگریا.
"مەگری، خۆراکێکی زۆرت پێ دەدەم."
"ئەستێرەکان وەکو باران بارین، دەگریم."
"هێلانەیەکت لە ئەڵماس، لە یاقووت، لە برلیان و یەشم
بۆ بەدروستکردن دەدەم. بەسە مەگری، وس‌س‌س!"
"ئەو لقانەی لەسەریان دەنیشم، دەڕزێن سوڵتانم."
"با بڕزێن، وس‌س‌س‌س!"
"ئەو ئاوانەی دەیانخۆمەوە وشک دەبن."
"با وشک بن، وس‌س‌س‌س!"
"ئەو دەعبایانەی دەیانخۆم، دەمرن."
"با بمرن، وس‌س‌س‌س!"
"ئەرز، دەریا، ئاوەکان بەگشتی، خاکەکان ژاراوی دەبن،
من چ بکەم؟"
سوڵتانی فیلەکانیش کوڵی گریانی هەستا:
"ژاراوی دەبن، ژاراوی."
"بڕوانە سوڵتانم، دارەکان، لێڕەوارەکان، چیمەنەکان،
ئاوەکان، تاشەبەردەکان بەرەو دەریا مل پێوە دەنێن."
"ئێ، با مل پێوە نێن."
"تاریکان بەرەو دەریا دەخوشێ سوڵتانی خۆمان."
"بلا بخوشێ."
"شۆقەکان تک تک دەتکێن..."
"با بتکێن..."
"ئەسپێک لەودیو دەریا دەحیلێنێ سوڵتانم."

"ئەسپی خۆمانە."
"ئاسكێک بازی دا."
"ئەوە ئاسكی خۆمانە."
"دونیا پڕ بووە لە مێروولە، ئەرز و ئاسمان بە مێروولە داپۆشراوە."
"مێروولەكان هیی خۆمانن."
لەپڕێكـــا ســـوڵتان وەک ئەوەی لە خەو ڕاچەنیبـــێ و هـــاتبێتەوە ســـەر خـــۆ، چاوەكـــانی هەڵگلـــۆفی و لە پۆپەبەرزی پرسی:
"چمان بەسەر هاتووە؟"
"ئەســـتێرەكان بەســـەرماندا پەرشـــوبڵاو بـــوونەوە، ئاســـكەكان، ئەســـپەكان، هەورەكـــان، درەختەكـــان و گوڵەكان بڵاوبوونەوە سوڵتانم. ئەڵماسەكان، برلیانەكان، یـــاقووتە ســـوورەكان و تیشـــكەكان تەخشانوپەخشـــان بوون سوڵتانی خۆمان."
"بە مێروولەكـــان بڵـــێ كۆشـــكەكەم هەر ئێســـتە دەوێ. كورسییەكەمم هەر ئێستا دەوێ."
پۆپەبەرز گوتی:
"مـن، ئەی مـن، مـن چـم بەسـەر دێ؟ مـن... ئەمنـیش... ئەمنیش..."
سوڵتانی فیلەكان گوتی:
"لە بن گوێسوانەی كۆشكەكەم هێلانەكەت چێ دەكەی. پێیـــان بڵـــێ بـــۆ هەزار ســـاڵ خـــورد و خۆراكـــت بـــۆ كۆبكەنەوە."

پۆپەبەرز خۆی خستە بەر لاقەکانی و گوتی:
"بژی سوڵتانم."
"ئێستا کورسییە شینە لە ئەڵماس دروستکراوەکەمم دەوێ."
"بان سەرم سوڵتانم. ئەمساڵ کورسییە شینە ئەڵماسەکەشت دروست دەکرێ. دروست دەکرێ بەڵام..."
"بەڵام چی، بڵێ!"
پۆپەبەرز ئەم پرسیارەی بێ وەڵام هێشتەوە. ئەو بیری لە شتێکی تر دەکردەوە. فیکرەکەی بۆ سوڵتان ئاشکرا کرد:
"ڕێگە دەدەی منیش لەسەر کورسییە شینە لە ئەڵماس سازکراوەکە دابنیشم؟"
سوڵتان پاش قەدەرێکی زۆر فکرین وەڵامی دایەوە:
"ڕێگە دەدەم."
"دونیا بڕزێ، کورسییە شینە درەوشاوە ئەڵماسییەکەی تۆ نارزێ، وا نییە؟ ئەگەر لەسەری دانیشم..."
"نارزێ..."
"کەوایە گوێ بگرە سوڵتانم."
"گوێم لێتە، پەپووی ژیر، جوان و بەشکۆ، پۆپە نووری برام."
"جا ئێستا با پێت بڵێم... من بەو باڵانەم هێندە هێندە لەسەر ئەم زەوییە فڕیوم نەبێتەوە، لە کاتی

ڕۆژهەلاتەوە تـــا ڕۆژئـــاوابوون، لە بـــاکوورەوە لـــۆ باشوور، لە باشوورەوە لۆ باکوور."
"بەڵێ، چیت لە بن زاردایە بیڵێ."
"ئەم مێروولانەی وڵاتی مێرووولەکانی خۆمان هەیە..."
سوڵتان بەدەم باوێشکەوە گوتی:
"دەیجا."
"دەیجا ئەم مێرووە وردیلانە، یانی مێرووولەکانی وڵاتێک ناتوانن سەرجەم داخوازییەکانی ئێمە بێننە دی. هێزیـان پێی ناشکێ، چەندەش مەلیکەکانیان زاوزێ بکەن..."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"حەی حەی. کەوایە چ بکەین؟"
"لەم دونیایەدا وڵاتی تری مێرووولە زۆرن."
"نا! بەڕاست؟"
"وڵاتێک هەیە بست بە بستی دارستانە، دارستانی بێ سنوور و بێ کۆتایی. مێرووولەکانی ئەو وڵاتە درشت و بەخـۆوەن. ماســوولکەی مێرووولەکـانی ئەو وڵاتە زۆر بەهێـزە. تـا بڵێـی بەکەڵکـی ئـێمە دێـن. بەو وڵاتە دەڵـێن وڵاتی مێرووولە ڕەشەکان."
پاشـان سـەرکردەی پەپووەکـان چەنـد وڵاتـی مێـرووولان هەبوو هەموویانی یەک بە یەک بە سوڵتان ناسـاند. هەر کە ئەو وڵاتێکی مێرووولەکـانی دەهێنـایە زمـان، سـوڵتانی فیلەکـــان لە خۆشـــیان لە جێـــی خـــۆی دەردەپەڕی. پـــۆپەبەرز یەکە یەکە وڵاتـــی مێـــرووە ســـوورەکان، شـــینەکان، تورنجییەکـــان، کەســـکەکان، مۆرەکـــان و

مێرووله زەردەکانی ڕیز دەکرد، سولْتان له خۆشیان قۆرتمه درێژەکەی وەک دارتێل بەرەو ئاسمان تا هەورەکان بەرز دەکردەوە.

"چاکه، چاکه، دەبێ هەر ئێستا بۆ سەرجەم ولاتگەلی مێروولەکان سەفەر بکەم..."

پۆپەبەرز له خۆشیان هاواری لێ بەرزبووەوە:

"ڕاوەسته سولْتانم، ڕاوەسته. ئیستێک بگرە. کەمێک خوێنسارد بە."

سولْتان بە پێکەنینەوە گوتی:

"چۆن خوێنسارد بم؟ چۆن دەکرێ خوێنسارد بی له کاتێکدا بتەوێ سەرجەم ولاتانی مێروولەکان بخەیته ژێر ئەمر و فەرمانی خۆتەوە..."

"سەبرت هەبێ سولْتانم. تۆزێک گوێ بگرە تاکو یەک دوو قسەت پێ بلێم."

سولْتان کەیفخۆش بوو و گوتی:

"بێژە. تۆ چ بلێی ڕاسته. کۆشکێک و تەختێکیش بۆ تۆ بە سازکردن دەدەم."

"من تەخت و کۆشکم نه گەرەکه سولْتانم. حەز دەکەی..."

"بێژە، چیت بۆ بکەم؟"

"هێلانەیەکم بۆ چێ بکە کە..."

"هێلانەیەکت بۆ دروست دەکەم، لەسەر دارچنارێکی بەرز و شکۆدار... دارەکە، دارچنارێکی هێندە ئەفسووناوی بێ، کە مرۆڤەکان چەندەش دەرمانداوی

بکەن، چەندەش ئاوی پیسی پێ بدەن، هەمدیس وشک نەبێ. تەورەکانیش ئەم دارەیان پێ نابڕدرێ، ئاگرەکان پێیان ناسووتێنرێ."

پۆپەبەرز بە خۆشحاڵییەوە باڵەکانی پێکدا دا و گوتی:

"پێیان ناسووتێنرێ."

"ئێستا بێژە، دەتەوێ چیم پێ بڵێی؟"

"باش گوێم لێ بگرە سوڵتان. قەت پێویست ناکا بەم قەڵافەتە زل و زەبەلاحەوە ڕێی سەفەری وڵاتەیلی مێرووڵەکان بگریتە بەر."

"تۆ تەماشا، ئەی کەوایە چۆن ئەم هەموو وڵاتانە بخەمە ژێر ڕکێفی خۆمەوە؟ هیچ نەبێ ئەو مێرووڵانەی دەکەونە ژێر فەرمانی منەوە با من ببینن، وا نییە..."

پۆپەبەرز گوتی:

"هیچ پێویست ناکا."

"پێم بڵێ دەتەوێ چ بکەی، ئەی پەپوو؟"

"گوێم لێ بگرە سوڵتانم، من زۆر لە لای مرۆڤەکان ماومەتەوە. فرتوفێڵیان لێ فێر بووم ئەمما فرتوفێڵ."

"دەی؟"

"بە ئاغای خۆم بڵێم، من ئێستا پانزە بیستێک لەو مێرووڵانەی خۆمان سواری پشتم دەکەم و بەڕێ دەکەوم. مێرووڵە قەڵافەتسەیرەکانیش دەخەمە ناو، هەروەها ئەو مێرووڵانەی لاق و سمێڵ و کلکیان پچڕاوە یان سکیان هەڵدڕاوە... ئەم مێرووڵانە سواری پشتم دەکەم و بەرەو یەکەم وڵاتی مێرووڵەکان دەفڕم،

ئەم مێرووولە شەقوشڕانە لە پاتەختی وڵاتی مێرووولەکان دادەبەزێنم، گشت مێرووولەکانی پایتەخت لە مەیدانی کۆدەکەمەوە و دۆخی مێرووولەکانی خۆمانیان نیشان دەدەم. پاشان پێیان دەڵێم جا ئێستا باسی فیلەکان بۆ ئەم هاوڕێیانە بکەن. ئەمان بۆیان باس دەکەن چۆن وڵاتەکانیان لە بن پێی فیلەکاندا تەفروتوونا بوون و پان بوونەتەوە... ئەوسا، بە مێرووولەکانی پایتەخت دەڵێم بێنە ژێر فەرمانی ئێمە."
سوڵتان گوتی:
"ئەی ئەگەر ملیان نەدا؟"
پۆپەبەرز بە بڕواوە وەڵامی دایەوە:
"مل دەدەن؟"
سوڵتان دووپاتی کردەوە:
"ئەی ئەگەر ملیان نەدا؟"
پەپوو گوتی:
"ئەگەر ملیان نەدا، ئەگەر نەهاتنە ژێر فەرمانی ئێمەوە، هەر لەوێ فیلێکی گەنج دەبینمەوە. پێویست ناکا لێرەوە فیل ببردرێ بۆ ئەوێ. ئەو فیلە جحێڵە بەردەدەمە ئەو شارەوە..."
سوڵتان گوتی:
"بژی! ئەگەر مرۆڤەکان خاوەنی ئەم ئەقڵەی تۆ بوونایە، خۆیان و دونیایان بەمجۆرە وێران نەدەکرد."
پۆپەبەرز گوتی:
"سەلامەت بی سوڵتانم."

"دەی سەفەرت بەخێر. هەموو مێروولەکانی دونیا بێنە ژێر فەرمانی منەوە. با بتبینم بزانم چ دەکەی."
"بەم شکۆ و گەورەییەی نەتەوەی فیلت، زۆری پێ ناچێ، سەرجەم مێروولەکانی سەر ڕووی زەوی لەژێر فەرمانتدا دەبن."
"ئێستا تۆ ڕاستەوخۆ بڕۆ بۆ وڵاتی مێروولەکانی خۆمان، قسەکانمان یەک بە یەک بۆ ئەوان بگێڕەوە... جارێکی تر پێیان بڵێ زوو ئەم کۆشکەم دەوێ. ڕێگەت کراوە بێ."
"هەر هەبی سوڵتانم."
پۆپەبەرز فڕی و خۆی گەیاندە وڵاتی مێروولەکان، لەوێ هەرچی مێروولەی شەل و کوێر، پشتشکاو و سمێڵقرتاو و داماو هەبوو سواری پشتی کردن و ڕووەو وڵاتی مێروولە ڕەشەکان لە شەقەی باڵی دا. لەسەر ڕێگەکان، لە دەشت و لێڕەوارەکان گەلە فیلی دەبینین و سڵاوی سوڵتانی خاوەن شکۆی پێ دەگەیاندن.
ڕۆژێک، بەرەبەری نیوەڕۆ، سەرکردەی پەپووەکان گەیشتە وڵاتی مێرووە ڕەشەکان. ئەوانی لە مەیدانی شار کۆکردەوە، مێروولە شپرزەکانی سەر پشتی دابەزاند و نیشانی مێروولە ڕەشەکانی دان. مێروولە ڕەشەکان کە ئەم مێرووە بێ قاچوقۆڵ و سەقەتانەیان بینی، خەمێکی زۆر دایگرتن و گوتیان:

"وەیش، وەیش! وەیش، وەیش، کێ ئاوای لێ کردوون؟ وەیش، وەیش!"
پۆپەبەرز هەڵەکەی قواستەوە و بە مێرووڵە داماوەکانی گوت:
"جا بگێڕنەوە بزانم."
مێرووڵە لێقەوماوەکان بە وردەکارییەوە باسی ئەو ڕۆژە ڕەشەیان کرد کە پەلاماری وڵات و شارەکانیان درا. دەربارەی ئەو فیلانە قسەیان کرد کە هەر کامە و وەک چیایەکی ڕەش بەسەر شارەکانیاندا کەوتبوون، وەک لافاوی ڕق بەسەر زەوی وەربووبوون، بە نانەوەی هەر هەنگاوێک بە هەزاران مێرووڵە دەمردن و هێلانەکان خاموش و خاپوور دەبوون. ئەوان دەیانگێڕایەوە و مێرووڵە ڕەشەکان دەگریان، مێرووڵە ڕەشەکان دەگریان و ئەوان دەیانگێڕایەوە. دواجار، سەرکردەی پەپووەکان بەسەر مەیدانەکەدا فڕی و پاش ئەوەی حەوت جار دەوری مەیدانەکەی لێ دا، هاتە گۆ:
"ئێتر ئەمانەتان بینی، لە دەسپێکەوە تا کۆتاییش گوێتان بۆیان ڕاداشت. باش بۆتان دەرکەوت فیلەکان کێن."
بێدەنگ بوو و بۆ ئەوەی لە ئاپۆرای ئەو مێرووڵانەی لە خوارەوە تێک خزابوون، نزیک بێتەوە، باڵەکانی لێک ئاڵاند.
"ئێستا گوێم لێ بگرن، سوڵتانی فیلەکان سوپاکەی تەیار کردبوو و دەیویست پەلامارتان بدا. وڵاتی ئێوەش بە دەردی وڵاتی ئەم مێرووڵە لێقەوماوانە دەچوو. من

پێشم بەو سوڵتانە مەزن و خاوەن شکۆیە گرت و گوتم دەغیلە سوڵتانم دەست ڕاگرە. ئەو گوتی بۆچی دەست ڕاگرم پۆپەبەرزی برام؟ من بە سوڵتانم گوت دەست ڕاگرە، چونکە هەموو ئەو مێروولانەی لە دونیا دەژین، لەژێر فەرمانی تۆ دان، کەواتە بۆچی مێروولەکانی ژێر فەرمانی خۆت دەکوژی؟ سوڵتان بە خۆشحاڵییەوە گوتی ڕاستە، بۆچی مێروولەکانی ژێر فەرمانی خۆم بکوژم؟ من پێم گوت کەوایە من دەچمە وڵاتی مێروولە ڕەشەکان، فەرموودە بەرزەکانی تۆ بە مێروولە ڕەشەکان ڕادەگەیەنم تاکو ئەوانیش لە هیچ قسەیەکت دەرنەچن. ئێستا گوێم لێ بگرن و پاشان نەڵێن نەمانبیست و نەمانزانی، با فەرموودەکانی سوڵتانی گەورەی فیلەکانتان پێ ڕابگەیەنم."
سەرکردەی پەپووەکان، لە سەری ڕا، بە شێوەیەک کە هەموو شار گوێی لێ بێ، بە دەنگێکی بەگوڕ فەرمانی سوڵتانی فیلەکانی بە مێروولە ڕەشەکان ڕاگەیاند.
لە یەکەم جارداندا مێروولە ڕەشەکان سەرەدەریان لەم فەرمانە دەرنەکرد. پۆپەبەرز سەرلەنوێ فەرمانەکەی بۆ خوێندنەوە.
"تێگەیشتن؟"
هەمدیس مێروولەکان تەقەی سەریان هات.
سەرکردەی پەپووەکان بە پشوودرێژی و سەبر و حەوسەلەوە، جارێکی تر و جارێکی تر فەرمانەکەی خوێندەوە، تا ئێوارە سووڕایەوە و فەرمانەکەی

خوێندەوە، سووڕایەوە و فەرمانەکەی خوێندەوە، بەڵام مێروولەکان دیسان هیچ لە فەرمانەکە تێنەگەیشتن.

"تێگەیشتن سوڵتان چیی گەرەکە؟"

"تێنەگەیشتین."

"چـی هەیە لێـی تێـنەگەن، کۆشـکێک لە یـاقووت، کورسییەک لە ئەڵماسی پەمەیی بۆ سوڵتان چێ دەکەن و عەمبارەکانیشـی بۆ پڕ دەکەن لە خـواردەمەنی. ئەمە چیی هەیە لێی تێنەگەن؟"

مێروولەکان گوتیان:

"زۆر ئەسـتەمە. زۆر ئەسـتەمە. هـیچ لەم فەرمـانە تێناگەین."

پەپوو گوتی:

"ئەگەر وا بـێ زۆر باشـە. بەم زوانە وا تێـدەگەن نەبێتەوە..."

مێروولەکان تێکڕا هاواریان کرد:

"تێناگەین. ئێمە لە زمانی فیلەکان تێناگەین."

سـەرکردەی پەپووەکـان نیشـتەوە، بە تـووڕەییەوە ئەو مێروولە داماوانەی سواری پشتی کرد کە لە مەیدانەکە دابیەزاندبوون و بەرەو دارستانی تەنیشتیان لە شـەقەی بـاڵی دا. لەوێ ڕەوە فیلێـک مۆڵیـان خواردبـوو، قۆرتمەکانیان بەرەو حەوا بەرز کردبووەوە و چاوەڕێ بوون لە ئاسمانەوە شتێکی وەک فەرمانیان بۆ بێ.

پەپوو گوتی:

"چاوەڕوانیی منن؟"

فیلەکان گوتیان:
"چاوەڕوانی تۆ بووین. فەرمانت لە بان سەرمان."
"یاڵڵا، با هەر ئێستا بەرەو وڵاتی مێروولە ڕەشەکان بکەوینە ڕێ. نابێ لەو وڵاتە بەرد لەسەر بەرد و سەر لەسەر جەستە بمێنێتەوە."
فیلەکان بەرەو وڵاتی مێروولەکان کەوتنە ڕێ، زۆری نەخایاند گەیشتنە وڵاتی مێروولە ڕەشەکان و شەڕیان داگیرساند. لەوەتەی دونیا دونیایە، مێروولەکان هەرا و هەنگامەیەکی ئاوایان نەبینیبوو. ئەرز دەهەژا و درزی تێدەکەوت، ئاسمانەکان دەڕوخان و دەکەوتنە سەر ئەرزی. تەنانەت مەلەکان بەسەر وڵاتی مێروولەکاندا نەدەفڕین. کات تێپەڕی، دەمەوئێوارە کە ڕۆژ کۆتایی هات، بە ملیۆن مێروولە لە بن پێی زلی فیلەکاندا پان بووبوونەوە. ئەوانەی نەپەلچقیبوون، دەستەودامێنی پۆپەبەرز بووبوون تاکو داڵدەیان بدا. مێروولەکان گوتیان:
"باسی فەرمانی سوڵتان دەکەن، باسی فەرمانی سوڵتانی خاوەن شکۆی فیلەکان؟ ئێمە وشە بە وشە لێی تێگەیشتین. ئێمە هەر لە ئەزەلەوە زمانی فیل دەزانین. ئەوەی ڕاستی بێ، ڕەچەڵەکی ئێمە فیلە، فیلەکانیش لە ڕەچەڵەکی مێروولەن. بڕوامان کرد و ئیمانمان هێنا."
پۆپەبەرز گەلێ بەمە دڵخۆش بوو و یەکەم هەواڵی سەرکەوتنی بە سوڵتانی فیلەکان گەیاند.

"ئەم مێرووە ڕەشانە لە نەژادێکی هێند بەهێزن کە هەر کامە و بەقەد سەد مێروولە بەبڕستە."
سولّتانی فیلەکانیش دەستی کرد بە هەڵلا و چەقەنە و گوتی:
"ئەها، ئەوەتا، زۆر باشە... دەسبەجێ بەرەو ولاتانی دیکەش بفڕە و فەرمانی من بە مێروولە زەرد و کەسک و سوورەکانیش بگەیەنە. مێروولە عەجەمەکانیشت لە بیر نەچێ. هەموو ولاتانی مێروولە لە دونیادا، چ ئەوانەی دەیانناسین و چ ئەوانەی نایانناسین، هەر هەموویان بێنە ژێر فەرمانی من! لەم پێناوەدا سەرجەم فیلەکانی دونیا لەژێر ئەمری تۆ دان، گشت فیلەکان ئاگادار کراونەتەوە."
"هەر بمێنی سولّتانم."
"ئۆغر بەخێر و تیغت بە بڕشت بێ."
پۆپەبەرز ئەمجارە بەرەو ولاتی مێروولە تورەنجییەکان فڕی. ئەوانیشی بە ماوەیەکی کورت هێنایە ژێر فەرمانی سولّتان. پاشان مێروولە سوورەکان، کەسکەکان... سەرجەم ولاتەیلی مێروولەکانی لە ماوەیەکی کورتدا ملکەچی سولّتان کرد. نەخاسمە، لە ئاسیا، لە ئەفریقا، لە ولاتگەلی وا کە کەس نەیبیستبوون و نەیناسیبوون، ڕەچەڵەکی مێروولەی وای دۆزییەوە کە ئەم مێروولانە هێند لێزان و شارەزا بوون، سولّتان بە بیستنی ئەمانە چیی نەمابوو لە خۆشیان جەستە زەبەلاحەکەی باڵی لێ بڕوێ و وێڕای پەپووەکان لە شەقەی باڵ بدا...

مێروولەکـان بەرەو چیـا هەڵدەکشـان و زۆری نەمـابوو کۆشـکەکەی سـەر ترۆپکـی چیـای سـوڵتان کۆتـایی بێ. ڕێوبـــان، شـــاخوداخ و دارســـتان بە مێـــروولە ڕەش دەچووەوە... مێروولەکان لەبەر دوا تەقەلایان بەختەوەر بوون. چۆن بەختەوەر نەبن، ئەوان بوون بۆ یەکەم جار لەسـەر گـۆی زەوی کۆشـکیان بـۆ سـوڵتانی فیلەکـان، پـایەبەرزترینی پایەبەرزەکـان، بەشـکۆترینی بەشـکۆکان ساز دەکرد. چما کارێکی بچووکە؟ ماندوو بوون، لە پێ کەوتـن، لـێ قەیناکـا. بەم زوانە کە ئەم کۆشـکە جـوانە بلـوورینە تەواو بـوو، هەرچـی چێشـتوویانە لە بیریـان دەچێتەوە. کێ دەزانێ سـوڵتانی پـایەبەرزی فیلەکـان بە هۆی ئەم کۆشکەوە چەندە خۆشحاڵ دەبێ؟
ئەو مێـرووولانەیش وا نێوەڕاســتی زەوییــان لە حەوت شــوێنەوە کــون کردبــوو و گەیشــتبوونە زنارەکــانی ئەڵماسی شین، بەختەوەر بوون، ئاخر یەکەم مەخلووق

بوون ڕێک گەیشتبوونە نێوەڕاستی زەوی، ئەوان بوون لە نێوەڕاستی زەوی زنارەکانی ئەڵماسی شینی درەوشاوەیان دۆزیبووەوە کە چاو لەبەر بریقەیان هەڵنەدەهات، هەروەها ئەوان بوون بەو پارچانەی لە زنارەکانیان دەکردەوە کورسییەکی وا جوانیان بۆ سوڵتان دروست دەکرد کە دونیا بە خۆیەوە نەبینیوە و تەنانەت سوڵتانی مرۆڤەکان بە بینینی واقی وڕ دەمێنی.
باشە ئەم هەموو بەختەوەرییە بە نسیبی کام بوونەوەر بووە...
ئەو مێروولانەش بەختەوەر بوون کە یەکە یەکە، بە دەشت و لێڕەوار و چیا و باخچەکان، بە چوار قوڕنەی جیهاندا دەگەڕان و خواردەمەنییان بۆ فیلەکان، پەپووەکان و مێرووله زەردەکان کۆدەکردەوە، بێ ئەوەی خۆیان تۆسقاڵێک تام و بۆن بکەن. چما ئەوان نەبوون بست بە بستی هەموو شوێنەکانی جیهان دەگەڕان، شیلەی کولیلکەکان، دارە بەرزەکان، دەعبا و تووەکانیان دەمشت و عەمباری فیلەکانیان لیپاولیپ دەئاخنی؟ ڕەنگە ئەم بوونەوەرە عەزیمانە، ئەم خوداوەندە نوێیانەی مێروولەکان بەم هەڵسوکەوتانە شادومان بن و لە خۆشیان هەر مێروولەیەک بکەنە فیلێکی گەورە. هەڵبەت مێروولەکان ڕۆژێک پاداشی ئەو هەموو کارە تاقەتپڕووکێنەیان وەردەگرن.
عەمبارەکان پڕاوپڕ بوون لە گەنمی سووری تایبەت، گوڵەبەڕۆژە، گەنمەشامی، گوڵ، بەهێ، دەنکەهەنار،

شـیلەی گـوڵ، هەنگـوین، هەنجیـر و تـرێ. مێـرووڵە کۆکەرەوەکان، بە هەوڵ و تەقەلایەکی هێند بەرچاو بە دونیـــادا دەگەڕان و ئازووقەیـــان کـــۆدەکردەوە کە عەمبـاری فیلەکـان تەنیـا شـیری مریشـکی لـێ نەبـوو. ئەگەر ئەویـش هەبـوایە، بە هەر شـێوەیەک بـوایە، بـۆ عەمبارەکانیان دەگواستەوە. مێرووڵەکانی دونیا، لەسـەر سازکردنی کۆشک، داتاشینی کورسیی ئەڵمـاس شـین و کـۆکردنەوەی خـواردەمەنی پـێکەوە کێبڕکێیـان دەکـرد. خەم و دەردیشـیان ئەوە بـوو ببـنە مـایەی سـەرنجی سوڵتانی فیلەکان و سەرکردەی پەپووەکان. سـوڵتانی بە هەیبەتـی فیلەکـان، خوداوەنـدی نـوێی مێرووڵەکـان، قسەییشی لەگەڵ دەکردن. دەیگوت "چۆنن مێرووڵەکانی عەبـدم." یـان دەنـا پێـی دەگـوتن "چـۆنن مێـرووڵە عەبـدەکانی خۆشەویسـتم." دەیگـوت "ئەگەر بەم جـۆرە کار بکەن بەم زوانە هەر کامتـان دەبنە فیلێکی مەزن و ئێـوەش ئەو مێـرووڵە بچووکـانە بەڕێـوە دەبەن. ئەگەر حەزتـــان بەمەش نەبـــوو، دەخـــۆن و دەنـــوون و لە بەیـانییەوە تـا ئێوارە کەفەڵتـان بە نێوقەدی گەورەتـرین داردا دەخشێنن و خۆتان دەخورێنن. ئەم دونیایە دەبێتە بەهەشـت بـۆ ئێـوە. بەس تکـایەکم لێتـان هەیە، وەک فیلەکانی پێشوو نەبن. کە کەفەڵتان بە دارەکانـدا خشـاند، بێ ڕاوەستان خۆتان خوراند، تکایە پێکدا هەڵمەپڕژێن و شەڕ مەکەن. هەموو کەسێ، بوونەوەرەکـانی تـر کە ئەم دۆخە و ئەم بەگژیەکداچوونە ببیـنن، پێیـان وا دەبـێ لە

ولاتی فیله بەختەوەرەکان شتەکان خراو دەڕۆنە پێش.
لە کاتێکدا، ولاتی فیلەکان...

ئاااخ، ئەگەر مێروولەکان دەبوونە فیل، چما وەک ئەو فیلە بەدعەمەلانە بە شەڕ دەهاتن؟ لە بەهەشتی فیلەکاندا چەند جوان و بەئاکار دەژیان، ئاااخ، ئەگەر مێروولەکان دەبوونە فیل، ئاااخ... بۆ وەک فیلەکان ساڵ دەری دوازدە مانگی بێوچان کەفەڵیان لە دارەکان دەخشاند یان دەنووستن، ئەوان کاریان دەکرد، کار. با جاریّ ئەوان ببنە فیل، با ببنە فیل... ئەگەر وەک فیلەکان بەهێز دەبوون، ئەم دونیایە ئاوا دەبوو؟ ئەگەر مێروولەکان چەشنی فیل خورت و گەورە دەبوون، ئەم جیهانەیان لە نووکی پێوە تا تەوقی سەر دەگۆڕی، سەرجەم بوونەوەرەکانی دونیا، لە مرۆڤەوە بگرە تا ئەسپ، وشتر، زەرگەتە، گورگ، فیل، مۆری، ڕێوی، چەقەڵ، هەر هەموو بوونەوەرەکانیان دەکردە کۆیلە و یەخسیری خۆیان... بچووکترین بوونەوەرەکانی دونیا، تەنانەت کرمەسوورکە و پەپوولەکانیش کاریان بۆ ئەوان دەکرد. ئاااخ، ئەگەر مێروولەکان دەبوونە فیل، بۆ وەک ئەم فیلە گەمژانە دەبوون، ئاااخ! با ئەم سەرا و کورسییە ئەڵماس شینە تەواو بن، با خوا-سوڵتان پیّ بنێتە کۆشک و لەسەر کورسییەکەی دابنیشیّ، با لە ئێکسیری گیراوەی گوڵەکانی هەزار باخ بخواتەوە و بێتەوە سەر خۆ، با... جا ڕەنگە ئەوکات سوڵتانی

فیلەکـان حەز و شــەوقی بکەوێـتە دڵ و بەم شــەوقەوە مێرووە عەبدەکانی بکاتە فیل.
مێروولەکان پەیتاپەیتا بیریان لەم شتانە دەکردەوە و بە هەوڵ و تەقەلایەکی زیاترەوە ملیان وەبەر کار دەنا، بە ئەرزیدا ڕۆ دەچوون، لەتێکیان لە شاخە ئەڵماسەکان لـێ دەکردەوە و لەگەڵ خۆیـان دەیانهێنـا، تۆسقاڵیان لەسـەر تۆسقاڵ دادەنا و کۆشکی بلوورینیان بەرز دەکردەوە.
چیاکـان خۆیـان لە بەرامــبەر ئەم عەشــق و جـۆش و کۆششـە نەدەگرت. تـا چـاو هەتەر دەکا مێروولە بـوو. بوونەوەرەکـــانی دونیـــا، پەلەوەرەکـــان، گەنـــاوەر، جۆرجانەوەرەکانی تر، بە بینینی ئەو هەمـوو مێروولەیە کە بســت بە بســتی دونیایــان داپۆشــیبوو، واقیــان وڕ مابوو. مەلیکەکان بێ پسـانەوە مێروولەیـان بۆ فیلەکـان دەهێنــایە دونیـــا، وای لـــێ هــاتبوو، لەبەر زۆربــوونی مێـــروولە لە دونیـــادا جێـــت نەبـــوو بجـــووڵێیتەوە. مێروولەکـــانیش لەپێنـــاو تەواوکردنـــی کۆشـــکەکە و داتاشینی کورسییەکە پێکەوە لە کێبڕکێدا بـوون. دونیـای زل و زەبەلاحی مێروولەکان لە هەناسەبڕکێ دابوو.
سـپێدەی دابـوو و نەدابـوو، لە بـوولێڵی بەیانیدا، لەناکـاو لەســـەر دونـــدی شـــاخ تـــۆپەڵە ڕوونـــاکییەکی گەورە تەقییەوە و دەشت و چیا و چۆمەکانی ڕووناک کردەوە. لەسەر لوتکەی شاخەکەوە وەها لافاوێکی نوور بە خـوڕ شـۆڕ دەبـووەوە کە تەنـانەت بەنێـو خاکـدا ڕۆ دەچـوو، دزەی دەکـردە نێـو چەپەکتـرین شـوێنی دارسـتانەوە و

ڕەگ و پێستی درەختەکان و نێوکی بەردەکانی دادەپۆشی.
سەرانسەری دونیا مات و حەپەساو بەم نوورەوە لە خەو هەستا. مەخلووقەکان چاویان بڕیبووە ترۆپکی شاخەکە و بە جاری واقیان وڕ مابوو. فیلەکان، پەپووەکان، داڵەکان، شەهێنەکان، بازەکان، هەروەها هەڵۆ سوورەکان، گورگەکان، ڕێوییەکان، شێرەکان، پڵینگەکان، ئەسپەکان، کەرگەدەنەکان، چەقەڵەکان، ئاسکی چاو بە ڕەنگی کل، کەڵەکێوییەکان، خەزاڵ و پەزکێوی باکووری، وشترەکان، نەورەسەکان، ئاڵباترۆسەکان، گشت مەلانی وشکانی و ئاوی، مرۆڤ بە گەنج و پیرەوە، بە گەورە و گچکەوە، چاویان بڕیبووە ئەو شۆقەی لە بەرزایی چیاکانەوە دەهاتە خوار، ئەم شۆقە لە کوێوە دەهات و چۆن فیچەی دەکرد! جووڵەوەر پشتیان بریسکەی دەهات، پەپوولەکان لەژێر ئەم لافاوی نوورە پێستیان بە چەند ڕەنگ دەدرەوشایەوە، پەڕ و باڵیان وەک تیغی تیژ و بڕ، سوور، زەرد، کەسک، مۆر و تورەنجی دەینواند...
درەختەکان، ئاوەکان لەنێو ئەم شۆقەدا نوقم بووبوون، چرووسکەیان دەدا و تیشکیان دەهاویشت. لەناکاو، لەسەر لافاوی نوورەکە، سێلاوێکی شین، وەک هەورەتریشقە، تیژ چەشنی تیغ کڵپەی کرد و هاتە خوارێ، بە کۆمەڵێک هێڵی تیژ و پتەو...

پەلەوەرەکـان لە ئاسـمان، لەسـەر ئەو شـۆقە شـینە تیغئاسایەی دڕی بە بوولێڵی بەیانی دابوو، باڵ بە باڵ... بوونەوەرەکانی سـەر زەوییش، شانبەشـان، پاڵەپەستۆ، مات و حەیران... مرۆڤەکانیش وڕ و کاس بەرامبەر بەم ڕووداوانە...

سـولتانی فیلەکـان خەبەری بـووەوە، چاوەکـانی هەڵگڵۆفین، چاوی لە ئاسمان بڕی، ئاسـمان بە هـۆی پەپووەکـانەوە تـورەنجی دەینوانـد، نیگـای بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئاسمان وەرسووڕاند، ئەویش بە هۆی هەڵۆ سوورەکانەوە ڕەنگی ئاڵی بە خۆوە گرتبوو، سـەیری ڕۆژئـاوای ئاسـمانی کـرد، ئەویـش لە بەر تووتییەکـان، شـین شـین، سـەوز سـەوز، ئـاڵ ئـاڵ، زەرد زەرد، تورەنجی تورەنجی و مۆر وەک مۆری تووتیان بوو.

باشـوور، لە لایەن پەلەوەرە بچووکەکـانەوە دەسـتی بەسـەردا گیرابـوو، جموجـووڵی ڕەنگەکانیـان ئاسـمانی داپۆشـیبوو. پەیتاپەیتـا نـوور بەسـەر ئاسـکەکان، کەڵەکێوییەکان، ئەسپی قەرقاوڵئاسا و کەرگەدەنی یەک شـاخدا دەبـاری... دونیـا، عەرد، ئاسـمان و سـەرجەم بوونەوەرەکـان و گشـت ڕووەک و بەرد و ئـاو و خـاک نـوقمی نوورێـک ببـوون کە تـا ئەوکـات نەبینرابـوو. لە ئاسـمان، لەسـەر ئـاو و شـاخ و لێرەوارەکـان شـینێکی هەراو و نەرم، وەک هەورێـک دەجـووڵایەوە و بەنێـو لافاوی خرۆشاوی نووردا شۆڕ دەبووەوە. بە هێڵی تیژ و ببڕی تیغئاسا...

سوڵتانی فیلەکان یەکسەر سەرکردەی پەپووەکانی بانگ کرد:

"ئەوە چییە، چ باسە پۆپەبەرز؟ چ بەسەر ئەم دونیایە هاتووە برام، گشت بوونەوەرەکان بە ئاسمان و ئەرزەوە وەربوون، سەیری خوارێ بکە، تەنانەت ئەم گیانلەبەرە کەمتەرخەمانەش هەستاون و هاتوون، چ بووە، دۆخێکی نائاساییی لە گۆڕێیە؟"

سەرکردەی پەپووەکان کە لە خۆشیان زاری تا بناگوێی هەڵپچڕیبوو، گوتی:

"بەڵێ سوڵتانی خۆمان، دۆخەکە بە ڕادەیەک نائاساییە کە دونیا پێشتر دۆخێکی وەها نائاساییی بە خۆیەوە نەبینیوە... سەیری ئەوێ بکە."

"سەیری کوێ بکەم؟"

"ئەوێ، ئەوێ، ڕێک ترۆپکی ئەو شاخە بەرزە..."

"سەیرم کرد، چاوی لەبەر هەڵنایە."

"سەیری ئەو شۆقە شینە بکە، شین شینە."

سوڵتانی فیلەکان سەیری کرد و بینی. زۆری نەمابوو بەرامبەر بەو هەموو جوانییە، لە خۆشیان دڵی لە لێدان بکەوێ. پشتێنێکی شین شین چوار دەوری کۆشکە بلوورینەکەی گرتبووە خۆ کە بریقەبریقی دەهات.

"خێرا، مێروولەکانم بۆ بانگ بکە!"

هەر لەو کاتەدا پۆپەبەرز وێڕای هەقدە پەپووی تر پێکەوە فڕین و گەیشتنە شاری مێروولەکان و لە مەیدانەکە نیشتنەوە.

"پەلە بکەن، سوڵتانمان ئێوەی بانگ کردووە."
مێروولە ڕیشسپییەکان و مەلیکەی ماندوو کە ئەمساڵ بە ملیۆنان مێروولەی بووبوو و لە پەلوپۆ کەوتبوو، پێشوەخت خۆیان ئامادە کردبوو و چاوەڕوانیی وی بوون. سواری باڵی پەپوولەکان بوون و هاتنە بەردەم سوڵتانی فیلەکان.
سوڵتان هەستایە سەر پێ و بەرەو پیریان چوو:
"بەخێر بێن هاوڕێیانم. ئێوە برای خوڵقێنەر و ئافرێنەری منن. بۆ ڕێورەسمی کردنەوەی کۆشک چاوەڕوانیی هەمووتان و سەرجەم مێروولەکانی بەردەستم دەبم. ئێستا پەپوولەکان پێش ئەوەی لەسەر باڵەکانیان داتانبەزێنن، با بۆ ئەوێتان بەرن. بۆ ئەوانی تریش فەرمان دەردەکەم، گشت ئەو مێروولانەی زەحمەتیان کێشاوە، بەشداریی ڕێورەسمەکە دەبن."
مێروولە قەلافەتسەیرەکە:
"هەموو مێروولەکان لە دەوری کۆشک و کورسییەکە کۆبوونەتەوە. ئێمە لە شارەکان مابووینەوە و چاوەنواری فەرمانی سوڵتانمان بووین. ئەو مێروولانەی کۆشک و کورسییەکەیان دروست کردووە، لە دوێنێشەوێوە لەوێ ماونەتەوە و چاویان لەسەر ئەو کۆشکەی سازیان کردووە و ئەو کورسییەی دایانتاشیوە، هەڵنەبڕیوە، لەوێ بە جوانیی کۆشک و کورسی حەپەساون و لە جێی خۆیان نەبزووتوون."
"دەی کەوایە، زۆر باشە."

سوڵتانی فیلەکان وای گوت و لە خۆشیان دەتگوت باڵی لــێ ڕواوە، ئەو جەســـتە زل و زەبەلاحەی لە پەڕێکــی سووک دەچوو. ســەرجەم فیلەکانی کۆکردەوە و بەرەو کۆشــکەکەی ســـەر چیــا کەوتە ڕێ. لە بـــان ســـەری، پەپووەکـــان باڵیـــان وەبـــاڵی یەک دابـــوو و وەک پەڵەهەورێک دەهاتنە بەر چاو.
ســـەرجەم مێروولەکـــان، پەپووەکـــان، مەلەکـــانی تـــر، جووڵەوەرەکـــان، تەنـــانەت کرمەکـــانیش، گشـــت گیانلەبەرەکـان بەشـداری ئەم ڕێوڕەسـمە بووبـوون. بە تەنیا مرۆڤەکان لەم ناوەدا بەدی نەدەکران.
پۆپەبەرزی سەرکردەی پەپووەکان گوتی:
"ئامـان، ئامـان هـا، بـا هەواڵـی ڕێوڕەسـمی ئەمـڕۆ بە مرۆڤەکان ڕانەگەیەنین. دەبێ کارێک بکەین مرۆڤەکان بەم کۆشـک و کورسـی و ڕێوڕەسـمە نەزانـن. مـن زۆر بـاش مرۆڤەکـان دەناسـم. ئەوان سـلێمانێکیان هەبـوو، زمانی گشت بوونەوەرەکانی دەزانی، کەسێکی سیحرباز بوو. لەو ڕۆژەوە بەدوا ئێمە لەگەڵ مرۆڤەکاندا بووینەتە یەک. لەوەتەی مـن دەیانناسـم دەسـتیان بـۆ هـەر کارێـک بردبێ تێکیان داوە. بوونەوەرگەلی خۆپەرستن، کارێک بــکەن، هەزار جــار بە شـــانوباڵی خۆیانـــدا هەڵـــدەڵێن. لەوەش بتـــرازێ خۆیـــان بە کلیلـــی گەردوون دەزانـــن. هەموویان کەم تا کورتێ شێتن، هەروەهـا ئەم مرۆڤانە خـۆ وەک ئـێمە نـین، ئەوان فـانین. خۆشـیان دەزانـن دەمرن، مـردن لە کەلـلەی داون. لەبەر ئەمەش بە ڕقەوە

سەیری سروشت، سەیری خۆیان و ئەستێرەکان و هەموو شتێک دەکەن. سۆزیان نەماوە. خۆشەویستییان بیر چووەتەوە و گەرمای ژینیان ون کردووە. ئێستە گەر ئەم سەرا و تەختە ببینن، یان دەیسووتێنن، خاپوور و لەگەڵ خاک یەکسانی دەکەن یان دەنا دەستاودەست بە یەکتری دەفرۆشن. ئەم کۆشکە جوانەی تۆ، ئەم کورسییە بەشکۆیەت بۆ ئەوان بەس دەبێتە کەرەستەیەکی فرۆشتن... ئەوان بە دڵێکی پڕ تین و سۆز سەیری جوانییەک، ئەستێرەیەک، پەپوویەکی شۆخی مێ، قوویەک و ئاسکێک ناکەن."
سوڵتانی فیلەکانیش کە لە ترسان و لە تاسان چاوەکانی دەرپەڕیبوون، فەرمانی یەکلاکەرەوەی دا:
"مرۆڤەکان نابێ تەنانەت شوێنی کۆشکەکەم لە دونیادا بزانن، نابێ هەواڵی کورسییەکەمیان بە گوێ بگا. پەپووی جادووگەر بنێرە چاوی هەموو مرۆڤەکان ببەستێ. دەزانم، ئەمنیش دەزانم ئەم مەخلووقەی مرۆڤی ناوە، هەموو شتێک خراپ دەکا. خوا هیچ گیانلەبەرێک لەوان نەچوێنێ. خوا هیچ بوونەوەرێک وەک ئەوان بەرامبەر بە مردن شێت نەکا. دەزانم، کاری ئەوان هەر لە هاتنە دونیاوە تا ڕۆژی مەرگ، هەڵاتنە لەدەست خۆیان و مەرگ و ڕاستییەکان. لە ڕێگەی ئەم ڕاکردن و ترسەدا چییان تووش بێ، تێکی دەدەن..."
مەڕاسیمەکە دەستی پێ کرد. سوڵتانی فیلەکان چووە سەر تاشەبەردێکی بەردەم کۆشکەکە کە بە ئەندازەی

پێنج ئاپارتمـان گەورە بـوو. پێشـان قـۆرتمەکەی بەرەو حەوا بەرز کـردەوە، ئەوسـا خـۆی لەسـەر قاچەکـانی پاشـووی قیـت کـردەوە و لاقەکـانی پێشـەوەی بەرەو ئاسمان لێک کردەوە و قەدەرێک لەبەر خۆیەوە دوعـای کرد. کە لە دوعاخوێندن بووەوە، قۆرتمەکەی بەرەو ئەو گیـانلەبەرانە درێژ کـرد کە دەشـت و بنـاری چیاکانیـان تەنیبوو، ئینجـا هەمـدیس قۆرتمەکەی بەرەو حەوا بەرز کـردەوە، ئاسـمان بە پەلەوەر داپۆشـرابوو و تەنـانەت بەشێکی بچووکی نەدەبینرا.
ئەمرۆ، جەستەی سپی سپیی سوڵتانی فیلەکان، لەژێر ئەم لافاوی شۆقەدا، سپیتر لە جاران دەهاتە بەر چاو و سامی دەخستە دڵ. قسەکانی دەست پێ کرد:
"گیـانلەبەرە بەڕێـز و ئـازیز و پایەبەرزەکـان، براکـانم، بەوپەڕی دڵخۆشـییەوە ئێـوەم بـۆ ئەم ڕۆژە خـۆش و بەخـتەوەرەم بانگهێشـت کـردووە، بەخێـر بـێن. دەبیـنم گشـــت گیانلەبەرەکـــان، هەر هەموویـــان بە پیـــر بـانگەوازەکەمەوە هـاتوون، زۆر سـوپاس و هەر هەبـن... بەس مرۆڤـی لـێ نییە ئەم کۆبـوونەوەیە... هـیچ کامتـان چـاوەڕوانیی ئەوەتـان لە مـن نەبوو بانگهێشـتی ئێرەیـان بکەم، وا نییە؟"
سەرجەم گیانلەبەرەکان تێکڕا هاواریان کرد:
"چاوەڕێ نەبووین."
مرۆڤەکان بە بیسـتنی ئەم دەنـگە سـامناکە پێیـان وا بـوو گوێیان لە گرمەی هەور بووە.

"ئەگەر مرۆڤەکـــانیش وەک ئـــێمە، وەک ســـــەرجەم بوونەوەرەکانی تر بێئفادە بوونایە، هەر کامە و خۆی بە خودا نەزانبیا، پاشانیش ئەم خودایانە زراویان لە مـردن نەتۆقیبا و هـۆڤ نەبوونـایە، هۆکارێک لە گۆڕێ نەدەما ئەوانیش بۆ ئەم ڕۆژە بەختەوەرە بانگهێشت نەکەین."

گیانلەبەرەکانی تر هەموو یەک زار هاواریان کرد:

"هۆکارێک لە گۆڕێ نەدەما."

مرۆڤەکـــان پێیـــان وا بـــوو ئەمەش گـــرمەی هەورە و گوێیان پێی نەبزووت.

"مرۆڤەکـان زۆر ئاسـتی خۆیـان دابەزانـد، لە دونیـا و بوونەوەرەکانی تر دابڕان. ترسی مەرگ ئەوانی فەوتاند. بە هـۆی ئەم ترسـەوە سـەریان لە بەرد دەدەن. بەمەش، پتر ئەقڵیان لەدەست دەدەن. ئەو ڕۆژەی مرۆڤەکان ببنە مێرووله، ئەو ڕۆژەی وەک مێروولەکـان خـاکەڕا بـوون، ئەو ڕۆژەی یەکتریـان نەخـوارد، دەتـوانن خۆیـان ڕزگـار بکەن..."

گشت بوونەوەرەکان بە یەک دەنگ هاواریان کرد:

"خۆیان ڕزگار بکەن."

مرۆڤەکـان بە بیسـتنی ئەم هاتوهـاوارە هەمـدیس وایـان زانی گرمەی هەورە.

سـوڵتان فیلەکـان قـوڕگی خـاوێن کـردەوە و لەسـەری ڕۆیشت:

"بەڵـێ بـرا بەڕێزەکـانم. مرۆڤەکـان سـەیرن، لە مێرووله قەلافەتســـیرەکەش خراپتـــرن، چـــونکە یاســـاکانی ئەم

مرۆڤانە وێرانن. گوتوویانە یەک دەخوا، هەزار دەڕوانێ، ئەمەش وا دەکـــا قیـــامەت ڕوو بـــدا، بەڵام بە هـــیچ شـــێوەیەک ئەو قیـــامەتەی چـــاوەڕوانی دەکەن نـــایە. هەزاریـان کـار دەکەن و برسین، دە هەزار، سـەد هەزار کـار دەکەن و برسـین، یەکێکیـان، تەنیـا یەکێکیـان لە وشـکی دەخـوا، لە تەڕی بـۆی دەنـوا، تـا قوڕقـوڕۆچکە دەخـوات و دەخـوات و تێـر نـابێ. هەر چـاخە و فێڵێـک دێننە گۆڕێ، ئێستا هەمـوو کاروباریـان بووەتە ئەوەی شتێک بە پێنج بکڕن و بە دە بیفرۆشـن. خـاک دەکڕن و خاک دەفرۆشـن، درەخـت، ئـاو، مـرۆڤ، چییـان بێتە بەر دەسـت، دایکیـان، باوکیـان، منـداڵەکانیان، ژنەکانیـان، بە کـورتی لەم گەردوونەدا چاویـــان بە هەرچـــی بـــکەوێ، دەیکـڕن و دەیفرۆشـن. بەرد دەفرۆشـن بەرد، ئەسـتێرە، ئـاڵتوون، ئەڵمـاس، گـوڵ، دڵیـان و چاوەکانیـان دەکـڕن و دەفرۆشن... مرۆڤەکان بە جۆرێ تووشی پەتای کڕین و فرۆشـتن بـوون، لە وەسـف نـایە... لە گەردوون چییـان پێ شک بێ، دەیکڕن و دەیفرۆشن. بڕوام پێ بکەن بـرا گیانلەبەرەکـــــــانم، ئەم مرۆڤـــــــانە لەم مێـــــــروولە قەلافەتسـەیرەی خۆمـان سـەیرترن. ئەم پەتـای کـڕین و فرۆشـتنە دواجـار بەڵایەکیـان بەسـەر دێنـێ، لەوەدا قسـە نییە، هیـوادارم زیـانی بە ئێمەی بـوونەوەر نەگـا... ئەم پەتایە، ئەم کڕین و فرۆشتنی هەرچی شـتە، تـاکو ئێسـتا مەترسیدارترین پەتایە تووشی بوون. بە پێنج دەیکـڕم و بە دە دەیفرۆشــــم، ئــــاخرییەکەی بەڵایەک بەســــەر

مرۆڤەکان و دونیای ئێمە دێنێ. خوا ئێمە و دونیاکەمان لە ئاژاوەی مرۆڤەکان بپارێزێ."
گیانلەبەرەکان گوڕاندیان:
"ئامین."
مرۆڤەکان پێیان وا بوو ئەمەش هەر گرمەی هەورە.
سوڵتانی فیلەکان درێژەی بە قسەکانی دا:
"ئێستا با واز لە مرۆڤەکان بێنین. خوا خۆی غەزەبی لێ گرتوون. ئەوان ئەگەر بەم جۆرە بەردەوام بن، هیچ خێریکیان بۆ دونیا و بۆ گەردوون نابێ. جگە لە خراپە هیچی تریان لێ چاوەڕوان ناکرێ. ئێستە ڕووی قسەم لە ئێوەیە برا ڕەسەن و پایەبەرزەکانم. ئەم کۆشکەی مێروولەکانی بەندەم بۆ منیان دروست کردووە، هیچ بوونەوەرێک بۆ سوڵتانی خۆی دروست نەکردووە. مەگین تەنیا مێروولەکان کۆشکێکی وا بۆ سوڵتانەکەیان چێ بکەن. مرۆڤەکان کە ئەو هەمووە کۆشک، ئەهرام، باخی هەڵواسراو و مەزارگەیان بۆ سوڵتانەکانیان دروست کردووە، هیچ کامیان نەیانتوانیوە کۆشکێک هاوشێوەی ئەم کۆشکە ساز بکەن کە مێروولەکان بۆ من، سوڵتانی خۆتان، دروستیان کردووە. ئێستا جوانترین سەرا لە دونیادا سەرای سوڵتانی خۆتانە. لەوەتەی دونیا دونیایە، هیچ کەسێ هاوشێوەی ئەم کورسییە لە ئەڵماس داتاشراوەی دەیبینن بۆ هیچ سوڵتان و فیرعەونێک دروست نەکردووە. بەس مێروولەکانی برام دەتوانن دونیا کون بکەن و لە

نێوەڕاستی زەویـیەوە بەردی ئەم کورسـییە ئەڵماسـە ئەفسـووناوییە دەربێنن. ئەوە مێروولەکانی بـرامن ئەم کۆشـکە بلوورینەیـان بـۆ سـوڵتانی خۆیـان بەرز کـردووەتەوە. بۆیەشـە مـن سـەرجەم بوونەوەرەکـانی سـەر ڕووی زەویـم بـۆ ئێـرە، بـۆ ئەم مەراسـیمی پیرۆزباییە بانگهێشت کردووە. بەس قەومی مرۆڤم بانگ نەکـردووە، ئەو بـوونەوەرە بێکەڵکـانە، ئەو بـوونەوەرە تێکـدەر و ئـاگردەرانە، ئەو چـاوتێرنەبووە بەخـیلانە، ئەوانەی بێوچان چاوی یەک هەڵدەکۆڵن... قەومی مرۆڤ بوونە نەهـامەتی بۆ مرۆڤـایەتی و بۆ دونیـاش. قەومـی مرۆڤ دوای دەستپێکردنی ئەم کاری کڕین و فرۆشـتنە لە مرۆڤـایەتی دوورکەوتـنەوە. هەرچـی لەسـەر ڕووی زەوی بـوو کڕییـان و فرۆشـتیان. خاکیـان کـڕی و فرۆشـت، خاکیـان لە خـاکێتی خسـت. ئـاو لە ئـاوێتی، دارسـتان لە دارسـتانێتی، ئاسـمان لە ئاسـمانێتی دابـڕا. زۆری پـێ نـاچی مانـگ و ئەسـتێرەکانیش دەکـڕن و دەفرۆشن و ئەستێرە لە ئەستێرەبوون و مانگ لە مانـگ بوون دادەبڕێ.

"بـرا ڕەسـەنەکانم، خـوا کەس نەهێنێـتە ئەو ئاسـتەی مرۆڤ تێیدایە، ئـادەمیزاد پاش ئەوەی بووە بازرگـان و مامەڵەی بە هەمـوو شتێکەوە کرد، لە مرۆڤبوون دابـڕا. ئادەمیزاد کە دڵی کڕی و فرۆشت، دڵ لە دڵبوون دابڕا. ئـادەمیزاد بە کـڕین و فرۆشـتنی ئەویـن، خۆشەویسـتی، برایەتـی، ئاشـتی، هـاوڕێیەتی، سـۆز و جـوانی، لە

مرۆڤـــایەتی دابـــڕا، بـــوو بە بـــوونەوەرێکی نەوســـن. گیـرۆدەی نەخۆشـی کەڵەکەکـردن بـوو. لەبەر ئەمەش، بوونەوەرە بەڕێزەکانی هـاوڕێم، ئەمڕۆ مـن مرۆڤەکانم بۆ ئەم ڕۆژە بەختەوەرەمان بانگهێشت نەکرد. ترسـام و بانگم نەکردن. بێت و ئەم کورسییە شینە ببینن، بێت و چاویـان بەم کۆشـکە بـکەوێ کە پێل پێل تیشـک داوێ، هەرچۆنێک بێ دەست بە کڕین و فرۆشتنی دەکەن. بێ ئەمـــلا و ئەولا دەیکـــڕن و دەیفرۆشـــن. ئەم کۆشـــک و تەختەش بێ ئەوەی کەڵکی هەبێ، دەستاودەست هێندە دەکـــڕدرێ و دەفرۆشـــرێ کە کـــۆن دەبـــێ، دەشـــکێ و دەڕوخێ.

"جـا براکـانم، ئێسـتا بـا واز لە مرۆڤەکـان بێنـین، ئەوان خۆیـان بـوونەتە بەڵا بەسـەر سـەری خۆیـانەوە... ئێمەی مێـروو، مێرووی ڕەسـەن و بەشـکۆ، بـوونەوەری هەرە ڕەســەن و بەهێـزین، هەروەهــا گەورەتـرین کـۆمەڵەی گیـانلەبەرانین بێ چـین و بێ جیـاوازی تێکەڵ بە یەکتـر بـووین... ئـێمەی مێـروو و فیـل، برایـانە، ئـازادانە، بە یەکســـانی و بە ئاشـــتی شانبەشـــانی یەک دەژیـــین. یەکێکمـان لەپێنـاوی هەموومانـدا، هەموومـان لەپێنـاوی یەکێکمانـدا. ئـازادی بنـاغەی هەمـوو شـتێکە. بـڕوانن مرۆڤەکـان، ئەوان بە هـۆی ئەوەی بەقەد ئـێمەی مێـروو گرنگی نـادەنە ئازادی و یەکسـانی و بە هـیچ شـێوەیەک خوازیـاری ئاشـتی نـین، کەوتـوونەتە چ دۆخـێکەوە. ئەم ئــــازادییەی ئێســــتا هەمــــانە، واتە ئەم سیســــتەمی

ئازادییەمان تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دەبێ. ئێمە هیچ پێچوپەنایەکمان نییە. ئەمە بە گشت بوونەوەرانی برام دەڵێن کە لێرەکانە کۆبوونەتەوە، تەنانەت بە هەزارپێ، کرمەسوورە و مێشوولەکانیش، با هەموو گەردوون شایەتی بۆ ئەم قسانەم بدا کە هەر مێروولەیەک فیلێکە. هەر فیلێکیش مێروولەیەکە. بڕوانن برایانم، ئەگەر هەر مێروولەیە و فیلێک نەبوایە، ئەم کۆشکەیان چلۆن بەرز دەکردەوە؟ هەر بوونەوەرێک لەم کۆشکە بڕوانێ، تێدەگا هەر مێروولەیە و فیلێکە. ئەگەر هەر مێروولەیەک فیلێک نەبوایە، چۆن ئەم بەردە ئەفسووناوییەیان لە نێوجەرگەی زەوی دەردەهێنا و کورسییەکی ئاوایان لێ دەتاشی؟ کەوایە هەر مێروولەیە و فیلێکە. دەمەوێ نهێنییەک بۆ ئێوەی گیانلەبەری بەڕێز بدرکێنم. باش گوێم لێ بگرن."

ئەو ئاپۆرایەی گوێی بۆ قسەکانی سوڵتان ڕاداشتبوو، هەناسەی لە سینگدا ڕاگرت. گوێت لە دەنگی باڵی زەرگەتەش دەبوو. هەموویان بە مەراق بوون ڕازە گەورەکەی سوڵتانی فیلەکان ببیسن.

"پێشتر..." لێرەدا سوڵتان دیسان بێدەنگ بوو، چاوە وردەکانی بەسەر ئاپۆراکەدا گێڕا. ئەو مەلانەی لە ئاسمان باڵیان لێک دەدا، لە فڕین کەوتن.

"پێشتر..." سوڵتان هەمدیس دەستی پێ کردەوە. "پێشتر، ئێمەش، یانی ئێمەی فیلیش مێروولەیەکی بچووک بووین. پاشان بە کارکردن و هەوڵ و تەقەلایەکی

بێوچان بووینه فیل. بۆیه ئێستا و لەمەوبەدوا بە باب و باپیرمان بانگتان دەکەم مێروولە ئەژدادەکانی ئازیزمان، چونکە ئێوەی مێروولە باب و کاڵی ڕەسەنی فیلەکانن. جا ئێمە لە وەچەی ئەم مێروولە ڕەسەنەوە هاتووین و بووینەتە فیل. ڕەگەزی مێروولە لە سەرووی هەموو ڕەگەزێکەوەیە. ئەم ڕەگەزە، ئەم ڕەگەزی مێروولەیە چەند بەختەوەرە کە بە هەوڵێکی کەم دەتوانی ببێتە فیل! خوا ڕەگەزی مێروولەکان بپارێزێ. جوان لە دونیایە بڕوانن، بزانن مێروولە چەند زۆرن، چەند زۆرن. لە دونیادا، هیچ ڕەگەزێک زۆرتر و بە زاووزێتر لە مێروولە نەبووە و نابێ. بەو پێیەی دواجار هەر مێروولەیە و دەبێتە فیلێک، بەهێزترین ڕەگەز کام ڕەگەزە؟ لە ئێوە دەپرسم، وەڵام بدەنەوە. بەهێزترین ڕەگەز لەم گەردوونەدا کام ڕەگەزە؟"

بێدەنگ بوو، چاوەڕێ ما، قۆرتمەکەی بەرەو ئاپۆراکە ڕاداشت و هێنای و بردی. لەناکاو، لە ئاپۆرای ئەرز و ئاسمان، وەها نەعرەتەیەک بەرز بووەوە کە زەوی و ئاسمانی وەلەرزە هێنا.

سوڵتانی فیلەکان لەم نەعرەتە سامناکە کە لە تەقینەوەی تۆپ دەچوو، هیچ تێنەگەیشت. حەفتا هەزار گیانلەبەر بە حەفتا هەزار زمان وەڵامی سوڵتانیان دەدایەوە.

سوڵتان بە هەیبەت و فیزێکی پترەوە هەمدیس پرسیی:
"کێن؟"

ئاپۆراکە دیسان نەعرەتەی لێ بەرز بووەوە.

سوڵتان هاواری کرد:

"مێروولەکان!"

ئاپۆراکە ئەمجارە بە زمانی فیلەکان و وێکڕا گوڕاندی:

"مێروولەکان."

سوڵتانی فیلەکان دووپاتی کردەوە:

"بەڵێ، مێروولەکان، بەڵێ، مێروولەکان. بەڵێ، هەر کەسێ ئەگەر ددان بە جەرگیدا بنێ و کار بکا، لە سیفرەوە دەست پێ بکا و بچێتە پێش و یادگارێکی وەک ئەم کۆشکە بۆ گەردوونەکەمان چێ بکا و کورسییەکی شینی سیحراوی وەک ئەم کورسییە دابتاشێ، ئەو هەمیشە، هەر کاتێ پێی خۆش بێ، دەتوانێ ببێتە فیل."

بێدەنگ بوو، بزەیەکی خۆشی هاتێ، گوێچکەکانی لێک کردەوە و وێکی هێنان:

"جا ئێستا هەرچیم گوت، ئێوە دووپاتی بکەنەوە... هەر مێروولە و فیلێکە!"

ئاپۆراکە لە حەفتا هەزار لاوە بە حەفتا هەزار دەنگی جیاواز دووپاتی کردەوە:

"هەر مێروولەیە و فیلێکە."

"لەبەر ئەم هۆکارەش..."

حەفتا هەزار دەنگی جیاواز دووپاتیان کردەوە:

"لەبەر ئەم هۆکارەش..."

"بەهێزترین بوونەوەری دونیا و گەردوون مێروولەیە."

"مێروولەیە!"

دەی هەموو پێکەوە... مێرووڵە فیلە، فیل مێرووڵەیە، مێرووڵە فیلە، فیل مێرووڵەیە... مێرفیل... فیل‌مێر، مێرفیل..."

هەموو تێکڕا:

"فیل‌مێر، مێرفیل... مێر... فیل... فیل... فیل... مێر..."

ئاپۆراکە پەیتاپەیتا ئەمەی دووپات دەکردەوە.

مێرووڵەکان شادومانییەکی بێسنوور بەسەریاندا زاڵ بووبوو و ئیتر خۆیان وەک فیلێکی زەبەلاح دەهاتە بەر چاو. بۆ ئەم مەبەستە، تەنانەت کەمتەرخەمترین مێرووڵەش، بیری لەوە دەکردەوە کە لانیکەم سبەی لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا دەستێکی سیحراوی بیکاتە فیلێکی گەورە. لە ئێستاوە پەپووەکان، هەڵۆکان، داڵاشەکان، چۆلەکەکان، سەیرە و سێروو و قوونهەڵتەکێنە بووبوونە فیلی باڵدار. لەم دونیا بەرتەسکەدا کێ هەبوو پێی خۆش نەبێ فیل بێ؟

سوڵتانی فیلەکان باش قسەی کردبوو و دڵی سەرجەم بوونەوەرەکان و بەتایبەت مێرووڵەکانی بەدەست هێنابوو. ئێستا ئیتر دەیتوانی فەرمان بە مێرووڵەکان بدا ئاواتەکەی بەدی بێنن. بە دەنگێکی گڕ و فەرماندەرانە هاتە گۆ:

"داوایەکی دیکەشم لە ئێوە هەیە، ئەی نەتەوەی فیل‌مێر... فەرمان دەدەم ئەم داوایەم بەجێ بێنن. ئەگەر ئەم داوایەم بەدی نەیە، ئەم وڵاتە بەختەوەرەمان لەسەر پێ نامێنێتەوە و کامەرانیمان زۆر بەردەوام نابێ، فیل مێرەکانی برام."

مێرووله‌کان به‌ یه‌ک ده‌نگ وه‌ڵامیان دایه‌وه‌:
"گشت فه‌رمانێکت له‌ بان سه‌رمان داده‌نێین..."
بوونه‌وه‌ره‌کانی تریش هه‌موویان پێکه‌وه‌ وه‌ڵامیان دایه‌وه‌، یانی وه‌ک ته‌قینه‌وه‌ی تۆپ ده‌نگیان به‌رز بووه‌وه‌:
"هه‌ر فه‌رمانێکت له‌ بان سه‌رمان. تۆ سوڵتانی ئێمه‌ی... هه‌موو بوونه‌وه‌ره‌کانی دونیا ئاخرییه‌که‌ی ده‌بنه‌ فیل. ئێمه‌ لێره‌ بڕوامان به‌مه‌ کرد و ئیمانمان پێ هێنا."
"بوونه‌وه‌ره‌ به‌ڕێزه‌کان، ئێوه‌ بێده‌نگ بن بزانم، ئه‌مه‌ پرسێکی نێوخۆیی ئێمه‌یه‌. به‌س په‌یوه‌ندیی به‌ مێرووله‌کانه‌وه‌ هه‌یه‌. بۆیه‌ ئێوه‌ بێده‌نگ بن، برا بوونه‌وه‌ره‌ به‌ڕێزه‌ فیلمێره‌کانی ترم..."
مێرووله‌کان:
"ئه‌مر بکه‌ سوڵتانی خۆمان. بێژه‌، ئه‌گه‌ر فه‌رمان بده‌ی دونیا هه‌ڵده‌گرین و ده‌یبه‌ینه‌ لای خۆر. سوڵتانی خۆمان، ئه‌گه‌ر مه‌یلت له‌سه‌ر بێ، مانگ هه‌ڵده‌گرین و ده‌یهێنینه‌ ئێره‌. له‌ ئه‌ستێره‌کان کورسیت بۆ دروست ده‌که‌ین."
"نا، نا، شتی وا نابێ، ڕاوه‌ستاو بن مێرووله‌کانی برام. داواکه‌م هێنده‌ گرنگ نییه‌. بڕوانن، گوێم لێ بگرن، له‌م ڕۆژه‌ به‌خته‌وه‌ره‌دا شتێکی بچووکه‌ منی په‌ست کردووه‌."
مێرووله‌کان وورووژابوون و حه‌جمینیان لێ هه‌ڵگیرابوو:
"ئه‌و شته‌ چییه‌، خێرا بێژه‌..."
"ئه‌ویش ئه‌وه‌یه‌، مێرووله‌یه‌کی ڕدێنسوور هه‌یه‌، دوژمنمه‌، دوژمنی سه‌رجه‌م بوونه‌وه‌ره‌کانه‌، شتێکه‌

وەک مرۆڤ... جا من ئەمڕۆ مردوو یان زیندووی ئەم مێرووله ڕدێنسوورەم لە ئێوە دەوێ. ئەم مێرووله ڕدێنسووره لەسەر پشتی ئەم پەپووەی برامان سووکایەتی کرد و پاشان لەسەر باڵەکانی ڕا خۆی فڕی دا و هەڵات. لەو ڕۆژەوە بەدوا من وێڵی مردوو یان زیندووی ئەو مێرووله ڕدێنسوورەم. ئەم مێرووله ڕدێنسووره ئاسنگەرێکی گەورەیە. گوایە ڕەچەڵەکی دەگەڕێتەوە بۆ داودی پاشای مرۆڤەکان، یانی مێرووە ڕیشسووری ئاسنگەر سەر بە ڕەچەڵەکی مرۆڤەکانە. تێگەیشتن چەند مەترسیدارە؟... ڕەچەڵەکی ئەم مێرووە ڕیشسووره دەگەڕێتەوە بۆ سەر مرۆڤەکان! بێجگە لەوە، ئەو مێرووە ڕدێنسوورانەی دوژمنی ئازادین، ژمارەیان لە دونیادا زۆرە. ئەم مێروولانە دوژمنی ئازادی و ئایین و یەکسانین. ئەمانە نەیاری مێروولەکانن، نەیاری فیلەکانن. ئەمانە نەیاری سەرجەم بوونەوەرەکانی سەر ڕووی زەوین. سەبارەت بەمانە زانیاریی زۆرم دەست کەوتووە. ئەمانە دوژمنی داوێنپاکین. ئەمانە ڕەگەز، تۆرەمە، خوێن، دابونەریت و مێژوو ناناسن. باش گوێم لێ بگرن، ڕەگەزی ئەم مێرووە ڕیشسوورانە دەگەڕێتەوە بۆ سەر مرۆڤەکان. با درێژدادڕی نەکەم، ئاخۆ بۆ کوشتنی هەموویان ئەوەندە بەس نییە کە ئەوان سەر بە ڕەچەڵەکی مرۆڤەکانن؟ ئەم ڕدێنسوورانە کە ڕەچەڵەکیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر مرۆڤەکان، ئەگەر هیچ شتێکیش

نەکەن، لەنێو بوونەوەرەکان و لەنێو مێروولەکان ئاژاوە دەنێـنەوە، سـەرجەم بوونەوەرەکـان، مێروولەکـان و فیلەکـان تێـک بەردەدەن. ئـاژاوەی مـرۆڤ بە گێتیـدا بـڵاودەکەنەوە. ئەگەر ئەوان لە گـۆڕێ نەمێـنن، دونیاکەمـان پشـوو دەدا. ئەگەر ئەو ڕدێنسـوورانە لەنـاو بـران، گورگ و مەڕ پێکەوە ئـاو دەخـۆنەوە. ئەگەر ئەو ڕدێنسـوورانە لە گـۆڕێ نەمـان، هـیچ بوونەوەرێـک بـوونەوەرێکی تـر نـاخوا. ئێسـتا مـن پێشـان داوا لە مێروولەکـان و پاشـان سـەرجەم بوونەوەرەکـانی تـر بە مەل و زەردەواڵەکـانەوە دەکەم مـردوو یـان زینـدووی ئەو مێرووە ڕدێنسوورانەم بۆ بێنن. هەر کەسێ مردوو یـان زینـدووی ڕدێنسـوورێک بێنـێ و لەم مەیـدانە لە ئەرزێـی بـدا... ئەوەیـش وا ئەو مێـرووە ڕدێنسـوورە ئاسـنگەرەی سـووکایەتیی بە مـن کـرد، بە سـووکایەتیکردن بە مـن سـووکایەتی بە سـەرجەم ئاژەڵەکـان کـرد، بـدۆزێتەوە و بیهێنـێ، ژوورێکـی لە کۆشکەکەم پێ دەدەم. ئەو بـوونەوەرە هەتـا مـردن لەو ژوورە دەژی و بە هەنگـوینی شـیلەی گـوڵان بەخێـو دەکرێ... ماڵ و منداڵ و وەچەکەی هەتـا ڕۆژی قیـامەت خۆراکیان هەنگوین و شیلەی گوڵ دەبێ.

هێشـتا سـوڵتان قسـەکەی تەواو نەکردبـوو، گشـت بوونەوەرەکـان، مەل و مێـروو بە دونیـادا بڵاوبـوونەوە و دەسـتیان بە نێچیـری ڕدێنسـوورەکان کـرد. زۆری پـێ

نەچوو ئەو مەیدانەی سولتانی فیلەکان نیشانی دابوو تەژی بوو لە مردوو و زیندووی ڕدێنسوورەکان.
سولتان کە بە جارێ ئەو هەموو ڕدێنسوورەی بە مردوویی، بە برینداری و بە زیندوویی دەبینی شاگەشکە بوو و فەرمانی بە فیلەکان دا:
"بەرەو مەیدان! هەر ئێستا بەسەر ئەم مێروولە ڕدێنسوورانەدا بڕۆن و مردوو و زیندوویان بکەنە تۆز..."
فیلەکان دەستبەکار بوون و لە چاوتروکانێکدا مێروولە ڕدێنسوورەکانیان تەفروتوونا کرد. ئەو ڕدێنسوورانەی لە مەیدانەکە پان بووبوونەوە، هەموویان بە بەردەکانەوە نووسابوون و دەبینران و نەدەبینران.
پاش لەناوبردنی ڕدێنسوورەکان، سولتان سەیری پانتایی مەیدانەکەی کرد، ساتێک تێڕاما و یەکسەر شتێک ختووکەی مێشکی دا و بە پەرۆشەوە گوتی:
"ئەی مێرووە ڕیشسووری ئاسنگەر، ئەی مێرووە ڕیشسووری ئاسنگەر؟"
ئاپۆرا فزەی لێوە نەهات.
"ئەی ئاسنگەرەکە؟"
هیچ بوونەوەرێک متەقی لێوە نەهات؟
"ئاسنگەرەکە؟"
سەرکردەی پەپووەکان هات و سێ جار بە دەوری سەری سولتاندا گەڕا. سێ ئەڵقەی نارنجی دروست کرد.
"ناتوانن قسە بکەن سولتانم. ئاسنگەرەکە تەلیسمی کردوون."

سوڵتان هەترەشی چوو:
"ئەی ئەگەر ئەمنیشی تەلیسم کرد؟ تەلیسمی کردم و کۆشک و سەرای لەدەستم دەرهێنا؟"
"مێروولەکان ناتوانن فیلەکان تەلیسم بکەن سوڵتانم."
سوڵتان لە ترسان زاری وشک بووبوو و بە خۆفێکی زیاترەوە گوتی:
"بەڵام ئەو لە وەچەی مرۆڤە. ئەو مرۆڤە..."
پۆپەبەرز چووە نێو گوێچکەیەوە، بە چپەدوو هەندێک شتی پێ گوت، سوڵتان بەم قسە نهێنییانەی وی پێکەنی و پێکەنی. دەستی بە زگە چەرمووە زلەکەیەوە نا و پێکەنی.
"ئیتر با بوونەوەرەکانی تر بڕۆن، بەس با مێروولەکانی برامان بمێننەوە. میوانی و جەژنی گەورە چاوەڕێیانە. دەی ساز لێ دەن و بیکەنە بەزم."
لەناکاو دەنگی سەیر و ئەفسووناوی لە دەشت و چیاکان سەدای دایەوە.
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"ئەمە خۆشە."
ئەوسا بە دەنگێکی بەرز فەرمانی دا:
"دەرگەی سێ عەمباری پڕ لە شیلەی گوڵ، هەنگوین و دەعبای مردوو بکەنەوە. باب و کاڵی مێروولەمان با ئەمڕۆ ژەمێکی تێر بخۆن. سێ عەمبار بۆ ئەوان کەمیشە."

مێروولەکان کتوپڕ بۆیان دەرکەوت کە لەمێژە برسین و بەرەو عەمبارەکان غاریان دا. مێروولە کۆکەرەوەکان چەندەیان شیلەی گوڵ، هەنگوین، دەنکەگەنم و دەعبای مردوو کۆکردبووەوە!

مێروولەکان چوونە نێو عەمبارەکان و سێ ڕۆژ و سێ شەو خواردیان و باش تێر بوون. زۆر لەمێژ بوو خواردنێکی وا ڕێکوپێکیان نەخواردبوو. منەتباری سوڵتان بوون و گوتیان:

"لەم دونیایەدا سوڵتانێک، خودایەک بەدی ناکرێ هێندەی ئەم سوڵتانە خێرخواز و مێروولەحەز بێ. نەخوازە ئەم خودایە سێ وەچە پێشتر مێروولە بووە."

بە شانازییەوە بەردەوام بوون:

"خوا غەزەب لەو مێرووە ڕدێنسوورە ئاسنگەرە شەلە بگرێ. سەیر کەن سوڵتان - خودا و فیلی چەند گەورە و دونیاناسا لە مێروولەکان هەڵدەکەوێ."

مێروولەی سەرجەم وڵاتەکان لە خۆشیی ئەو کۆشک و کورسییەی دروستیان کردبوو، بە هۆی ئەو قسانەی سوڵتان - خودا پێی گوتبوون و ئەو هیوا دڵخۆشکەرەی کە هەر چۆنێک بێ ڕۆژێک دەبنە فیل، مەست بووبوون و نەدەهاتنەوە سەر خۆیان.

ئەم سەرخۆشییەی مێروولەکان سێ مانگی ڕەبەقی خایاند. سێ مانگی ڕێک مێروولەکان لە خۆشیان پێیان لەسەر ئەرز نەنا.

مێروولە کفت و ماندووەکان بە کەیفخۆشی گەڕانەوە وڵاتەکانی خۆیان. دڵ کەیلی شادی بوون. ئاخر چۆن دڵشاد نەبن، جوانترین و گەورەترین کۆشکی دونیان بۆ سوڵتانی هەرە بەهەیبەتی دونیا دروست کردبوو. ئەی ئەو کورسییە ئەڵماسە کە بە میلیارد مێروولە تۆسقاڵ تۆسقاڵ لە نێوەندیی زەوی دەریانهێنابوو، گواستبوویانەوە و بەسەر یەکەوەیان نابوو. بە درەوشانەوەی ئەم کورسییە سەرانسەری زەوی نوقمی شوقێکی شین و دڵڕفێن دەبوو. بەختەوەری و شادییان پێشکەش بە سوڵتانێکی پایەبەرز کردبوو.

ئینجا سوڵتان چیی گوتبوو؟ گوتبووی: "هەر مێروولەیە و فیلێکە. باب و کاڵی ئەم فیلە زەبەلاحانەش، باب و باپیری منیش، تەنانەت خۆیشم، هەر هەموومان مێروولە بووین. مێروولەیەک بە تەنیا هەموو دونیایە دێنێ. هەموو مێروولەکان بە کارکردن دەتوانن ببنە فیل.

هەر مێروولەیەک ئەگەر زیاتر مل وەبەر کار بێنێ، بەپێی هەوڵ و ماندووبوونی دەبێتە فیل، تەنانەت بۆی هەیە ببێتە پێنج فیل. ئێمەی فیل کە مێروولە بووین، چۆن بووینە فیل؟ بێژن، بێژن، ئەم فیلانە کاتێ مێروولە بوون چۆن بەم دۆخە گەیشتن؟ چۆن پێدەگەن؟ بە سازکردنی کۆشک و کورسی بۆ سوڵتانەکەیان، بە کۆکردنەوەی گشت هەنگوین، شیلەی گوڵ و کاکڵی سەر رووی زەوی بۆ سوڵتانەکەیان بەم ڕۆژە گەیشتن. گەر بەم جۆرە بڕواتە پێش و پابەندییان بە سوڵتان بەو ڕەنگە بەردەوام بێ، بۆی هەیە بوونەوەری بالاتر..."

مێروولەکان هەر لە ئێستاوە خۆیان بە فیل دەزانی. خۆیان بە فیل لە قەڵەم دەدا، وەک فیل خۆیان فش دەکرد و بە شار و وڵاتەکانیاندا دەگەڕان. ئیتر لە هەر مێروولەیەکدا ئاینوئۆین و هەڵسوکەوتی فیلێک هەبوو. نەخوازە مێروولە زەردەکان کە خۆیان بە یەکجاری بە فیل لە قەڵەم دەدا. دەیانگوت: "ئێمە ئەژدادی ڕاستەقینەی فیلەکانین". ئەم قسەیە بەردەوام وێردی سەر زمانیان بوو. سمێڵیان وەک قۆرتم درێژ دەکردەوە، سواری پشتی پەپووەکان دەبوون و دەنگوباسی وڵاتی مێروولەکانیان بە سوڵتان ڕادەگەیاند. سوڵتانیش بەو هەواڵانەی دەیبیستن، بێڕادە خۆشحاڵ دەبوو.

"ئێستا هەموو مێروولەیەک خۆی پێ فیلە."

"چ لەوە باشتر، با خۆیان پێ فیل بێ. منیش هەر ئەوەم گەرەک بوو. با مێروولایەتییان لە بیر بچێتەوە، ئیتر خۆیان بە چ دەزانن با بزانن."

"مێروولەکان هێدی هێدی وەک فیل بە ڕێگەدا دەڕۆن."

"باشترە. منیش هەر ئەمەم دەویست."

"هەوڵ دەدەن وەک فیلان بپەیڤن."

"ئەمە لە هەموویان باشترە... یارمەتیدەر بن، چیتان لەدەست بێ دریغی مەکەن، با زمانی مێروولەکان کە شیاوی تێگەیشتن نییە لە بیر بکەن و فێری زمانی فیلەکان بن. زیاتر و زیاتر یارمەتییان بدەن."

بێجگە لەمانە، هەواڵی تریش لە شار و وڵاتی مێروولەکانەوە دەگەیشت. سوڵتان بە بیستنی ئەم هەواڵە نوێیانە دڵی لە ژێللا دەهات. مێروولەکان لە فیلبووندا زۆر پێشرەوییان کردبوو. ئەگەر بەم جۆرە بەردەوام بوونایە، ئەوا قازانج سەری مایەی دەخوارد.

"سوڵتانی خۆمان، مێروولەکان ئێدی کتومت وەک فیلەکان خواردن دەخۆن."

سوڵتانی فیلەکان ژاچەنی:

"هەر بە ڕاست؟ چۆن شتی وا دەبێ، مێروولە چۆن وەک فیلان خواردن دەخۆن؟ ئەمەیان لە کوێوە هێنا؟"

"دەڵێن بۆ ئێمە فیل نین، چییان بێتە سەر ڕێ، بە ملچەملچ دەیخۆن."

سوڵتانی فیلەکان گوڕاندی:

"ئاوا نابێ."

بە دەنگی وی، شاخ و دەشت و دارستان نالاندیان. ئەو مێروولانەی ئەمەیان بیست گوتیان:
"ئێمەش ڕۆژێک وەک سوڵتانی خۆمان دەگوڕێنین و چیاکان، دەریاکان، دارستان و پێدەشتەکان بە ناڵەناڵ دەخەین. بۆ ئێمە فیل نیین؟"
سوڵتان توندتر لە پێشوو نەڕاندی و لەسەری ڕۆیشت:
"ئەمن ڕێگە بەمە نادەم. مێروولە وەک فیل خواردنیان بۆ ناخورێ، دەدڕێن و دەمرن. ئامان ها، یەکسەر پێش بەمە بگرن. سەرکردەی پەپووەکان، خێرا، هەر ئێستا بەرەو وڵاتی مێروولەکان بفڕە، بە مێروولەکانی عەبدم بڵێ لێم قەدەغە کردووە وەک فیلەکان خواردن بخۆن. ئینجا ئەگەر ئەوان وەک فیلەکان خواردن بخۆن، ئاخری دەتەقن و دەمرن. ئەودەم، من لەم دونیایەدا بێ مێروولەکانی عەبدم و باب و باپیرانم چۆن بژیم؟ مێروولەکان فیلن، ئەمە قسەی تێدا نییە، بەڵام بەو مەرجەی بەقەد فیلەکان و وەک ئەوان خواردن نەخۆن... ئەمان ها، سەرکردەی پەپووەکان، ڕووبەڕووی گەورەترین مەترسی بووینەتەوە. بە مێروولەکانی عەبدم بڵێ ئەگەر مێروولەکان وەکو فیل خواردن بخۆن، خواردەمەنی سەرانسەری دونیا لە چاوتروکانێکدا تەواو دەبێ. هیچ شتێک بۆ خواردن نامێنێ. ئەگەر مێروولەکان، بەقەد فیلەکان و وەک فیلەکان خواردن بخۆن زۆری پێ ناچێ قاتوقڕییەک دەستەویەخەی دونیا دەبێ کە لە پەلەوەری ئاسمانەوە بگرە تا خشۆکی

سەر زەوی، سەرجەم بوونەوەرەکان لە برسان دەمرن. ئەگەر مێروولەکان تەنیا سێ ڕۆژ، زۆر نا تەنیا سێ ڕۆژ، وەک فیلەکان و بەقەد ئەوان بخۆن تەنانەت پاروویەک خواردەمەنی لە دونیا نامێنێتەوە، هەموو گیانلەبەران لە برسان سللار دەبنەوە و دونیا کۆتایی دێ. ئەم قسانەم وەک خۆی بە گوێی مێروولەکانی عەبدم بگەیەنە، بێ ئەملا و ئەولا لێم قەدەغە کردوون وەک فیلەکان خواردن بخۆن. فەرمانەکەم مسۆگەرە و هەر کەسێک سەرپێچیی لێ بکا، لە بن پێی فیلەکاندا پان دەبێتەوە."

پۆپەبەرز یەکسەر بەرەو وڵاتی مێروولەکان فڕی، فەرمانی سوڵتانی شار بە شار و ڕاشکاوانە ڕاگەیاند. مێروولەکان بە بیستنی ئەم فەرمانە فزەیان لێوە نەهات و لەبەر خۆیانەوە گوتیان ئیتر ئەمە چۆن فیلایەتییەکە. گوتیان: "مادام فیل لە ئێمەوە هاتوون، کەواتە ئێمەش وەک فیلەکان دەخۆین و دەبێ بخۆین."

سوڵتانی فیلەکان لە پۆپەبەرزی پرسی:

"لە وەڵامی فەرمانەکەی مندا چییان گوت؟"

پۆپەبەرز بەرسڤی دایەوە:

"متەقیان لێوە نەهات. بەس هەندێک بۆڵەبۆڵیان کرد. من کە بەسەر شاری مێروولەکاندا بەرەو ئێرە دەهاتمەوە، لە خوارێ ڕا بەردەوام گوێم لە پرتەوبۆڵە دەبوو. ورتەورت شارە مێرووەکانی تەنیبوو."

سوڵتان لە قاقای پێکەنینی دا:

"ئەگەر پرتەوبۆڵەیـــان نەیە چ بـــکەن؟ هێشـــتا بۆیـــان دەرنەکەوتـووە هـیچ شـتێک بۆ خـواردن چنگ نـاکەوێ. نـــازانن کە ئەمســـاڵ نەک هەر وەک فیــل، بگـــرە وەک مێـــرووش نـــاتوانن خـــواردن بخـــۆن. بێئاگـــان لەوەی خواردەمەنییان بۆ خۆیان کۆ نەکردووەتەوە، کەچی ئەو گەمـژانە دەیــانەوێ وەک فیـل خــواردن بخــۆن. ئەگەر بــزانن عەمبارەکانیـــان بەتـــاڵن، ئەوا وەرە و ســـەیری هەراوهەنگامەی وڵاتەکانیان بکە... ئێسـتا بـا بۆ خۆیـان پرتەوبۆڵەیان بێ."

زۆری پێ نەچـوو پەپـووەکـان و مێـرووڵە زەردەکـان بە هەواڵێکـی ســەیرەوە دیســان لە وڵاتــی مێرووڵەکـانەوە هاتن و گوتیان:

"مێرووڵەکان هاوار دەکەن و دەڵێن چما ئێمە فیل نیین، دەڵـێن ئـێمەش دەبـێ وەک فیلەکـان هەنگوین و شـیلەی گوڵ و کاکڵان بخۆین."

ئەم مێــرووڵانە هەر بە جــارێ خۆیـــان لــێ گــۆڕاوە و خۆیـان بە فیلـی ڕاسـتەقینە لە قەڵەم دەدەن. سـوڵتان کە فیکـــری لەمە دەکـــردەوە، نەیـــدەتوانی پـــێش بە قاقـــا دووروودرێژەکـــانی بگـــرێ. مەگەر خۆیشــی لە فیلێتیـــی مێرووڵەکانـــــدا زێـــــــدەڕەویی نەکردبـــــــوو؟ بەڵام مێرووڵەکـــانیش بـــۆ بـــوونە فیـــل ئامــــادەبوون! هەی بـاوکەڕۆ، حـازر بـوون گیانیـان فیـدای فیلێتـی بـکەن و کەس پێی نەزانیبوون! مێرووڵەش ڕازەکانیـان لای کەس نادرکێنن.

سوڵتان بە پۆپەبەرز و مێروولە زەردەکانی گوت:
"ئەم فەرمانەشم دەسبەجێ بە مێروولەکانی بەندەم بگەیەنن، ئەمان با دەم لە هەنگوین و شیلەی گوڵ و کاکڵ نەدەن، ئەمان! بە دڵنیاییەوە ئەم خواردەمەنییانەم لەوان قەدەغە کردووە. ئەم خۆراکانە خۆراکی ئەم فیلە بچووکانە نییە. مێروولەکان ئەگەر ئەو خواردنانە بخۆن کە ئاماژەم پێ کردن، ژاراوی دەبن و دەمرن. مێروولەکانی بەندەم، هەرچی فیلەکان دەیکەن با ئەوانیش بیکەن، بەڵام ئەمان با وەک ئەوان خواردن نەخۆن. یان دەتەقن و دەمرن یان ژاراوی دەبن... ئەمان ها ئەمان، ئەم قسانەم زوو بە بەندەکانم بگەیەنن."
پەپوولەکان وێڕای ئەو مێروولە زەردانەی لەسەر باڵەکانیان بوون، فڕین و چوونە وڵاتی مێروولەکان. فەرمانی سوڵتانیان جارێکی تر بە شەیپوور بە هاووڵاتییانی مێروولە ڕاگەیاند.
سوڵتان پرسیی:
"چ بوو؟ مێروولەکانی بەندەم چییان گوت؟"
"کە ئەم قسانەیان بیست، هەموو تێکڕا لە قاقای پێکەنینیان دا. بێ ڕاوەستان، بێ ئەوەی ساتێ بێدەنگ بن، پێکەوە هاواریان دەکرد ئێمە فیلین، ئێمە فیلین... کە گەیشتینە ئێرە، هێشتا لەپشت سەرمان دەنگی ئەوان دەهات."
سوڵتان گوتی:
"با پێبکەنن. با پەیتاپەیتا بەدەم پێکەنینەوە بڵێن ئێمە فیلین. لە بیریان چووەتەوە بە ئەندازەی دە ساڵ

هەنگـــوین، گـــوڵ و کاکڵیـــان کـــۆکردووەتەوە و لە عەمبارەکانی منیان ئاخنیوە... با هەر پێبکەنن، بەم زوانە بۆیان دەردەکەوێ کە..."
چەنـد ڕۆژ دواتـر پەپووەکـان و مێرووله زەردەکـان بە هەواڵێکی واوە هاتن کە سوڵتانی فیلەکان هێند حەپەسا و گوێچکە چارۆکەئاساکانی وەها قیت بوونەوە دەتگوت ئیتر وا بە ئاسانی نایەنەوە خوارێ.
سوڵتانی فیلەکان حەجمینی لێ هەڵگیرابوو، وەک شێتان بە دەوروبەری خۆیدا دەسووڕایەوە و دەینەڕاند:
"ئاوا نابێ! ئەمەیان ئیتر نا."
ســـوڵتان فەرمـــان لەدوای فەرمـــانی بە ســـەرکردەی پەپووەکان ڕادەگەیاند.
"بێژە، بێژە، دیسان بێژە."
پۆپەبەرزیش، پۆپە نـارنجییەکەی، باڵەکـانی و قاچەکـانی لێک دەهاڵان و دەیگێڕایەوە:
"ڕۆیشتم و گەیشتمە وڵاتەکانیان. چ ببینم باشە؟ شـار و وڵاتیـــان کەســـی تێـــدا نەمـــابووەوە. پرســـیارم لە مێروولەیەکی نەخۆش کرد، گوتم مێروولەکان لە کوێن هـــاوڕێ، گـــوتی مێروولەکـــان تەواو بـــوونەتە فیـــل و ڕوویـــان کـــردووەتە دارســـتان. لەوێـوە یەکســـەر بەرەو دارستانەکان فڕیم. کە گەیشتم، چ ببینم سوڵتانم، گشت مێروولەکـــان کەفەڵیـــان دەرپەڕانـــدووە و ڕێـــک وەک فیلەکان کەفەڵیان لە دار، پنچک و چقڵ و گیا دەخشێنن.
بە دارســـتانەکاندا تێـپەڕیم، چەنـــدان ڕۆژ دارســـتان و

دەوەنەجارەکـانی دونیـا یەکە یەکە گەڕام، لە هەمـوو شوێنێ، لە بن داوێنی هەر دارێ، هەر بڕکەیێ، بن هەر لاسـکێکی وشـکبوو کۆمەڵێـک مێـروولە کەفەڵیـان دەخوراند. کە دەگەیشتمە هەر شوێنێ دەمپرسی، ئەمە چ حاڵە هەیاران؟ وەڵامیان دەدامەوە ئێمە بووینەتە فیل، وەک فیلێکی ڕاستەقینەمان لـێ هـاتووە. بە پیاسـوونی سمتیانەوە سەرخۆش دەبوون و دەیانگوت ئۆخەی، فیل بوون چ خۆشـە، چ چێژبەخشـە. سولتانم، حالی حـازر، مێروولەی دونیا هەمووی وازیان لە کاروباریان هێناوە، مێروولەکـانی سەرانسـەری دونیـا، لە تەمەنـی حەوت سـاڵییەوە بـۆ حەفتـا سـاڵی، سـاغ و نەخـۆش، لە دارستانەکان کەفەڵیان لە درەخت و پنجک و دڕووەکان دەخشێنن. پەیتاپەیتاش دەڵێن فیلبوون چ چێژبەخشـە، چ چێژبەخشە، کاریان بووەتە خۆ ڕێخشـاندن. خـواردن و خواردنەوە، کار، گەشت و گەڕان، هەموو شتێ، تەنانەت دونیایشـیان لە بیـر چـووەتەوە و بـێ ئەوەی سـاتێ بوەسـتن کەفەڵەکانیـان لە دارەکـان دەخشـێنن. بڕیاریـان داوە ڕێک وەک فیلەکـان هـیچ نەکەن و دەسـتیان بە تەڕ و وشـکەوە نەنـێن. دەڵـێن ئەگەر لەمەوبەدوا تەنـانەت بشـمرین، ئەگەر هەپـروون بە هەپـروونیش بکـرێین، سمتمان لە دارەکـان دانـابڕین. ئـۆخەیش، فیـل بـوون چ خۆشـە، چ خۆشـە! سـوڵتان سـەلامەت بـێ، ئەو ئـێمەی کردە فیل، فێری فیلێتیی کردین و بۆمان دەرکەوت ژیـان چییە. ئەگینـا بـێ ئەوەی سـمتمان لە دارێک خشـاندبێ،

وەک کەر دەهاتینە دونیا و وەک ڕەشەولاغ دەڕۆیشتین.
ئـێمە هەتـا مـردن، بەم جـۆرە فیـل دەمێنیـنەوە و بەم شێوەیە دایمودەرهەم کەفەڵمان لە دارەکان دەخشێنین."
پۆپەبەرز، دەنـووکی، قاچەکـانی، باڵەکـانی و پـۆپەکەی تێکەڵ بە یەک بووبوون و لێک هـاڵابوون، چ شـتگەلێکی نەدەگێڕایەوە! گێڕایەوە و گێڕایەوە، تا دواجار لە پەلوپۆ کەوت، مـات بـوو و لەبەر چـاوی سـوڵتان لەسـەر لقـی دارگوێزێک نیشت.
سوڵتان پرسیی:
"ئەوە کەفەڵت چیی لێ هاتووە؟"
کەفەڵی سەرکردەی پەپووەکان ڕووتابووەوە و تەنانەت پەڕێکی پێوە نەمابووەوە.
پۆپەبەرز گوتی:
"ئەرز تـا ئاسـمان حەق بە مێروولەکـانە. منـیش بـوومە فیل، دارێکم بۆ خۆم دیتەوە و کەفەڵـم بـێ ڕاوەسـتان بە دارەکە داهێنا. هەتا زیاتر کەفەڵم پێدا دێنـا، زیـاتر کەیفـم پێ دەکرد و تا زیاتر کەیفم پێ دەکرد، زیاتر کەفەڵم ڕێ دەخشـاند، ئا بەم ڕەنگە پەڕێـک بە سـمتمەوە نەمـا، وەک ئاوێنە لووس و ساف بوو. سەرجەم پەپوو و مەلەکـانی دیکەش لاسایی منیـان کردەوە، کەفەڵیـان بە دارەکـانەوە نـا و دەسـتیان کـرد بە خۆخورانـدن. ئێسـتا پەلەوەر لە سـەرووی دارەکـان و مێـروولە لە خـوارەوە بێوچـان خۆیان دەخورێنن و مەست و سەرخۆش دەبن."

سوڵتانی فیلەکان بە قەد قەڵافەتی فیلێک بەرز بووەوە و نەڕاندی:
"قەدەغەیەههه!"
مێرووله و پەپوولەکانی نێو دارستان دمەلاسکەیان کردەوە و لە خۆشیان تێکڕا هاواریان کرد:
"قەدەغەیەههه."
"ئەمە کۆتایی دونیایە. ئەگەر هەموو بوونەوەرەکان بەمە ڕابێن، ئەمە دەبێتە کۆتایی بوونەوەرەکان و سرووشت و گەردوون، قەدەغەیەهههه!"
سەرجەم بوونەوەرەکانی دارستان لاسایی دەنگەکەیان کردەوە:
"دەبێتە کۆتایی، دەبێتە کۆتایی، قەدەغەیەهههه!"
سوڵتانی فیلەکان لە ئاست ئەم دۆخە ناباوەڕە وەک شێتانی لێ هاتبوو و وە هەناسەبڕکێ کەوتبوو:
"سەرکردەی پەپوولەکان، ئەی پۆپەبەرز لانیکەم تۆ، تۆ واز لە خۆخوراندن و خۆلەدارخشاندن بێنە."
سەرکردەی پەپوولەکان لە کاتێکدا کەفەڵی بە لقەکەی پاشەوەی نابوو و بێ ناوبەر دەیخوراند، گوتی:
"ناتوانم واز بێنم سوڵتانم، ناتوانم واز بێنم. ناتوانم واز بێنم سوڵتانم، ئۆۆۆخەیش، ناتوانم واز بێنم سوڵتانم. حەز دەکەی هەر ئێستا پێم لێ بنێ و پانم بکەوە، دیسان ناتوانم واز لە خواردنی کەفەڵم بێنم سوڵتانم... ئۆۆۆخەی، ئۆۆۆخەی، ئۆۆۆخ سوڵتانم، شوکر بۆ تۆ، چ خۆشە فیل بی. لە دونیا تێدەگەی. کە بوومە فیل، کە

زۆر بوومە فیل، کە کەفەڵم بە داردا هێنا و بێ بڕانەوە خوراندم، تامی ژیانم چەشت. ئۆۆۆخەی سوڵتانم، ئێمە پێشتر هیچ نەژیاوین. بمکوژە، بمکوژە سوڵتانم، بەڵام لەم فیلێتییە بێبەشم مەکە، باشە؟"

پۆپەبەرز ئەم قسانەی دەگوت و دەگوتەوە.

سوڵتان پشووی هاتەوە سەر خۆ، سەری خستە نێوان دەستەکانی و بەرەو باخچە تایبەتییەکەی ڕۆیشت، بە سەرکردەی پەپووەکانیش کە بە دەوری سەریدا دەسووڕایەوە، گوت:

"تۆ جارێ بڕۆ دارێک بۆ کەفەڵت بدۆزەوە و خۆت بخورێنە، با من بیرێک بۆ ئەم فیلبوونە بکەمەوە."

"بێقەزا بی، بژی سوڵتانم."

پۆپەبەرز وای گوت، یەکسەر فڕی و بەرەو نزیکترین دارچنار چوو، کەفەڵی بە تۆکڵاشی ڕەقی لقێکەوە نا و وەک سەرخۆشان دەستی کرد بە خۆخوراندن.

سوڵتانی فیلەکانیش لە باخچە تایبەتییەکەی ڕۆیشتە بن ئەو دارچنارە بەرزانەی کە بەتایبەت بۆ کەفەڵخوراندن چاندرابوون، کەفەڵی بە نێوقەدی دارچنارێکی پتەوەوە نا و بەدەم خۆخوراندنەوە لە گژ فکران ڕۆچوو.

پاش تێرامانێکی زۆر پۆپەبەرزی بۆ لای خۆی بانگ کرد. سەرکردەی پەپووەکانیش لەم نێوانەدا بیری کردبووەوە.

سوڵتانی فیلەکان گوتی:

"زۆرم بیر کردەوە هاورێ. بە هیچ ئاکامێ نەگەیشتم. من بە ئێوە، بە مێرووەکانم گوت فیلن، دەبنە فیل، بەڵام نەمگوت وەک فیلەکان بخۆن، هەلمسێن و پاشان بدرێن. من بە ئێوە، بە مێروولەکانم گوت فیلن، ئەگەر کار بکەن دەبنە فیل، خۆ نەمگوت وەک فیلەکان هەنگوین، شیلەی گوڵ و کاکڵان بخۆن. وایە، من بە ئێوە و مێروولەکانم گوت فیلن، بەڵام نەمگوت وەک فیلەکان بە درێژیی ژیان کەفەڵتان بخورێنن. ئێوە هەمووتان لە فیلبووندا زۆر ڕۆیشتنە پێش. پۆپەبەرزی برا، ئێستا بۆ ئەم کارە، بۆ ئەم کاری لە ڕادەبەدەر فیلبوونە یارمەتیم بدە. تۆ کە مرۆڤەکان و گشت بوونەوەرەکان، بە مردوو و زیندووەوە دەناسی، سەدان ساڵ ئەزموونت کەڵەکە کردووە، یارمەتیم بدە، لانیکەم بۆ ئەم خۆخوراندنە."

سەرکردەی پەپووەکان گوتی:

"ناتوانم یارمەتیت بدەم. ناتوانم هیچ بوونەوەرێک لەم خووە خۆشەی فیلەکان پاشگەز بکەمەوە. چ نییە بوونەوەرەکانی تر ئەم خووە خۆزۆزش و چێژژبەخشەی فیلەکانیان نەبیستووە. ئەگەر بێت و بیبیسن، دونیا سەروژێر دەبێ."

سوڵتانی فیلەکان بە جۆشوخرۆش و ترسەوە هاواری کرد:

"ئەمان، با گوێیان لێ نەبێ!"

پاشان فەرمانە لێبڕاوەکەی ئاشکرا کرد و گوتی:

"قەدەغەم کـرد. کەفەڵخورانـدنم لە هەموویـان قەدەغە کـرد. بـڕۆ فەرمـانەکەم بە گـوێی پەپووەکانـت و مێروولەکان بگەیەنە، با هەر ئەمڕۆ، دەسبەجێ دارستان و دەوەنەجاڕ بەجێ بهێڵن. ئەگەر لە دارستان نەڕۆن، سبەی بەیانی هەموو دارستانەکان بە هەورەتریشـقە دەسـووتێنم. پەپووەکـان، پەلەوەرەکـانی تـر و مێروولەکان لە چاوتروکانێکدا دەبنە زوخاڵ."

"مەکە، بەزەییت بێ سوڵتانم..."

"دژایەتی دەکەی؟"

"نەخێر سوڵتانم."

"کەوایە یەکسـەر بەرەو وڵاتـان بفـڕە و فەرمـانەکەم ڕابگەیەنە. ئەگەر تا سبەی بەیانی کەفەڵیان لە دارەکان کردەوە، باشە، دەنا ئیتر خۆیان دەزانن."

سـەرکردەی پەپووەکـان لە ناچارییـان وێـڕای چەنـد پەپـووی تـر بەرەو دارسـتان فـڕین و گەیشـتنە لای مێروولەکان. مێروولەکان تۆپەڵ تۆپەڵ لە بن دارەکان لەسەر یەک کۆبووبوونەوە و بێ ڕاوەستان کەفەڵیان بە نێوقەدی دارەکـان و لقەکـانەوە دەخوراند. سـەرکردەی پەپووەکـان سـەرەتا بەسـەر ئەو دارسـتانە و پاشـان دارسـتانەکانی دیـکەدا فـڕی و هەموویـان گەڕا، لە سەرجەم وڵاتانی مێروولەکان هەمان شتی بینی.

ڕێک لە نێوەڕاستی دارستان، لەسەر پۆپەی بەرزترین لقـی دارێـک نیشـتەوە، لەوێـوە دەیتـوانی گشـت مێروولەکان ببینێ و گوێیان لە دەنگی بێ.

سەرکردەی پەپووەکان بە شەیپوورەکەی دەستی پێ کرد:
"هۆۆۆۆ مێروولەکان."
دوور دوور لە چیا گەردنکەشەکان زایەڵەی دەنگی بیسترا:
"دوایی نەڵێن نەمانبیست، فەرمانی سوڵتانمانە. ئەو سوڵتانەی سەرکردەی گشت بوونەوەرەکانە. سەرکردەی شێر و پڵینگان، گورگ و چەقەڵ، کەرگەدەن، کەری کێوی، مار و تیمساحەکانە. شانازی دەکەم فەرمانی سوڵتانمان، ئەو سوڵتانە شکۆدارە، سوڵتانی دونیاکان بە ئێوە ڕادەگەیەنم. پێشتریش شانازیی ئەوەم پێ براوە فەرمانی سوڵتانی مرۆڤەکان و سەرجەم بوونەوەرەکانی تر، سوڵتان سولەیمان بە بەندەکان بگەیەنم. ئێستا باش گوێم بۆ ڕادێرن، ئەی مێروولەی سەر بە ڕەگەزی بالای فیل. فەرمانی سوڵتانە، لاسای فیلە بالاکانی تر مەکەنەوە و سالّ دوانزەی مانگ کەفەڵتان لە دارەکان مەخشێنن، بە هەموو شێوەیەک ئەمە قەدەغەیە. ئێمە پێمان گوتن فیلن و دەبنە فیل، بەلام نەمانگوت ئەو کەفەڵە گچکانەتان پەیتاپەیتا بە دارەکان بخورێنن. گەر بەم ڕەنگە بڕواتە پێش، کەفەڵتان لە دارەکان دانەبڕن، کێ کار دەکا، کێ هەنگوین و شیلەی گلووکمان بۆ کۆدەکاتەوە؟ ئەگەر واز لەم خووەی فیلەکان نەهێنن، من و فیلەکان و ئێوەش برسی دەمێنینەوە. لەبەر ئەمەش،

کەفەڵەدارخشاندن و خەوتن تایبەت بۆ فیلە ڕەسەنەکانە، بۆ ئەو مێروولە فیلانە نییە کە دواتر بوونەتە فیل. ئەی مێرووە فیلەکانی بەندەم، پێداگرانە فەرمانتان پێ دەدەم هەر ئێستا واز لەم خووەی فیلەتان بێنن، کەفەڵتان لە دارەکان دابڕن و بگەڕێنەوە بۆ شارەکانتان. ئەمە فەرمانی سوڵتانە، ئەمە فەرمانی سوڵتانە، پاشان نەڵێن نەمانبیست."

مێروولەکان بە ڕادەیەک لە هۆش خۆیان چووبوون کە هیچ کامیان بچووکترین کاردانەوەیان بەرامبەر بەم بانگەوازەی سەرکردەی پەپووەکان نیشان نەدا. تەنانەت ئاوڕیان نەدایەوە و لێیان نەڕوانی.

سەرکردەی پەپووەکان یەک بە خۆی هاواری دەکرد:

"سوڵتان دەڵێ، سوڵتانی گەورەمان دەڵێ من گوتوومە ئەوان فیلن، بەڵام خۆ نەمگوتووە بە ڕادەیەک ببنە فیل کە کەفەڵیان لە دارەکان بخشێنن. نەمگوت بە ڕادەیەک ببنە فیل کە هەنگوین، شیلەی گوڵ و کاکڵان بخۆن. ئەوان فیلن، بەڵام بەقەد قەڵافەتیان فیلن."

سەرانسەری دارستان دەنگی دایەوە:

"ئێمە فیلیــــن!"

"ئێمە فیلیــــن!"

"ئێمە فیلیــــن!"

پۆپەبەرز بە شەپیوورەکەی هاواری کرد:

"ئێوە فیلین، بەڵام بەقەد قەڵافەتتان فیلن."

"بەقەد، بەقەد، بەقەد قەڵافەتمان."

"ئێمە فیلین، وەکو فیلان فیلین."

"وەکو فیلان فیلین."

"وەکو فیلەکان."

"ئێوە فیلن فیل بەڵام... سوڵتان فەرمانی بێ ئەملا و ئەولای بۆ ئێوە دەرکردووە. ئەگەر تا سبەی بەیانی کەفەڵتان لەم دارانە دانەبڕن، سوڵتان هەورەتریشقە بەسەر ئێوە، دارستان و دونیادا دەبارێنێ، هەورەتریشقە لێتان دەدا، دەتانسووتێنێ و دەبنە خۆڵەمێش. ئێوە هیچ دەزانن هەورەتریشقە چییە؟ فەرمانی سوڵتانمان بێ ئەملا و ئەولایە. کەفەڵتان لە دارەکان دابڕن."

دارستان هەمدیس دەنگی دایەوە:

"ئێمە فیلیــــن!"

سەرکردەی پەپووەکان ئەمجارە مێروولە زەردەکانی بانگ کرد. ئەوانیش لە وەڵامدا گوتیان:

"ئێمە فیلیـــن."

وەی دایە، دونیا گۆڕایە، ئێستا تەنانەت ئەو مێرووە زەردە گەلحۆ و خاین و دزێوانەش دەڵێن ئێمە فیلن.

ئەوسا ڕووی کردە پەپووی سەر چڵی دارەکان، هەموو کەفەڵیان ڕووتابووەوە، وەک ئاوێنەی لێ هاتبوو، سەیر دەهاتە بەر چاو، لەگەڵ ئەوەشدا بێ ڕاوەستان کەفەڵیان لە لقەکان دەخشاند.

"پەپووەکانم، فەرمانی سوڵتانەکەمان بە ئێوە ڕادەگەیەنم. لانیکەم ئێوە هێشتا نەبوونەتە فیل، هێشتا وەک من باڵندەن، وا نییە؟"

سەروبنی دارستان بە جارێ هاواری لێ هەستا:
"ئێمە فیلیـــن! ئێمە فیلیـــن!"
پـۆپەبەرز لەم لـق بـۆ ئەو لـق فـڕی و مێروولەکـان و پەپووەکانی دواند. نەیتوانی هیچ کامیان لە خشتە بەرێ. نەیتوانی هیچ کامیان قایل بکا کە فیل نین و نابنە فیل. جا چۆن قایلیـان بکا، خۆیشـی پۆپەبەرزی سـەرکردەی پەپووەکـان بەو بـڕوایە گەیشـتبوو کە فـیلە، ئەویـش فیلێکی بە نەخش و نیگار، جوان، بریقەدار، ڕەنگاوڕەنگ و بە بـزاوت. لە بچـووکترین دەرفەتـدا خێرا کەفەڵـی بە لقێکەوە دەنا و دەیخوراند، دەیخوراند و هاواری دەکرد:
"گوێ بە فەرمانی سوڵتان نادەن؟"
کەس فـــزەی لێـــوە نەدەهـــات. نە مێـــروولەیەک، نە پەپـوویەک. تەنـانەت مێروولەیەکـی زەردەڵەی ورديـش وەڵامی نەدایەوە.
"سبەی بەیانی هەورەتریشقە، هەورەتریشقەی سـوڵتان... هـیچ بوونەوەرێـک لە گـۆڕێ نـاهێڵێ. ڕیشـەی سـەرجەم بوونەوەرەکان وشک هەڵدەگەڕێ."
لە دارسـتان جـگە لە خشپەخشـپی خۆخورانـدن هـیچ دەنگێکی تر نەدەبیسترا.
پـۆپەبەرز، پێـداگرانە، لە کاتێکـدا قەنـاعەتی بە خۆیشـی دێنـا، دوو سـێ ڕۆژ بێوچـان قسـەی لەگەڵ مێـروولە و پەپووەکان کرد، باسی فەرمـان و هەورەتریشـقە و ئـاگر و ئـاوی کـرد، گـوتی سـوڵتان ڕەگوڕیشـەی سـەرجەم بوونەوەرەکـان دەفەوتێنـێ، گـوتی هەمووتـان دەمـرن.

بەرد دەنگی لێوە هات، مێروولەکان و پەپووەکان دەنگیان لێوە نەهات.
پاشان لەپڕێکا، لە قووڵایی دارستانەوە نووزەیەکی کپ و گڕ بەرزبووەوە:
"سوڵتانی سوڵتانەکان، سوڵتانی مە دەتوانێ هەرچی شتە لە ئێمە زەوت بکا، بەڵام ناتوانێ فیلێتیمان لێ زەوت بکا. ناتوانێ لە خۆخوراندن بێبەریمان بکا. لەم دونیایەدا جارێک بووینە فیل، ئەویش نادەین بە سوڵتان، نایدەین بە شا. بەم جۆرە تا قیامەت سمت و سۆڵمان دەخورێنین."
دوای ئەم نووزەیە دەنگی خۆخوراندن دارستانی داگرت.
سەرکردەی پەپووەکان فڕی، ئاخفی، پاڕایەوە، لالایەوە، ترسی نایەوە، بەڵام چیتر نەیتوانی تەنانەت قسەیەک لە زاری هیچ کامیان دەرکێشێ. وێڕای پەپووەکانی هاوڕێی گەڕایەوە بۆ لای سوڵتان. سوڵتان چەند ڕۆژ بوو، گوێ لەسەر زەنگ، بێ ئەوەی دەم لە خواردن و خواردنەوە بدا، بێ ئەوەی چاو لێک بنێ، چاوەڕوانی وی بوو.
خێرا پرسیی:
"چ بوو؟"
سەرکردەی پەپووەکان گوتی:
"هیچ ڕووی نەدا. هیچ. من شتی ئاوهام نەبینیوە. لەوەتەی دونیا دروست بووە، لەم سەر زەوییە دەفڕم،

ئەو هەمـووە مـرۆڤە، ئەو هەمـووە گیـانلەبەرەم بینیـوە، لەگەڵ ئەو هەموو بوونەوەرە ژیاوم، تا ئێستا شتی وام نەبینیـوە. ئەم فیلبـوونە دەبـێ چ ئیشـێکی بێـوێنە بـێ کە کەس کەفەلـی لە دارەکـان دانـابڕێ. نە مێرووڵەکـان، نە باڵنـدەکانی خۆمـان و نە مێـرووڵە زەردەڵەکـان، هـیچ کەس. وەها مەست و سەرخۆش بوون نەبێتەوە... گوتم فەرمان، گوتم ئاگر، گوتم هەورەتریشقە. چیتر و چیترم نەگـوت سـوڵتانم، گوییـان پێـی نـابزوێ. هـیچ کـام لە مێرووڵەکان و باڵندەکان تەنانەت مێش نەبووە میوانیان. بە ڕۆژان مشـتومڕم لەگەڵ کـردن تەنیـا تـوانیم چەنـد وشەیەکیان لە زار دەرکێشم. سەرەتا هەموویان وێکڕا گوتیان ئێمە فیلین، ئێمە فیلین و بێدەنگ بوون. پاشـان، ڕێک سێ ڕۆژ دواتر، گوتیـان سـوڵتان دەتـوانێ هەمـوو شـتێکمان لـێ زەوت بکـا، بەڵام نـاتوانێ فیلێتیمـان لـێ بستێنێ. ئێمە فیلین و فیل دەمێنینەوە. فیل هـاتووینەتە دونیا و بە فیلی دەمرین. گوتیان لەم دونیایەدا جارێک بـووینەتە فیـل. بەدوای ئەوەشـدا چـیم پـێ گـوتبن ئیتـر وەڵامـم لـێ نەبیسـتوونەتەوە. سـەرجەم مێرووڵەکـان و باڵنـدەکان کەڕ و لاڵ بووبـوون. تەنـانەت ئەو زەردەڵە گەلحۆیانەش..."

سـوڵتان لەپڕێکـا پرسـیارێکی چـاوەڕواننەکراوی لە پۆپەبەرز کرد:

"تۆ چۆنی؟"

مەل گوتی:

"مەپرســـە. لە ڕەوشـــی مـــن هەر مەپرســـە. کە بەدەم فـــڕینەوە لە شـــوێنێک چـــاوم بە داری، چڵـــی، پنچکـــی دەکەوێ، یەکســـەر دەنیشـــم و کەفەڵمـــی ڕێ دەخشـــێنم... ژاکاوی هیچ نیم سوڵتانم، ژاکاوی ئەوە نەبێ چۆن ئەو هەمووە ساڵە وەک فیل نەژیاوم."

سوڵتان گوتی:

"وەیش، وەیش، وەیش، وەیش، وەیش!"

مەل گوتی:

"خەفەت مەخۆ سوڵتانم، من لە وەزعی خۆم ڕازیم. ئەم فیلێتییە، ئەم فیلبوونە چ شتێکی خۆش و بێهەمپا بووە و ئێمە نەمانزانیوە سوڵتانم..."

"ئێستا ئەگەر هەورەتریشقەت تێبگرم..."

"لە فیلبوونم پاشگەز نابمەوە سوڵتانم..."

"باڵەکانت بکەم، بیانشکێنم..."

"لە فیلبوونم پاشگەز نابمەوە سوڵتانم..."

"هەردوو چاوت دەربێنم..."

"پاشگەز نابمەوە."

"هەمـــوو پەپووەکانـــت بســـووتێنم، لە دونیـــادا تەنـــانەت مەلێک، تەنانەت پەپوویەک نەمێنێتەوە..."

مەل بە شانازییەوە گوتی:

"پاشگەز نابمەوە، هەر کەسێک تـامی فیلبوونی چێشتبێ و بەم تـــامە خۆشـــە مەســـت بـــووبێ، واز لە فیلبـــوون ناهێنێ سوڵتانم. وەیوەی، فیلبوون چ خۆشە؟"

بێدەنگ بوو، تۆزێک شەرم دایگرت، پاشان بە پەلەپەل گوتی:
"کەمێک ئیزنم پێ بدە سوڵتانم."
یەکسەر بەرەو دارچنارەکە فڕی، کەفەڵی خێرا خێرا بە دارەکەدا هێنا و پاشان هاتەوە.
سوڵتان بە پێکەنینەوە گوتی:
"تێگەیشتم."
گشت ئەمانە سوڵتانیان خستە نێو بیرکردنەوەیەکی قووڵەوە. گەوجی کردبوو، ئەویش گەوجێتییەکی گەورە. چیی بە مێرووڵەکان و فیلەکان گوتبوو، پێی گوتبوون هەر کامتان فیلێکن، فیلەکان سەر بە وەچەی مێرووڵە و مەلەکانن! ئێستا دە بیخۆ دەی، چۆنت خەراپ کردووە ئاوا چاکی بکەوە...
"چ بکەین پۆپەبەرزی برام؟"
"ئەمە هیچ ڕێگەچارەیەکی نییە سوڵتانی خۆمان. هیچ ڕێگەچارەیەک... پەپووەکان و مێرووڵەکان تا هەتایە فیل دەمیننەوە."
"بەڵام خۆ ئەوان فیل نین..."
"بوونە فیل سوڵتانی خۆمان. ئەوەنێ تۆ ئەوانت کردە فیل..."
"ئاخر ئەوانمان کردە فیل، خۆمان ئەم مێرووولە وردانەمان کردە فیل، ئاخر، خۆمان کردمان، بەدەستی خۆمان چ هەرگێکمان بۆ خۆمان گرتەوە، ئاخ. ئێستا چ دەبێ؟"

"هیچ نابێ."
"تا قیامەت بەم جۆرە بەردەوام دەبێ؟"
"بەڵێ سولتانی خۆمان، لە بن دارەکان، مێروولەکان تۆپەڵ تۆپەڵ، مەلەکان پۆل پۆل بە کەفەڵی ئاوێنەئاسایان پەیتاپەیتا خۆیان دەخورێنن."
"ئەوجا ئێمە چ بخۆین، ئێمەی فیلی ڕەسەن؟ ئەوجا ئێوە چ دەخۆن، ئێوەی مەلی ڕەسەن، فیلێتیمان فێری مێروولەکان کرد، بەڵام فیلێتییەکی خراپ؛ ئەوانمان کردە فیل، بەڵام بەدەستی خۆمان ئەو لقەمان بڕییەوە کە لەسەری دانیشتبووین. لەمەوبەدوا کێ کۆشکم بۆ دروست دەکا، کێ عەمبارەکانم بۆ پڕ دەکا لە هەنگوین، شیلەی گوڵ و کاکڵ و جڕوجانەوەر، کێ؟ ئاخ، هێشتا نەمدۆزیبوونەوە لە کیسم دان، ئاخ! بێژە، سەرکردەی پەپووەکان، ئێمە چمان بەسەر خۆمان هێنا، لە ترسی مێرووە ڕدێنسووری مەندەبوور چمان بە خۆمان کرد؟ ئەم بوونەوەرە وردیلانە چ زوو بڕوایان بەوە کرد فیلن... چەند حازر بوون بۆ ئەوەی ببنە فیل. ئەمن چۆن بزانم... بەس دەمزانی، ئەمە نەریتێکی کۆنە، ئەگەر ئەوان نەکەیتە فیل، هەڵبەت فیلی ڕاستەقینە نا و مێروولەبوونیان لە بیر نەبەیتەوە، ناتوانی بۆ هەتاهەتایە بەزۆر لەژێر فەرمانی خۆتدا بیانهێڵیتەوە. ئەمە لە مرۆڤەکانەوە فێر بووم. پێم وا بوو هەرچی دەیکەن باشە، دە فەرمووو بزانە چ بەڵایەکم بەسەر خۆم هێنا، بەڵایەکم بەسەر خۆم هێنا ئەمما بەڵا! گوللەکە بازرەی

کرد. ئەمن دەمگوت مێروولەبوونیان لە بیر بەرمەوە... ئاخ، بەدەست ئەم مرۆڤانەوە، ئاخ!"

سەرکردەی پەپووەکان گوتی:

"فێڵبازن. ئەو مرۆڤانە زۆر فێڵبازن. زۆر لەگەڵیان ژیاوم، لە نزیکەوە دەیانناسم."

"دەی ئەوەش ئاکامەکەی. مێروولەکان بوونە فیل و بە جارێ لە کیسم چوون."

"لە کیس ناچن. ئەگەر مرۆڤەکان بە مێروولەکانیان گوتبێ ئێوە فیلن، بە درێژایی سێسەد ساڵ بە شەپوورلێدان مێروولەکانیان بەو بڕوایە گەیاندبێ کە ڕۆژێک دەبنە فیل، ئەوا حیکمەتێکی تێدایە."

سوڵتان پرسیی:

"بەڕاست؟"

مەل گوتی:

"حیکمەتێکی تێدایە."

سوڵتان گوتی:

"کەوایە با بیر بکەینەوە."

مەل گوتی:

"باشە. جارێ من با بڕۆم لەسەر ئەو لقە بنیشمەوە و کەفەڵم باش بخورێنم. کەفەڵم نەخورێنم بیرم بۆ ناکرێتەوە سوڵتانم."

سوڵتان گوتی:

"سەیرە. منیش هەر وا. دە بڕۆ خۆت بخورێنە و وەرەوە. نا، نا، ڕاوەستە، وەرە لەسەر دارەکەی من

بنیشە، تۆ لە سەری خۆت بخورێنە و من لە خواری.
خۆمان دەخورێنین و بیر دەکەینەوە، باشە؟"
پۆپەبەرز گوتی:
"زۆر باشە."
لە خوارەوە سوڵتان کەفەڵی بە نێوقەدی درەختەکەوە لکاند و لە سەریش پۆپەبەرز پاشەڵی بە لقی دارێکەوە نا و بێ ڕاوەستان خۆیان خوراند.
پاش قەدەرێکی زۆر، لەپڕێکا سوڵتان لە خۆشیان قیژەیەکی لێ بەرز بووەوە، مەلەکەی بانگ کرد و گوتی:
"خێرا وەرە، خێرا کە."
مەلەکەش دەسبەجێ لە سەری ڕا بەرەو خواری فڕی.
"فەرموو سوڵتانم."
سوڵتان گوتی:
"تەواوە. چارەسەر بوو. هیچ پێویست نەبوو ئەو هەمووە خۆمان تێک بدەین."
"چۆن؟"
"ئاخۆ مێروولەکان لە عەمباری شارەکانیاندا خواردەمەنییان هەیە؟ هەرچی خواردەمەنی هەبوو بۆ منیان نەهێنا؟ لەم ماوەیەدا بە کاری کۆشک و کورسییەوە مژوول نەبوون؟ چما کاتیان بۆ مایەوە خواردەمەنی بۆ خۆیان کۆ بکەنەوە؟"
مەل گوتی:
"نەخێر. لە عەمبارەکانیان تەنانەت تۆسقاڵێک خواردەمەنی دەست ناکەوێ."

"جارێ هیچ، هێشتا برسی نین. لێرەولەوێ، کەمێکیش بێ خواردنیان چنگ دەکەوێ. ئەگەر زستان هات و بەفر باری، ئەگەر زستان داهات و لە دونیا دەعبا و گوڵ و گەنم و کاکڵ شک نەبرا..."
مەل گوتی:
"ئەگەر هیچ شک نەبرا، چی دەکەن؟"
"برسی دەمێننەوە چی دەکەن، کە برسییش بوون تێدەگەن فیل نین و بە بیریان دێتەوە مێروو و مەلن، ئەوسا کە بینییان لە برسان بە لادا دێن، دێنە لام و داوای خواردەمەنی دەکەن... ئەمنیش..."
مەل زەندەقی چوو و پاڕایەوە:
"ئەگەر من بەردەوام کەفەڵم بخورێنم و بۆ هەمیشە فیل بمێنمەوە، کارت پێم نابێ، وا نییە؟"
"کارم بە تۆ نییە، ئەوەندەی پێت خۆش بێ خواردنت پێ دەدەم. تۆ بە کەیفی خۆت کەفەڵت بە دارەکان بخورێنە، تۆ فیلی."
"ئەی مەلەکانم؟"
"ئەوانیش بڕێک فیلن."
سەرکردەی پەپوولەکان بە جۆشوخرۆشەوە هاتە گۆ:
"تەواوە. بڕێک فیلێتی بۆ ئەوان بەسە. ئەی سەبارەت بە مێرووە زەردەکان دەڵێی چی سوڵتانم، خۆ ئەوان لە مێروولەبوون هاتوونەتە دەرێ، ئەگەر وازیان لێ بێنین و لە فیلبوون بێبەرییان بکەین، لەم ناوەدا بە هەڵپەسێراوی دەمێننەوە."

"ئەوانیش با کەمێک فیل بن و لەساڵدا مانگێک وەک مەلەکانی تۆ کەفەڵیان بخورێنن، باشە؟"
سەرکردەی پەپووەکان بە کەیفخۆشی گوتی:
"باشە."
لە خۆشیان لەم لق بۆ ئەو لق دەفڕی و هەر جارەو لەسەر یەکیان دەنیشتەوە.
"تۆ دەتوانی بە درێژایی ساڵ بێوچان، لە فیلێکی باش زیاتر، تەنانەت لە من زیاتر کەفەڵت بخورێنی."
"بێقەزا بی، هەر بمێنی سوڵتانم. ئێستا ئەگەر زستان هات و مێروولەکان برسی مانەوە..."
سوڵتان گوتی:
"با چاوەڕێ بکەین. با لە خوراندنی کەفەڵیان پاشگەز نەبنەوە، دەیانبینم بە خۆیان و بە کەفەڵیانەوە..."
زستان هات، بەفر دایکرد، مەل و مێروو هەر وا لە دارستان بێ ئەوەی وەڕەز و ماندوو بن، کەفەڵیان لە دارەکان دەخشاند. سەرکردەی پەپووەکانیش چەند ڕۆژ جارێک لە کۆشکی سوڵتانەوە بەرەو وڵاتی مێروولەکان و دارستانەکان دەفڕی و بێ ئەوەی قسەیان لەگەڵ بکا، لە سەرەوە لە دارستانەکانی دەڕوانی و دەگەڕایەوە بۆ کۆشک، لەوێ، هەرچی بینیبووی بە وردەکارییەوە بۆ سوڵتانی دەگێڕاوە. سوڵتانیش بە سەبرەوە چاوەڕوانی ڕۆژی وادە بوو.
مێروولەکان لەسەر ئەرز و مەلەکان لەسەر لقەکان لەپڕێکا بۆیان دەرکەوت لە سەرمان هەڵدەلەرزن و

برسـيـيانه. باڵنـدەكان يەكسـەر بەرەو هێلانەكانيـان هەڵفـڕين، خـواردەمەنيى نێـو عەمبارەكانيـان خـوارد كە سـوڵتان پێى دابـوون و نـوقمى خۆشـى و سـەفا بـوون. مێروولەكانيش پێشان حەپەسان و پاشان وەجموجـووڵ كەوتـن، سـەريان لەمـلا و لەولاى دارسـتان دا، گەڕان، وەك ئەوەى تازە لەدايك بووبن، بۆنيـان بە سروشـتەوە كـرد. بە دارەكانـدا هەڵزنـان، پێيـانەوە لكـان، بۆنيـان بە گەلاكانەوە كرد، لە كاتێكدا سمێڵەكانيان لێك دەخشـاند، تێروتەسـەل پێكەوە دوان، تێگەيشـتن برسـى و بێچـارە لەو ناوە ماونەتەوە. مێروولەكان چەند ڕۆژێ پۆل پۆل لە دارستان گەڕان و دۆش دامان.

برسێتى وا گوشارى بۆ هێنابوون كە ئيتر نە فيلبوونيـان بە خەياڵدا دەهـات و نە كەفەڵبەداردەهێنـان. پيـر و منداڵ لە برسان نەيدەتوانى ڕێ بكا.

مێروولەكان هەر وا حەپەساو و دۆشداماو بوون تا ئەو كاتەى مێروولە سەيرەكە خۆى تێهەڵقورتاند و پرسيى:

"هۆ هاوڕێيان، ئێمە پێش ئەوەى ببينە فيل، ولات، شـار، ماڵ و حاڵمان نەبوو؟"

مێروولەكان گوتيان:

"هەمانبوو."

"ئـێ باشـە بەر لەوەى ببيـنە فيـل لە شـارەكانمان خواردەمەنيمان نەبوو؟"

مێروولەكان گوتيان:

"هەمانبوو."

"کەوایە بـۆچی چەنـدین ڕۆژە لەم دارسـتانەین و بە دەوری خۆماندا دەسووڕێینەوە؟"
مێروولەکان گوتیان:
"هەر بەڕاست بۆچی لەم دارستانە بن بەستە بە دەوری خۆماندا دەسووڕێینەوە؟"
"کەوتووینەتە دارستانێک ڕێی دەرچوونی دیار نییە..."
"دەنووین و دەنووین و ڕۆژ دیار نییە..."
"دەی کەوایە با بەرەو وڵاتەکانمان ببینەوە."
مێروولەکـان لە دارسـتان، دەشـت، شـاخ، گـردۆڵکە و نەواڵەکـانەوە وەک لافـاو بەرەو وڵاتەکانیـان شـۆڕبوونەوە. بە ڕۆژ و هەفـتە ڕێیـان بـڕی. کە گەیشتنەوە شـار و ماڵەکانیـان، یەکەم شـت پەلامـاری عەمبارەکانیـان دا، بەڵام چ ببیـنن باشـە، بینینـان گشـت عەمبارەکـان بەتـاڵن، لە عەمبـاری هـیچ شـار و وڵاتێکدا تەنانەت تۆسقاڵی خواردەمەنی دەست ناکەوێ.
"ئەی هاوار چ بەسەر خواردەمەنییەکانمان هاتووە؟"
مێروولە قەڵافەتسەیرەکە پێکەنی:
"هەی گەوجیـنە، هەی بێئەقڵیـنە، هەی برادەرانـی مێـروولەی مێشـک لە نـاوکەهەنجیر بچـووکترم، قەت دەزانن لە کەیەوە خواردەمەنی بۆ خۆمان کۆناکەینەوە؟ هەموو هێز و توانای خۆمـان بۆ دروسـتکردنی کۆشـک، دەرهێنانی بەردی ئەڵماسی شین لە نێوەڕاستی ئەرز و داتاشـینی کورسـی نەخسـتە گەڕ؟ هەی مێـروولە فەرامۆشکار و بێمێشکەکانی برام، بۆ ئەو خـواردەمەنییە

خۆشـانەی لە چـوار قـوڕنەی دونیـا کۆمـان کـردنەوە بـۆ عەمبارەکانی سوڵتانمان نەگواستنەوە؟ ئێستا عەمبارەکانی سوڵتان لیپاولیپن لە خواردەمەنی، وا نییە؟ وەها بە عەشـق و شـەوقەوە خواردەمەنییەکـانی سـەر ڕووی زەویمـان بـۆ سـوڵتانمان کـۆکردەوە کە ئەگەر سـوڵتانمان، فیلەکـان و باڵندەکان بیانخۆن، ئێمە و سـەرجەم بوونەوەرەکانی دونیا بیـانخۆین، ئەوا خواردەمەنییەکانی ئەو عەمبارانەمـان بە دە ساڵیش بۆ تەواو نابێ."

مێروولەکان گوتیان:

"دەی ئێستا چی بکەین؟"

ئینجـا سـمێڵیان لە سـمێڵی یەکتـر خشـاند و مـاوەیەکی دووردرێژ پێکەوە قسەیان کرد.

لە شـارەکان، برسـی و تینـوو، نەیـدەزانی چ بـکەن، بێوچـان سـمێڵەکانیان لە سـمێڵی یەکتـری دەخشـاند و دەسووڕانەوە. سەرکردەی پەپوولەکان لەو ناوە نـابینرێ و بچـووکترین هەواڵ لە سوڵتانی فیلەکـانەوە نـایە. لەو شـار و وڵاتە پانوبەرینـانە بە تـاقی تەنیـا وەکـو بەردی بنـی چاڵیـان لـێ هـاتبوو. زۆربەی هەرە زۆری بەسـاڵاچووەکان لەسـەر جـێ کەوتبـوون، یەک لەسـەر سێ دەئاوسان و دەمردن.

ئـاخرییەکەی دیسـان مێـروولە قەڵافەتسـەیرەکە خـۆی تێهەڵقورتاند و گوتی:

"ئەرێ هاوڕێیـان، لێـرە ئـاوا دەسـت لەسـەر دەسـت دادەنێن و چاوەڕێ دەبن لە برسـان یەکە یەکە بمـرن؟

ئاوا بڕوا ئەم زستانە تەنانەت مێروولەیەکیش لەسەر گۆیی زەوی زیندوو نامێنێتەوە."
گەورە و ڕیشسپیی مێروولەکان گوتیان:
"شتێک هەیە بکرێ ئەی مێروولەی قەلافەتسەیر؟"
مێرووی قەلافەتسەیر گوتی:
"با بیر بکەینەوە. بەشکم لە شوێنێک هەندێک شت بدۆزینەوە، سکمان تێر بکەین و لە برسان نەمرین."
گەورەی مێروولەکان گوتیان:
"بەم زستان و قیامەتە کە سەرانسەری دونیا بەفر دایپۆشیوە، لە کوێ خواردەمەنیمان بۆ دەدۆزرێتەوە؟"
"با تاقیی بکەینەوە، بەشکم لە شوێنێک هەندێک شت بدۆزینەوە. بەشکم شوێنێک بدۆزینەوە بەفری لێ نەبارییێ، عەمبارەگەنمێک، نانەواخانەیەک، دەرگایەکی کراوە یان سیلۆیەک... ڕەنگە مەخزەنێکی خواردەمەنیی لەبیرکراو کە لە باب و باپیرمانەوە جێ ماوە... بەشکم، بەشکم، بەشکم... کام شەوتان بینیوە ڕۆژی بەدوادا نەهاتبێ... دەی هاوڕێیانی مێروو، با بیر لە ڕێگەکانی دۆزینەوەی خواردەمەنی بکەینەوە. با بڕۆین و بگەڕێین، دۆڵ و شاخ و دەشت بپێوین، کوڵ نەدەین، با بزانین چ دەبێ، قیرۆسیا، دەی..."
گەورەی مێروولەکان پاڵیان بە دیوارەوە دا و بیریان کردەوە، سەریان بۆ ناو کۆشیان بەرداوە، ڕیشەکانیان بە قامکیان شانە کرد و لە گژ فکران ڕا چوون، سێ ڕۆژ و سێ شەو نەنووستن و بیریان کردەوە.

"لێــــره، لەبــــری ئەوەی لەم شـــــارانە چـــاوەڕێ بــــین، بەتاڵوحەتــاڵ بســـووڕێینەوە و بمــرین، باشــتر وایە بەم زستانە قیامەت ئاسایە بکەوینە ڕێ و بەدوای خواردندا بگەڕێــین"، گەورەی مێروولەکــان وایــان گــوت و ملــی ڕێگەیــان گــرت. مێروولەکــان لەســەر بەفــری سـپی لە ڕۆژهەڵاتەوە بــۆ ڕۆژئــاوا و لە باشــوورەوە بۆ بــاکوور، ڕیــزی دووورودرێژیــان پێـک هێنــابوو، لەســەر بەفــری بێکۆتایی قەتارەیان بەستبوو. گەیشتنە پشت چیای قاف، گەیشــــتنە دەشــــتەکانی ئاســـیا، ئەنادۆڵیـــای بەپیـــت، چووکووورئۆڤــا، میزۆپۆتامیــا و کەنارەکــانی نیــل. بە حــوکمی ئەو خــودایە لە هــیچ کــوێ خواردنیــان چنــگ نەکەوت. گەلەک مێـــروولە لە بـــن بەفـــردا نێـــژران، مێروولەیەکـی زۆر لافــاو بــردی، مێروولەیەکـی زۆر بە هــۆی نەخۆشـــیی تەشـــەناکەر لەنـــاوچوون. کاتێــک گەڕانەوە بــۆ وڵاتەکانیــان، مێروولەکــان یەک لە ســێی هاوڕێکانیــان لەدەســت دابــوو. ئەوانەیــش وا مــابوونەوە، بێچارە و پەرێشان و سەقەت بووبوون. لە برســان ڕەق و ڕەواڵە بووبــوون. لە ڕقــان وەهەناســەبڕکە کەوتبــوون و هێنــد تــووڕە بــوون دەیانویســت دونیــا بــڕوخێنن و ئاگری بدەن.

بەردەوام ســـمێڵیان لە ســـمێڵی یەکتـــری دەخشــــاند و بۆنیان بە یەکەوە دەکرد و پێکەوە دەدوان:

"هەهەهە، ئێمە بووینە فیل، فیل!"

"هەی بێئەقڵینە، بۆ مێروولە دەتوانێ ببێتە فیل، هەی مێروولەی بێئەقڵ!"

"پێمان وا بوو فیلین و بووینە مەسخەرەی سەرجەم بوونەوەرەکانی دونیا."

"وەکو فیلەکانیش کەفەڵمان لە دارەکان دەخشاند..."

"کەفەڵمان خوراند و بووینە مەسخەرە."

"جا وەک فیلەکانیش سکمان هەڵمساند، قۆرتمەکانمان درێژ کردەوە و وا بە فیز و ئیفادەوە ڕێمان دەکرد هەر مەپرسە..."

"خۆیشمان بە ئەژدادی ڕاستەقینەی فیلەکان لەقەڵەم دا."

"ئاخ، لە ئێمەی مێروولەی مەسخەرە... هەر بەڕاست پێمان وابوو بووینەتە فیل!"

"ئەو بەسوڵتانبووە زگزلە گاڵتەی پێمان دەکرد."

"ئەو سوڵتانە گوێ پێمەڕەیە."

"ئەو سوڵتانە مێشاوییە قونسوورە."

"قۆرتم قوڕاوی."

"چاودوگمە."

"لووت گڵخۆرکە."

"کلکەمار."

"تەوێڵ هەڵتۆقاو."

"ئەو قەڵپوقۆڕە."

"قاچ خواروخێچ..."

"بووینە فیل، فیل!"

"ئێمەی مێروولە بووینە فیل."

"وەک فیل خۆمان هەڵمساند و هەڵمساند تا ئاوامان بەسەر هات."
"دانەڕزاین و دوانزە مانگی ساڵ هەوڵمان دا لەو فیلە قیزەوەنانە بچین."
"بووینە فیل فیل و ئەوەی دەبوو بیبینین بینیمان."
قسەوباس، جارجار بە گاڵتە، جارجار بە تانە و جارجارەش بە ڕقەوە بەردەوام بوو. هەر لە ئێستاوە، مێروولەیەکی زۆر بووبوونە مێرووی ڕدێنسوور، شار و وڵاتەکەیان جێ هێشتبوو، سۆراغیان نەمابوو و بۆ لای مێرووە ڕدێنسووری ئاسنگەر ڕایان کردبوو.
لە کاتێکدا مێروولەکان لە برسان و لە سەرمان نەخۆش دەکەوتن و دەمردن، مێروولە زەردەڵەکان نوقمی خۆشی و شادی بوون، سکیان تێر و پشتیان قایم بوو، عەمباری سوڵتان لە ژێر فەرمانی ئەوان دابوو، لە بەختەوەرییان شێت و دێوانە بووبوون، بۆ خۆیان لە شار و وڵاتان دەگەڕان. ڕۆژ بە ڕۆژیش ڕووداوگەلی شارەکان و وڵاتانیان بە گوێی سوڵتان دەگەیاند.
"وەی بابەڕۆ وەی، تۆ سەیری ئەم مێروولانە کە... تۆ سەیری ئەم گەمژە و بوودەڵانە کە، تۆ بڵێی خۆیان پێ چی بێ!... مێروولەکان، سەرەتا خۆیان بە فیل دەزانی، بۆی هەیە ئێستا پێیان وا بێ پڵینگن، هەی لەم بوودەڵانە! نیشانتان دەدەم. فیلێکتان بۆ دەنێرم، هەزار شارتان لە تەک خاکدا یەکسان دەکا. هەی بوودەڵانە، توخوا تۆ سەیری ئەمانە بکە..."

هەمـــوو جـــارێ کە ســـوڵتان هەواڵێکـــی لە وڵاتـــی مێرووڵەکانەوە پێ دەگەیی، لە ڕقـان ددانـی لە چیرِەوە دەبـرد، لە کۆشـکێ بە دەوری خۆیـدا دەسـووڕا. وەک ئەوەی کێردیان لە گۆشتی ڕۆ کردبێ، هاواری دەکرد.

"دەڵێن چی؟"

"پێت ڕادەبوێرن سوڵتانم."

"دەڵێن چی؟"

"دەڵێن کلکەمار، چاودوگمە، بوودەڵەی کوێر، سوڵتانم."

"ئادەی سـەیری کلکم بکە، هۆ سـەرکردەی پەپووەکان، هیچ شێوەی مار دەدا؟"

"هیچ وێ ناچێ سوڵتانم، درۆ دەکەن."

"لە چاوەکانم بڕوانە."

"چاوەکانت شێوەی چاوەکانی ئاسک دەدا، سوڵتانم."

"کەواتە درۆ دەکەن، بوختانم پێ دەکەن، ها؟"

"بوختانت پێ دەکەن."

"بۆچی، من چیم لەو نمەکنەشناسانە، لەو ناکەسبەچانە کـــردووە؟ مـــن فیلێتـــیم بە هەر کـــام لەوان نەدا، بەو بێناموسانە؟"

"پێت دان سوڵتانم؟"

"ئەگەر وا بێ چییان دەوێ؟"

"برســێتی وڕ و کاســی کــردوون، ئەقڵــی لەســـەردا نەهێشتوون، ترسی مردن لە برسان شێتی کردوون."

"مێرووڵەیەکی زۆر بە برسێتی مردووە؟"

"بەڵێ... ژمارەیەکی زۆر مێروولە لە برسان مرد، بە نەخۆشی تەشەناکەریش گەلێک تێدا چوون سوڵتانم."
"با بمرن، سەرکردەی پەپووەکانی برام. خۆ وەچەی مێروولە لەسەر زەوی کۆتایی نایە... ئەوەندە زۆروزەوەندن بۆ پێت وایە بە مردن کۆتاییان دێ؟"
"کۆتاییان دێ سوڵتانم."
"ئەوە دەڵێی چی ئەی پۆپەبەرزی برام، هەموو شتێک لەم دونیایە تەواو دەبێ، مێروولە نەبێ. مێروولە گەلێ زۆرن و دونیا پڕە لە مێروولە. ئەو هەموو مێروولەیە قەت بە مردن تەواو دەبن؟ بڕوانە، یەک دەمرێ، هەزار لەدایک دەبن..."
"ڕاستە سوڵتانم، یەک دەمرێ و هەزار لەدایک دەبن، بەڵام بەم قاتوقڕییە، ئەگەر بە ملیۆنان مێروولەش لەدایک بن، هێشتا بەرگە ناگرن و تەواو دەبن."
"ئەمان، ئەوەم لەگەڵ مەکە پۆپەبەرزی برام، من چۆن لەم دونیایەدا دەتوانم بێ مێروولە بژیم؟ مێروولە نەبن، کێ ئەم خواردنە خۆشانە، ئەم هەنگوین، گوڵ، کاکڵ و شیلەی گیایانەم بۆ کۆدەکاتەوە، کێ، کێ؟ ئاااای مێروولەکانم، عەبدە قارەمان و بەتواناکانم. ئاااای!"
سوڵتان ئاخێکی وای هەڵکێشا کە دەنگی لە سەرجەم ولاتانی مێروولەکان بیسترا:
"واای، واای... واای مێروولە عەبدەکانم، وااای!"
پۆپەبەرز بۆی سەندەوە:
"وای."

سوڵتان گوتی:
"بڕوانە. من لە هەموو ئەو تاوانانە خۆش دەبم کە ئەوان بەرامبەر بە من ئەنجامیان داوە، بەڵام قەت لەوانە نابوورم بوونەتە ڕیشسوور و لە چیاکانیان داوە. گوێم لێ بگرە پۆپەبەرزی برام..."
"گوێم لێتە سوڵتانم."
"من لەم ڕیشسوورانە دەترسم، بەڵایەکم بەسەر دێنن."
"مێروولەکان ئەوەندە بچووکن کە ئەگەر سەرجەم مێروولەکانی دونیاش ببنە ڕدێنسوور، دیسان هیچیان پێ ناکرێ..."
"دەزانم، دەزانم پۆپەبەرزی برا، ئەم بوونەوەرە وردانە هیچیان لەگەڵ فیل، ئەم فیلە زەبەلاحە پێ ناکرێ، بەڵام ئادەمیزاد چیی گوتووە، ئەو ئادەمیزادەی چەندەش گەمژە بێ ئەوەندە ژیرە، چیی گوتووە؟"
سەرکردەی پەپووەکان پرسیی:
"چیی گوتووە؟"
"دەڵێ دوژمنت مێروولەش بێ، بە بچووکی مەبینە. دەزانم مێروولەکان تا قیامەت لەژێر ئەمر و فەرمانی مندا دەمێننەوە و هیچ ناکەن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش نابێ دەرفەت بەم ڕیشسوورانە بدرێ. کێ چ دەزانێ، دەبێ قامکمان لەسەر پەلاپیتکە بێ. فەقیرانە، ئەوەندە بچووک و وردن کە..."
بێدەنگ بوو، بیری کردەوە، لەناکاو قۆرتمەکەی بەرز کردەوە و گوتی:

"سەیر کە پەپووی برا. باش گوێم لێ بگرە، لەم دونیایەدا نابێ هیچ بوونەوەرێک بزانێ من لە مێروولە ڕیشسوورەکان سڵ دەکەمەوە. ئەگینا پێم ڕادەبوێرن و دەبمە بنێشتەخۆشکەی سەر زاران. ئەمان ها، با هیچ مێروولەیەک، هیچ بوونەوەرێک نەزانێ من بە گژ ڕدێنسوورەکان داچووم."

"کەس نازانێ سوڵتانم."

"من لە دونیادا لە هیچ بوونەوەرێک سڵ ناکەم. ئەوەی ڕاستی بێ من تەنانەت لە شێر، پڵینگ، تاژپڵینگ، ماری بووا و مرۆڤیش ناترسم."

"دەزانم، سوڵتانم، دەزانم ناترسی."

"من ئەگەر تووڕە بم، هیچ بوونەوەرێک لە دونیادا ناتوانێ پێشم پێ بگرێ."

"ناتوانێ پێشت پێ بگرێ سوڵتانم."

"لەگەڵ ئەمەشدا ئەم ڕدێنسوورانە لەناو دەبەم و تەناهی بۆ دونیا دەگەڕێنمەوە. لەژێر سایەی سوڵتانێتیی مندا هیچ بوونەوەرێک دوژمنایەتی بوونەوەرێکی تر ناکا. کەچی ئەم ڕدێنسوورانە دوژمنی منیشن، وا نییە؟"

"دوژمنتن سوڵتانم."

"هیچ ڕیشسوورێک لەم دونیایەدا نامێنێتەوە. ڕەگوڕیشەی ڕیشسوورەکان وشک هەڵدەگەڕێنم. بێجگە لە من، کەس بۆی نییە وشەگەلی یەکسانی، ئازادی و ئاشتی بێنێتە زمان. لەژێر سایەی سوڵتانێتی مندا، کەس وەک ئەم ڕیشسوورانە کەسێکی تر ناچەوسێنێتەوە.

ئەوانەی دونیایـــان کــردووەتە بەنــدیخانە، ئەوانەی لەم دونیایەدا دوژمنی ئازادی، یەکسانی، ئاشتی و برایەتین، ئەو مێرووە سوورە سـووکوچرووکانەن. ئەو مێـرووە ڕدێنســـوورانەن ئێرەیـــی بە فیلبـــوون و ئاکـــارفیلی مێروولەکـان، واتە هاوڕەگەزەکـانی خۆیـان دەبەن و بە هـۆی فیلبـوونی مێروولەکـان لە داخـان خەریـکە شـێت دەبـــــن، چـــــونکە ئەو مێـــــرووله ڕدێنســــــووره سووکوچرووکانە قەت نابنە فیل. لەبەر ئەمەشە دوژمنی ژیـان، مێروولەکـان، فیلەکـان، دونیـا و هەمـوو شــتە جوانەکـانی دونیا و تەنـانەت دوژمنـی منیشـن. ئەمنیش لەم دونیایەدا بواری ژیانیان پێ نادەم. دەیانکوژم، هەر هەموویـان دەکوژم. سـەیر کە سـەرکردەی پەپووەکـان، تـۆ کەسـێکی سـارد و گەرمـی ڕۆژگـارت چێشــتووە، تەمەنێکـــت بەســـەر بـــردووە، ئەگەر ئەم مێـــروولانە هەموویـان ببـنە ڕدێنسـوور، هیچیـان لەدەسـت نـایە، وا نییە؟ ببـنە ئـاگریش هەر بەقەد جێقـوونی خۆیـان ئـاگر دەنێـنەوە. میلیۆنێـک مێـروو لەسـەر یەک کـۆببنەوە بە ئاسـتەم بەقەد پێـی فیلێکـی منیـان لـێ دێ، کەوایە مـن بـۆچی دەبـێ لە مێـرووە عەبـدەکانم سـڵ بـکەمەوە؟ هەڵچـــووم و چیـــی وای نەمـــابوو وەچەی ســـەرجەم مێروولەکــان لەســـەر ڕووی زەوی بســـڕمەوە. ئەمـــن، ئەمن، ئەمـن لە مێروولەکـان ناترسـم. ئەوان دەبـنە فیـل، دەبنە فیل و لەژێر دەسـەڵاتی ئازاد، یەکسـان و فیلێتیی

مندا بەختەوەر دەژین. بەختەوەرترین بوونەوەرەکانی دونیا کێن؟"
"مێروولەکانن."
"ئەو بوونەوەرانەی لە دونیادا هەرە ئازادن و بە یەکسانی دەژین، کێن؟"
"مێروولەکانن."
"ئاشتیخوازترین بوونەوەرەکانی دونیا کامانەن؟"
"کێ بێ جگە لە مێروولە."
"زۆر لەو مێروولە ڕیشسوورە سووکانە تووڕە بووم و زۆری نەمابوو سەرجەم مێروولەکانی بەندەم لە ڕووی زەوی بسڕمەوە... ئێستە بەندەکانم لە چ دۆخێک دان، خێرا بڕۆ، بگەڕێ و چاو بگێڕە، بزانە ولاتەکانی مێروولەکان لە چ دۆخێک دان و ئاگادارم بکەوە."
"بان سەرم سوڵتانی خۆمان."
سەرکردەی پەپووەکان وێڕای پەپووەکانی هاوڕێی بەرەو ولاتی مێروولەکان لە شەقەی باڵی دا، کە گەیشتە جێ چ ببینێ، بشێوی، هەژاری و برسێتییەک کە مەپرسە. دۆخەکە وا لە تابشت بەدەر بوو کە تەنانەت پۆپەبەرز سەرەڕای ئەو تەمەنە زۆرە و بینینی ئەو هەمووە کارەسات و کوشتوبڕ و نەخۆشی تەشەناکەرە، زۆری نەمابوو بنیشێ و هۆن هۆن بگری و بە باڵەکانی فرمێسکەکانی چاوی بسڕێتەوە.
بە دڵێکی خوێنینەوە گەڕایەوە بۆ لای سوڵتان.
سوڵتان پرسیی:

"ئەوە چییە، چیت بەسەر هاتووە برام، سەرکردەی پەپووەکان، هەردوو چاوم، چ بووە؟ شتێکت بەسەر هاتووە. قەت پێم خۆش نییە لەم دۆخەدا بتبینم."
پۆپەبەرز نیشت و گوتی:
"مەپرسە. ماڵوێران بووین سوڵتانم، مێروولەکان تێدا دەچن. ئاااخ، ئێمە ئیدی مێروولەی ئاوا، دۆستی ئاوا، ئەو بوونەوەرانە جارێکی دی لە کوێ بدۆزینەوە کە بە دونیادا دەگەڕان و خواردنی تایبەتیان بۆ کۆدەکردینەوە و ئاشقی یەکسانی، ئازادی و ئاشتی بوون، ئاااخ! دەمرن، یەکە یەکە دەمرن لە برسان."
سوڵتان دیسان هاواری کرد:
"وەی، وەی!"
هەرچی مێروولەیە گوێی لەم ئاخهەڵکێشانە بوو و زانیان سوڵتان ئەم ئاخەی بۆ ئەوان هەڵکێشاوە، بۆیە خۆشییان لە دڵدا گەڕا.
"وەی، وەی، وەیش! باشە ئەم مێروولە گەمژانە قەت ئەوەیان بە ئەقڵ ناگا بێنە لام و داوای خواردەمەنیم لێ بکەن؟"
"کێ چووزانێ، ڕەنگە ئەقڵیان پێ بشکێ و شەرم بکەن. مێروولەکان کەسانێکی زۆر وردبینن. ڕەنگە بیریان لەوە کردبێتەوە چۆن داوای خواردنێک لە سوڵتان بکەین کە خۆمان بۆمان کۆ کردووەتەوە."
سوڵتان پێکەنی و گوتی:

"برسیێتی فیکری ورد و مورد به هیچ بوونەوەرێکەوە ناهێڵێ. برسیێتی نەک هەر من، بگرە باوکی خۆیشی ناناسێ. بڕوانە، ئیستێک بگرە، ئەگەر دۆخەکە بەم جۆرەیە کە تۆ دەڵێی، ئێستا سوپای مێرووڵەکان لەبەر دەرکی سەرا کۆبوونەتەوە."
هێشتا قسەکەی تەواو نەکردبوو، سەرکردەی پەپووەکان باڵی گرت، سەری لە مەیدانەکە دا، گەڕایەوە و گوتی:
"حەق بە تۆیە سوڵتانم، مەیدانەکە لە مێرووڵە جمەی دێ. لە تەنیشت و چواردەوری کۆشک مێرووڵە شەپۆلان دەدەن..."
"با بڕۆینە دەرەوە، دەبێ لەگەڵ مێرووڵەکانی بەندەم قسە بکەم."
چوونە دەرێ، ئەو مێروولانەی لە مەیدانەکە کۆبووبوونەوە فزەیان لێوە نەهات، دەتگوت مردوون، دەنگ لە بەرد بهاتایە لەوان نەدەهات.
سوڵتان چووە سەر ئەو تاشەبەردەی لە لای سەرەوەی مەیدانەکە هەڵکەوتبوو و دەستی کرد بە ئاخافتن. بیروبۆچوونەکانی ڕاشکاوانە بۆ ئەوان دەربڕی. بەتایبەت جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە ئەوان بە بارستایی مێرووڵە دەبنە فیل. سەروبنی هەموو قسەیەکی ئەم ڕاستییە لەمێژینەیە بوو. پەیتاپەیتا دووپاتی دەکردەوە. مێرووڵەکان، ئەم ئاپۆرا

مەترسیدارە متەقیان لێوە نەدەهات. تەنانەت لە جێی خۆیان نەدەجوولانەوە.
سوڵتانیش بە ڕق و توورەییەوە لەسەر یەک دەئاخفی. قسەی کرد و قسەی کرد، تا دواجار ماندوو بوو. لەوانەشە مێروولەکان گشتیان مردبن. گومانێکی تاڵ بەسەر هەناویدا زاڵ بوو، چەمایەوە و دانیشت.
"مردوون، مردوون؟"
دەنگی چیاکانی وەلەرزە هێنا، بەڵام دیسان مێروولەکان فزەیان لێوە نەهات.
سەرکردەی پەپووەکان بۆ نێو گوێچکە بایەوانئاساکەی فڕی و گوتی:
"گوێ بگرە سوڵتانم."
"چ بووە؟"
"گوێ ڕادێرە دەنگێ لە مێروولەکانەوە دێ."
"منگەمنگێکم گوێ لێیە. دەڵێن چی؟"
"گوێ بگرە سوڵتانم، گوێ بگرە. هێدی هێدی دەنگیان بەرز دەکەنەوە."
"گوێم لێیە، گوێم لێیە..."
"برسین، برسین، ئێمە برسین... گەنممان دەوێ. گەنممان نییە."
"ئێوەش هەنگوین و شیلەی گوڵان بخۆن!"
"گەنممان دەوێ، گەنم..."
"سەرکردەی پەپووەکان وەرە لام..."
"فەرموو، هاتم سوڵتانم..."

"گەورەکانیان سواری باڵت کە و بیانهێنە بۆ لام..."
پۆپەبەرز بەرەو خوار باڵی گرت، مێروولە قەلافەتسەیرەکە و گەورەمێروولەکانی تری هەڵگرت و هێنانیە پێش چاوی سوڵتان.
سوڵتان گوتی:
"زۆر بەو دۆخەی ئێوە تێک چووم. خەریک بوو لە برسان بمرن، ئەی بۆچی نەهاتنە ئێرە؟"
"نەمانویست لەپێناو گیانمان سوڵتانی خۆمان بێزار بکەین."
سوڵتان بە دەنگێکی خەفەتاوی گوتی:
"لوتف دەنوێنن. خۆ دەزانن، ژێر و ژووری ئەم چیایانە بە عەمبار تەنراوە، عەمبارەکانیش بە خواردەمەنی ئاخنراون... لە وەها دۆخێکدا دەکرێ لە برسان بمری؟"
"ئێمە مێروولەین، ئێمە دەمرین سوڵتانی خۆمان."
"خواردەمەنیتان پێ دەدەم."
"بێقەزا بی سوڵتانی خۆمان."
"بۆ ئەمەش تەنیا مەرجێکم هەیە."
"فەرموو، مەرجەکەت لەسەر چاومان دادەنێین."
"خواردەمەنی دەدەم بە هەر مێروولەیەک بۆ ئەوەی لەم زستانە بە سەلامەتی دەرباز بێ. بەرامبەر بەمەش..."
"گرنگ ئەوەیە گیانمان ڕزگار بکەی، سوڵتانی خۆمان، چیت بوێ دەیکەین."
"بەرامبەر بەمەش مردووی ڕیشسوورم لە هەر مێروولەیەک دەوێ، هەڵبەت گەر زیندوو بێ، چ باشتر.

ئەگەر مێرووە شەلەی ڕدێنسوور ساغ بێ، بۆ مردوو و زیندووی وی، عەمبارێکی تەژی شیلەی گوڵ، هەنگوین و کاکڵ دەبەخشم."
"هەر مێروولەیەک لە کوێ ڕیشسوورێک بدۆزێتەوە سوڵتانی خۆمان؟ ئەوەندەمان ڕیشسوور لەناودا نییە..."
"هەر مێروولەیەک بواری ڕدێنسووربوونی تێدا بێ، بە ڕدێنسوور حیسابە، مردوو و زیندووی ئەوم بۆ بێنن. بەم جۆرە ڕدێنسوورەکان و ئەوانەی بۆی هەیە وەک ڕدێنسوورەکان بیر بکەنەوە، لە ڕەگوڕیشە دەردێنین."
مێروولەکان گوتیان:
"باشە سوڵتانی خۆمان، با ئەم پێشنیارەتان بە گوێی نەتەوەی مێروولەکان بگەیەنین بزانین چ دەڵێن. بمانبە سەرکردەی پەپووەکان."
پۆپەبەرز یەکسەر لە سەرێ ڕا بەرەو خوارێ بووەوە، مێروولەکانی سەر پشتی، لای مێروولەکانی تر، لە مەیدانەکە دابەزاند و گەڕایەوە بۆ لای سوڵتان. چاوەڕێ مانەوە. لە خوارەوە، لە مەیدانەکە و لە دەوروبەر هەرا و هەنگامەیەکی بێپایان بەو ناوەدا بڵاوبووەوە.
هەرا و هەنگامەکە تا دەهات زیاتر درێژەی دەخایاند، سوڵتان ئۆقرەی لێ بڕا. شەش جار پۆپەبەرزی ناردە لایان و گوتی:
"بڕۆ بزانە ئەم مێرووە مەلعوونانە چ دەکەن، ئەم هاتوهاوارەیان لە چییە."
هەرشەش جارەکەش پۆپەبەرز گوتی:

"هیچ لەو غەڵبەغەڵبەیان تێناگەم، مێروولە قەڵافەتسەیرەکە و هاوڕێیانیشم بۆ نادۆزرێتەوە، سوڵتانم."
فیل چەندەش زەبەلاح و مێروو چەندەش ترسنۆک بن، سوڵتان هەمدیس خۆی لێ بەدوور دەگرتن. ئەوان کە بەرد و ئەڵماسی شینیان لە نێوەڕاستی زەوی دەرهێنابوو، کۆشکیان ساز کردبوو، بن ئەم شاخانەیان پڕ کردبوو لە خواردەمەنی، هەنگوین، گەنم، کاکڵ و شیلەی گوڵ، ئەگەر حەزیان بکردایە و هەندێک مێشکیان بەکار بهێنایە و بەجەرگ بوونایە، لەم دونیایەدا چ شتگەلێکیان نەدەکرد. ئەم مێروولانە سێ چوار بارتەقای قورسایی خۆیان بار هەڵدەگرن، وا نییە؟ لەبەر هەندێ بەڕێوەبردنی ئەم مێروولانە لێهاتوویی و زانستێکی زۆری پێویست بوو. سوودوەرگرتن لە مێروولەکان و بەڕێوەبردنیان شتێک نەبوو بە داری زۆرێ بەدی بێ. نە دەبێ برسییان بهێڵیتەوە، نە زۆر تێریان بکەی. نابێ زۆر هەژار یان زۆر دەوڵەمەند بن. هەموو شتێک دەکەی بۆ ئەوەی بیر نەکەنەوە. لە سروشتی مێروولەکاندا یاخیبوون، گۆڕین و ڕیشسووربوون هەیە. دەبێ ڕێگەیەک بدۆزیتەوە بۆ ئەوەی شەو و ڕۆژ بیر لە فیلبوون بکەنەوە... بەم جۆرە مێروولەبوونیان لە بیر دەبەیتەوە... بۆ ئەم مەبەستەش دەشێ ڕێ و ڕێبازی نوێ بدۆزیتەوە.
سوڵتان بیری لە زۆر شتی ئاوا دەکردەوە کە سەرکردەی پەپووەکان بۆ دوایین جار چووە لای

مێرووله‌کـــــان و گه‌ڕایه‌وه‌، له‌و ســـــاته‌دا له‌ناکـــــاو
مێرووله‌کـــــان که‌ به‌ جووڵه‌جـــــوول که‌وتبـــــوون،
هاتوهاواریان لێ بڕا.
سوڵتان به‌ ترسه‌وه‌ پرسیی:
"چ بوو؟"
پۆپه‌به‌رز گوتی:
"له‌وانه‌ی سه‌ر باڵه‌کانم بپرسه‌."
مێرووله‌ قه‌ڵافه‌تسه‌یره‌که‌ گوتی:
"مێرووله‌کـــان گوتیـــان ئـــێمه‌ ڕیشســـووره‌کانمان بـــۆ
نـــادۆزرێته‌وه‌. شـــێتن ئه‌و مێـــرووولانه‌. گوتیـــان ئـــێمه‌ بـــۆ
پارووه‌نانێـــــک، ته‌نـــــانه‌ت ئه‌گه‌ر ڕدێنســـــووره‌کانیش
بدۆزینه‌وه‌، نایانکوژین. چش، هه‌ر که‌س ده‌چێته‌ قه‌بری
خۆی. بـا له‌ برسـان بمـرن، چ بکه‌یـن، سـوڵتانی خـاوه‌ن
شکۆمان..."
"جـارێ ئێوه‌ سـکتان تێر که‌ن... له‌سـه‌ر بـاڵی په‌پووه‌که‌
چه‌ند که‌سن؟"
مێرووله‌ قه‌ڵافه‌تسه‌یره‌که‌ گوتی:
"زۆرین."
سوڵتان به‌ پۆپه‌به‌رزی گوت:
"ئه‌مانه‌ هه‌ڵگره‌ و بیانبه‌ یه‌که‌م عه‌مباری هه‌نگوین."
"به‌ســـه‌ر چـــاو"، مه‌له‌که‌ وای گـــوت و یه‌کســـه‌ر به‌ره‌و
عه‌مباره‌که‌ فڕی.
گه‌وره‌ و پێشـــه‌وای مێرووله‌کـان که‌ له‌ یه‌که‌م عه‌مبـاری
هه‌نگوین دابه‌زیـن، له‌ برسـان په‌لامـاری هه‌نگوینیـان دا،

هێندەیان خوارد، هێندەیان خوارد، سکیان وەک تەپڵ هەڵمسا. نەتەوەی مێروولە دەسبەجێ بیستیان کە ئەوان سکیان بە هەنگوین ئاخنیوە و ڕقیان لە گەورەکانیان هەڵگرت، وەک چۆن ڕقیان لە فیلەکان هەڵگرتبوو.
گەورە و پێشەوای مێروولەکان کە سکی خۆیان تێر کردبوو، کاتێک گەڕانەوە بۆ ناو مێروولەکان، ئەوانی تر بە جۆرێ هەڵسوکەوتیان کرد وەک ئەوەی هیچ نەزانن و هیچ ڕووی نەدابێ. پاشان لەپڕێکا کەیلی خۆشی ڕۆحیان هاتەوە بەر و گوتیان:
"بڕۆن بە سوڵتان بڵێن هەر کاممان ڕدێنسوورێک لەگەڵ خۆیدا دێنێ. دەیهێنین و خۆراکەکەمان لە سوڵتان وەردەگرین بۆ ئەوەی لە برسان نەمرین."
ڕێک لەو ساتەدا پۆپەبەرز هاتە مەیدانەکە، گەورەکانی سواری باڵەکانی کرد و وە حەوا کەوت. گەورەی مێروولەکان بۆ سوڵتانیان گێڕایەوە، فیل بەم ڕەفتارەی بەندەکانی بێئەندازە خۆشحاڵ بوو و گوتی:
"مێروولەکان ئاقڵ بوون."
مێروولەکانیش پاش ئەم بڕیارە پێداگرە بە پەلە خۆیان گەیاندە شارەکانیان و یەکسەر دەستیان بە ڕاوی مێروولە زەردەڵەکان کرد، چەندە مێروولەی زەردەڵە لەناویاندا هەبێ، یەکە یەکە گرتیانن، ڕەنگی سووریان لە ڕدێنیان دا و کوشتیانن. تەرمی ئەم مێروولە زەردەلە ڕدێنسوور کراوانەیان بردە لای سوڵتان و خۆراکیان وەرگرت.

مەیدانی بەردەم کۆشک، باخچە تایبەتەکەی سولتان، دامێن و دۆڵ و بەردەکان پڕاوپڕ بوو لە کەلاکی مێرووولەی ڕدێنسوور.
کە مردووی مێروولەیەک دەهات، تا چیا لە کەلاک چێبووەکانی بەردەم کۆشکەکە بەرزتر دەبوونەوە، سولتان لە خۆشییان پتر خۆی با دەدا.
بە شادومانی بە پۆپەبەرزی دەگوت:
"چەندەش زۆر بوون، چەندەش زۆر بوون ئەم مێرووە سوورانە، ئەگەر کوشتنیان بە مێشکم نەگەیشتبایە، ماڵوێران بووبووین."
ئەو ساڵە مێروولەکان، هەرچی مێروولەی زەرد هەبوو، هەموویانیان گرتن، ڕدێنیان سوور کردن، کوشتیانن، تەرمەکانیان بردە بەردەم سولتان و خۆراکیان وەرگرت. ئەوەی ڕاستی بێ هەر مێروولەیەک، بۆیەی سووری لە پێنج، شەش تا دە مێروولەی زەرد دابوو و بۆ سولتانی بردبوون، لە بەرامبەریشدا بە هەمان ڕادە خواردەمەنیی وەرگرتبوو.
ڕۆژێک کۆمەڵێک مێروولەی لاو، ڕیشسپییەکی گەورەیان گرت، هەردوو قاچیان شکاند، ڕدێنیان سوور کرد، کوشتیان، مردووەکەیان بردە کن سولتان و گوتیان:
"ئەمەش مێرووە شەلەی ڕیشسوور."
سولتان یەکسەر سەرکردەی پەپووەکانی بانگ کرد و گوتی:

"سەیری ئەم تەرمە بکە، بزانە مێرووە شەلە؟"
پـــــۆپەبەرز مـــــــاوەیەکی زۆر بە دەوری تەرمەکەدا سووڕایەوە و پاشان گوتی:
"نـازانم وەڵـلا، دیـارە مـردوو دەگـۆڕدرێ، بەڵام تەرمـی ئەم مێـرووە پیـرە زۆر شـێوەی مێـرووە شـەل دەدا. سـوڵتانم، ئەم مێـرووولانەش ئەوەنـدە لێـک دەچـن کە نـاتوانی زەردەکەیـان و ڕەشـەکەیان لێـک هەڵاوێـری... شین و پەمەییان لێک جوێ ناکرێنەوە. خۆ ئەم گەنجانە درۆ ناکەن، ئەم مێرووە پیرەش شەلە، ڕدێنیشـی سـوور سووورە."
سوڵتان زۆر خۆشحاڵ بوو و فەرمانی دا:
"سێ عەمبـاری شـیلەی گوڵ بۆ ئەم گەنجـانە بـکەنەوە. ئیکسیریشیان پێ بدەن بۆ ئەوەی سەرخۆش بن."
مێـرووولە گەنجەکـــان هاوکـــات پەلامـــاری هەرســـێ عەمبارییان دا، پاش ئەوەی خۆیـان تێر تێر کـرد، ئەوەی لە عەمبـاردا مـابوو، گواسـتیانەوە بـۆ شـار، حەکیمەکـان لەم شیلەی گوڵانە دەرمانیـان بـۆ نەخۆشـەکان دروسـت کرد. چی مێرووولەی نەخـۆش لە شـار و وڵاتـان هەبـوو، ڕزگاریان بوو.
ڕۆژێ سوڵتان مێرووولە زەردەڵەکانی کەوتەوە یـاد و لە پۆپەبەرزی پرسی:
"بەنـدە زەردەکـانم چییـان لـێ هـات، دەنگوباسـیان؟ بە جـارێ دیـار نـین، سـەرکردەی پەپووەکـان. نەکـا لـێم تۆرابن و تووڕە بووبن لێم؟"

سەرکردەی پەپووەکانیش کە ئەو هەمووە ئەزموونەی تێپەڕاندبوو، ڕۆژ و ڕۆژگاری بینیبوو و تەمەنێکی زۆر ژیابوو، بەرامبەر بەم پرسیارە کتوپڕە واقی وڕ ما. دەیتوانی چ بە سوڵتان بڵێ؟ نەیدەتوانی بێژێ: "سوڵتانم، مێروولەکانی بەندەت، یەکە یەکە مێروولە زەردەڵەکانی تۆیان گرت، ڕەنگی سووریان لەوان هەڵسوو، ئینجا ئەوانیان کوشت و هێنایانە بەردەمت، وەک پاداشیش خواردەمەنیان لێ وەرگرتی." سوڵتانی فیلەکان لە داخان شێت و هار دەبوو، بەو ڕقەوە فیلەکانی دەناردە سەر وڵاتی مێروولەکان، فیلە تووڕەکان یەک مێروولە نەدەما پانی نەکەنەوە و نەیکوژن. ئەگەر مێروولە نەبن، فیلەکان و پەپووەکانیش برسی دەمانەوە.

سوڵتان لە خورتوخۆڕایی ئەو هەمووە لە ڕدێنسوورەکانی هەڵپێچابوو. لەخۆڕا ئەم خوێڕییە دەست و پێ سپیلکانەی کردبووە کێشە... ئەو مێرووە زەردەڵە ڕدێن ڕەنگکراوانەی لە چنگ مێروولەکان ڕزگاریان بووبوو، دەمێک بوو ڕایان کردبوو و خۆیان تێکەڵ بە مێروولە ڕیشسوورەکان کردبوو. ئەوانیش کە هەڵخەڵەتابوون، بە شایی و هەڵپەڕکێ پێشوازییان لێ کردبوون. لەبەر ئەمەش مێروولە سوورەکان خۆبەخۆ بووبوونە دوژمن و خەریک بوو چاوی یەکتری دەربێنن. مێروولە زەردەکانیش بەپێی ئەو فەرمانەی پێیان درابوو، دەبوایە زۆر پێکیان بپرژێنن، تاوەکو چاوی یەکتری هەڵکۆڵن، یەکتری بکوژن و تەواو بن.

سـولْتان ختوخـــۆڕایی ئەو هەمـــووە لەو مێـــرووولە ڕدێنسـوورانە دەترسـا. ئـاخۆ ئەوە ترسـی وی نەبـوو بووبووە هۆی کوژرانی ئەو هەمووە برا زەردانە؟
"سـولْتانم، مێـرووولە زەردەکـان زۆربەی هەرە زۆریـان چوونەتە ولاتـی مێرووولە سـوورەکان. ڕدێنیـان سـوور کـردووە و قەلافەتـی مێـرووە سـوورەکانیان بە خـۆوە گرتـووە. لەویّ چەنـدە مێـرووولەی ڕدێنسـوور مـابنەوە، دەیانگرن و بۆ سولْتانی خۆمانیان دێنن."
سولْتان بە پێکەنینەوە گوتی:
"ئەمە هەواڵێکـی خۆشـە. ئەمـڕۆ، لەسـەر شـەڕەفی تەواوبـوونی سـەرجەم مێرووە سـوورەکان، بە خۆشـیی کوژرانیـــان بە جۆرێـــک کە تەنـــانەت مێروویەکـــی ڕدێنسوور نەمێنێتەوە، تا بەرەبەیان پێکەوە دەخۆینەوە. لێـرە، لە بـن ئەم دارچنـارە، هەم دەخـۆینەوە و هەم کەفەلْمان دەخورێنین. دەسبەجێ ئەو گەنجانەش بێنە بۆ ئێرە کە تەرمی مێرووە شەلەی ڕدێنسووریان بۆ هێنام، دەمەویّ یەک دوو قسەیان لەگەلْ بکەم."
پۆپەبەرز، پێنج پەپووی تری خستە پاڵ خۆی، فڕی و وەک هەورەتریشـــقە گەیشـــتە ولاتـــی مێرووولەکـــان، گەنجەکانی هەلْگرت و هێنانی.
سولْتان گوتی:
"وەرنە پێشـێ. پـلەی فـیلم بە ئێـوە دا. بـۆ ئەوەی هەر کامتـان ببـنە فیلێکـی بـاش، قوتابخـانەی فیلبوونتـان بـۆ دەکەمەوە و وەک فیلـی ڕاســتەقینە دەتـانکەمە فیـل.

جـــاریّ، بەداخەوە وەک مێــروولە فیــل دەبـــن... بەڵام ئەمشـــــەو، لەگەڵ مـــن کەفەڵتـــان بە نێـــوقەدی ئەم دارچنــارەدا دێـنن و دەیخـوررێنن، تــا لە نــاخی نــاخەوە هەست بە شکۆ و بەرزی فیل بکەن."

ســـــوڵتان، ســــــەرکردەی پەپووەکـــــان و پەپـــــووە ڕیشسـپییەکانی تـر، مێرووله گەنجەکـان یـانی بکـوژانی ئاسـنگەرە شـەلەکە تـا کـازیوەی بەیـانی خواردیـانەوە، شــادییان کــرد، کەفەڵیــان بە دارچنــارەکەوە نــا و تــا بەربەیان خوراندیان.

ئەو گەنجـانە کە تـازە بووبـوونە فیـل، بە هـۆی ئەوەی مێرووە شـەلەی ڕاسـتەقینەیان بـۆ سـوڵتان نەهێنـاوە و لەبری مێرووە شـەلێکی دروینیـان هێنـاوە، شـەرمیان لە فیلبوونیــان دەکـرد، لەنێـو خۆیانـدا سـوێندیان خـوارد مێرووە شەلە ڕدێنسـوورە ڕاسـتەقینەکە بگـرن و زەق و زیندوو بیهێننە بەردەم سوڵتان.

ئیتر ئەوان بووبوونە فیل، بە ڕادەیەک بووبوونە فیل کە لەگەڵ ســوڵتانی دونیــا پێکیــان هەڵــدەدا و بەشــداریی جەژنەکەیّ دەبوون. دەچوونە قوتابخـانە و وەک فیلێکی چــــاک و بەقەد فیلێـــک دەبـــــوونە فیـــــل نەک بەقەد مێروولەیەک... ئـاخر دۆزینەوە و هێنـانی ئاسـنگەرێکی پیر و شەل و چەماوە چیی تێدەچوو؟

لە کاتی ماڵئاواییدا سوڵتان پیرۆزبـایی پیّ گوتن و هەر کـامە و بڕوانــامەیەکی "بـوو بە فیـل"ی پــیّ دان. ئەمە یەکەم بڕوانامەی "بوو بە فیل" بوو کە دەیبەخشی.

پۆلێک مێروولەی زەردەڵەی ڕدێنسووورکراو لە مەرگ ڕزگاریان بووبوو و هەڵاتبوون بۆ چیاکان. ئامانجیان دۆزینەوەی مێروولە ڕدێنسوورەکان و تێکەڵبوون بەوان بوو. بەڵام مێرووەشەلەیان لە کوێ بۆ دەدۆزرایەوە؟ سوڵتانی گەورەی فیلەکان بە سوڵتانێتیی خۆیەوە ئەو هەمووە بەدوایدا گەڕابوو و بچووکترین سەرەداوی لە مێرووە ڕدێنسوورەکان دەست نەکەوتبوو.

مێرووە زەردەکان بە ڕدێنە سەیرە سوورکراوەکەیان و چاوە لە ترسان دەرپەڕیوەکانیان، برسی و ماندوو، بەسەر شاخ و گرد و زنارەکاندا وێڵ بوون. دەستەوەستاو و پەرێشان بووبوون. تازە بە تازە تێدەگەیشتن چ بەڵایەکیان بەسەر هاتووە. کاتێک بۆیان دەرکەوت ڕووبەڕووی چ ڕقێک بوونەتەوە، لەمێژ بوو

کـار لە کـار ترازابـوو. ئێسـتا ئەگەر گەڕابـانەوە و بە سـوڵتانیان گوتبـا چ گەمەیەکـی لەگەڵ کـراوە، لەبـری ڕیشسـوورەکان، ڕدێنـی ئەوان ڕەنـگ کـراوە و تەرمەکەیـان بەو دراوە، لە بەرامبەریشـیدا عەمبـاری پڕ لە خواردەمەنی وەرگیراوە و لە خشتەیان بردووە، خۆ سوڵتان دونیای دەشێواند، وەچەی مێروولەکانی لەسـەر ڕووی زەوی دەسڕییەوە. وەچەی دەسڕینەوە بەڵام کێ دەیتـوانی بـڕوای پـێ بێنـێ کە ئەم مێـرووە ڕیشسوورکراوانە مێروولە زەردەکان بوون؟ لە لایەکی ترەوە، ئەوان چۆن دەیانتوانی لە چنگ ئەو مێروولانەی ملـی شـاخوداخەکانیان گرتبـوو، کـون بە کـون بەدوای مێروولە زەردەکانەوە بوون و بە خوێنی سەریان تینوو بوون، خۆیان ڕزگار بکەن و خۆ بگەیەننە لای سـوڵتان. هەرچـی بـێ ڕدێنیـان سـوور بووبـوو، باشـتر وا بـوو تـێکەڵ بە ڕیشسـوورەکان بـن و تـۆڵەی مێـرووولە زەردەکـان لەوان بـکەنەوە. ئەوەی بەسـەریان هـاتبوو، هـیچ بوونەوەرێـک لەم دونیـایەدا بەسـەر بـوونەوەرێکی تری نەهێنابوو. ڕووبەڕووی چ کۆمەڵکوژییەکی سامناک و قێزەون بووبوونەوە، ئەوەی مێروولەکانی تر بەسـەر مێرووە زەردەکانیـان هێنـابوو، فیـل بەسـەر مێروولەیـان نەهێنابوو. هەزار ساڵیش تێپەڕ بن، ناتوانن ئەو ڕۆژە لە بیـر بـکەن. لە مـاوەی چاوتروکانێکـدا، تەنـانەت مێروولەیەکـی زەرد نەمـابوو ڕدێنـی سـوور نەکـرێ، نەکـوژرێ و تەرمەکەی لە مەیدانەکەی بەردەم کۆشـکی

سوڵتان فڕێ نەدرێ. ئەمانەش ئەو ساتەوەختەیان بە بیر نایە کە گیانی خۆیان ڕزگار کرد. بەس ئەوەیان باش دەهاتەوە یاد کە پاش سێ ڕۆژ مانەوە لەژێر تۆکڵاشی دارچنارێک، پەلاماری قاپە ماستێکیان دابوو و ئینجا بێ ئەوەی لەپشت سەریان بڕوانن، ڕوویان لە چیا کردبوو و دوور لە چاوی مێروولەکان هاتبوونە ئێرە...
تاریک و ڕوونی بەیانی بوو، لە دۆڵەکەی ئەوبەر خورەخوڕی جۆبارێک دەبیسترا، مێروولەکان هەستابوون، بە لاق چاوەکانیان هەڵدەگلۆفی. لەناکاو، لەولای جۆبارەکەوە گوێیان لە دەنگێک بوو و هاتنەوە سەر خۆ. ئەوە دەنگی گوڕی مێروولەیەک بوو. دەنگەکە یەکبەخۆی هاواری دەکرد:
"خۆ بەدەستەوە بدەن، خۆ بەدەستەوە بدەن، خۆ بە دەستەوە بدەن. خۆ بەدەستەوە نەدەن، تەقە دەکەم. وەرنە پێشێ، لووتمان وەها بۆن هەڵدەمژێ کە بە مەودای چل ڕۆژە ڕێ بۆنی مێروولەیەک دەکەین. خۆ بەدەستەوە بدەن، خێرا خۆ بەدەستەوە بدەن و خۆتان ڕزگار بکەن."
مێرووە زەردە ڕیشسوورەکان گوتیان:
"ئەها، پێوە بووین! پێمان وا بوو گیانی شیرینمان ڕزگار کردووە، کەوایە مێروولەکان لێرەش گرتیانین. ئێستا دەمانکوژن، تەرمەکەمان دەبەن بۆ لای سوڵتان و عەمبارێک، دوو سێ عەمبار هەنوێن و شیلەی گوڵ و کاکڵ وەردەگرن و تێر تێر دەخۆن... پێوە بووین،

ماڵوێران بووین، پێمان وا بوو گیانی شیرینمان قوتار کردووە.˝
هەر وا بەدەم قسەکردنەوە، بەسەر بەردێکدا هەڵزنان و هێدی هێدی خزانە نێو قەڵشتێکی سەر بەردەکە. زارکی قەڵشتەکەیان بە گوڵە شینەکانی پونگەکێوی حەشار دا.
کەمێک دواتر بینییان کە مێروولە وەک خیز و خۆڵ لە دەوروبەریان هەڵدەقولا، بینییان کە ئەم مێروولانە هەر هەموویان ڕدێنسوورن. لە خۆشیی ڕزگاربوون لە مەرگ کتوپڕ لە قەڵشتەکە دەرپەڕین، خۆیان بە باوەشی مێروولە ڕدێنسوورەکاندا کرد و هۆن هۆن گریان.
˝ئاخ، ئاخ، ئاااخ برا ڕدێنسوورەکانمان، ئەگەر دەتانزانی چیمان بەسەر هاتووە! ئەو بەڵایەی بەسەرمان هاتووە، بەسەر مێروولەی پوختە و خاراویش نەهاتووە. ئەوەی بەسەر ئێمە هاتووە، بەسەر ئادەمیزادیش نەهاتووە. ئەوەی لە ئێمە قەوماوە...˝
ڕدێنسوورەکان پرسییان:
˝ئادەی، ئادەی، با بزانین ئێوە کێن؟ واز لە گریان و لالانەوە بێنن و پێمان بڵێن کێن و چ کارەن؟˝
مێروولەکانی تر گوتیان:
˝ئێمە، مێروولەی ڕدێنسوورین. سەیری ڕدێنمان بکەن.˝
مێروولەکان قەدەرێکی زۆر لە ڕدێنیان ورد بوونەوە، پاشان لیچیان هەڵقرچاند و گوتیان:
˝بۆ ڕیشسووربوون ڕیشسوورن، بەڵام تێنەگەیشتین ئێوە چ جۆرە ڕیشسوورێکن.˝

مێرووە زەردە ڕدێنسـوورەکان لەوێ لەسـەر لێواری قەڵشـتەکە دانیشـتن و هەمـوو ڕووداوەکانیـان مـوو بە مـوو، لە برسـێتیی مێروولەکـانەوە بگـرە تـا لە برسـان ڕادەسـتکردنی مێرووە ڕدێنسـوورەکان بە سـوڵتان، بـۆ مێروولەکانی تر گێڕایەوە.

"جـا ئـێمە گیانمـان ڕزگـار کـرد و بە ئاسـتەم توانیمـان خۆمـان بگەیەنینە چیاکـان. مێروولەی سـەرجەم وڵاتـان بە دەشـــــتودەر و کەژوکـــــۆ وەربـــــوون و بەدوای ڕدێنســـــــوورەکاندا دەگەڕێـــــن. زۆربەی هەرە زۆری ڕدێنسـوورەکان دەسبەجێ ڕدێنیـان تاشـی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا نەیـانتوانی خۆیـان قوتـار بـکەن، ناسـرانەوە، کوژران و تەرمەکەیـان لەبەر دەرگەی کۆشـکی سـوڵتان فـڕێ درا. مێروولەکـان بە کەلـلەسەری ڕدێنسـوورەکان کۆمەڵێک تەپۆڵکەیان دروست کردووە... ئاخ، ئەم چاوانە چییان نەبینی، ئاخ! بە زمان وەسف ناکرێ و بە داسـتان نـاگێڕدرێتەوە... ئیتـر لە هـیچ وڵاتێکـی مێروولەکـان تەنـانەت ڕدێنسـوورێک بەدی نـاکرێ. ئـێمە دوایـین ڕدێنسـوورەکانی ئەم دونیـایەین کە دێینە لای مێـرووە شـەلەی ڕدێنسـووری سـەرکردەمان." دوای ئەم قسـانە دەستیان بە شین و ڕۆڕۆ کرد.

سـەرۆکی مێروولەکـانی تـر کە ئەسـتێرەیەک بە کڵاوەکەیەوە بوو، دڕدۆنگانە وە قسە هات:

"بـۆ ڕدێنسـووری ڕدێنسـوورن، بەڵام ڕدێنسـوورێکی سـەیرن، هـیچ شـێوەی ئـێمە نـادەن. قەت لە

مێروولەکـانیش نـاچن. مـن پـێم وایە ئێـوە سـەر بە ڕەگەزێکـی سـەیری تـرن، بەڵام هەر تێنەگەیشـتم ئێـوە کێن و چ کارەن؟"

مێروولە زەردە ڕدێنسوورەکان دەنگیان هەڵبڕی:

"ئێمە، ئیمە، ئێمە کێین؟ بۆ هێشـتیان ڕەنـگ و ڕووی مێروولەمان پێوە بمێنێتەوە؟"

"ئێمەیان خستە بەندیخانەوە."

"فوویان تێکردین."

"ئەوەنـدەیان فوو تێکـردین، هەر کاممـان بەقەد فیلێکمـان لێ هاتبوو."

"بە جۆرێ فوویان تێکردین کە نیوەمان تەقیین."

"وەک چۆن گەنمەشامی دەتەقێ."

"فیلەکان و مێروولەکان سەیری تۆقینی ئێمەیان دەکرد."

"کارەبایان لێ داین."

"تەلی مسیان لە کێرمان گرێ دا."

"ئەندامی زاوزێیان سووتاندین."

"بە داردەست وەرگەڕانە سەر و گوێلاکمان."

"کارەبایان لەو شوێنەی ئێمە دا."

"تا قوڕگ ئێمەیان خستە نێو خاک و فوویان تێکردین. چاومـان دەرپەڕی."

"ئەرێ مێرووە ڕدێنسـوورەکانی برامـان، ئەو مێـروولانە هەر کـام لە ئێمەیـان وا ئەشـکەنجە کـرد کە سـەد قـات خراپتـر بـوو لەوەی مـرۆڤە گەمژەکـان بەسـەر یەکتـری دێنن."

"ئەم چـــاوانە چ شـــتگەلێکیان نەبینـــی، مێـــرووە ڕدێنســـوورەکانی برامـــان، ئێـوە هیچتـان نەبینیـوە و نازانن."

"بـۆ هێشـتیان ڕەنـگ و ڕووی ڕدێنســوورمان پێـوە بمێنێتەوە!"

"جـا چییـان بەسـەر ئـێمە نەهێنـا! ئێـوە لە ڕدێنسـوور گەڕێـن، چـا نییە هەر لە مێرووله دەچـین و توانیتـان لە مێروولەمان بچوێنن."

ڕدێنسـوورەرکان تـا بلێـی دڵیـان بە دۆخـی ئەم مێـرووله سـەیرانە سـووتا و بە هـۆی ئەو بەڵایـانەی بەسـەریان هاتبوو، کسپەیان لە جەرگی هەستا.

"هەمـــوو مێروولەکـــانیش بـــوونەتە فیـــل. تەنـــانەت مێروولەیەک کە بەقەد نـووکەدەرزییەکە.خـۆی بە فیـل لە قەڵەم دەدا. ئەو مێـــروولانەی هـــاتبوونە ڕاوی مە، لەوانە بوون."

ڕیشسوورەکان کە لە هەموو شتێک تێگەیشتبوون، زۆر گەرموگوڕ نزیکیان بوونەوە، خواردنیان پێ دان، لەسـەر جێی نەرم خەواندیانن و برینەکانیان پێچانەوە.

بەرەبەیان کە لە خەو هەستان، لەسـەر کانییەکی نـوقمی بۆنی پنگە تاشتێیان کرد. بەڕاسـتییش ئەم ڕدێنسوورانە وەک بـرا و لە بـرا واوەتـر لەگەڵ مێـرووە زەردەکـان هەڵسوکەوتیان کرد.

مێرووی زەردی هەرە بەساڵاچوو گوتی:

"بمانبەنە لای مێرووە شەلەی ڕیشسوور، زۆر قسە هەیە پێی بڵێین. مێرووولەکان، ئەو مێرووولە هیچوپووچانەی دوژمنی ڕیشسوور، هەرگیز لە کۆتی فیلەکان ڕزگاریان نابن، سەرەڕای ئەمەش دەبێ هەندێک شت بە مامۆستا شەلەکەمان بێژین."

مێرووە ڕدێنسووری تەوێڵ بە ئەستێرە گوتی:

"ئاخ، ئاخ برایان، مخابن، قەت، تا قیامەت ئێمە لە چنگ فیلەکان ڕزگارمان نابێ، ئاااخ! دیسانیش برۆن ئەمانە بە مامۆستامان بڵێن. داخ و جەخار، فیل مەزنن، ئێمە بچووک، ئاااخ، داخی بە جەرگم، داخ و جەخار!"

بەساڵاچووەکەی مێرووە زەردەکان گوتی:

"ئاااخ، داخی گرانم. فیلەکان بەقەد چیا دەبن و مێرووولەکانیش هەرکام بەقەد نووکەدەرزییەک، ئاااخ، هاوار بە ماڵم... ئەگەر لەنێو ئێمەدا تەنیا مێرووولەیەک، مێرووولەیەک و زیاتر نا، بەقەد فیلێک بوایە، چ دەبوو؟"

مێرووە ڕدێنسوورە تەوێڵ بە ئەستێرەکە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و گوتی:

"نیمانە. مێرووولەی ئاوامان نییە، نامانبێ."

"یەکێک وا بوایە، هەموو فیلەکانی دونیای..."

ئەوی تر گوتی:

"وسس."

"ئەرێ بەڕاست، ئێوە لەم چیا چۆلوهۆلە چاوەڕوانیی چین؟"

تەوێڵ بە ئەستێرەکە گوتی:

"به ئیمه دەڵێن چیاگەڕ. ئیمه له چیامان داوه و لێره چاوەڕوانی فیلەکانین. مامۆستا شەله نەیدەویست ئیمه له چیا بدەین. دەیگوت وەدوای خەیاڵی خاو کەوتوون."
"بۆچی؟"
"دەیگوت به گەڕان له چیاکان ناتوانن فیلەکان ڕاو بکەن."
"ئەی ئێوه چیتان گوت؟"
"ئیمه دەڵێین ڕاویان دەکەین."
"مەگین له چیا بتوانین فیلەکان ڕاو بکەین."
"چەکوچۆڵتان هەیه؟"
"هەمانه، نێزەی چزوو مێشوولەمان هەیه."
"ئەها، چاکه..."
"بەو نێزانەی له چزووی مێشووله دروستمان کردوون، لێره چاوەڕێین، هەر فیلێک بێ، چاوی..."
"فیلەکان ژاراوی دەبن و به لەرز و تا دەمرن."
مێرووه ڕدێنسووره چیاگەڕەکان ورووژان و هەموویان له یەک کاتدا وەقسه هاتن.
"هەزار چزووی مێشووله بۆ چاوی فیلێک."
"هەر فیلێک چزووی مێشوولەی بەر بکەوێ، له جێدا لەرز و تا دەیگرێ، لەسەر پێ دەمرێ و دەکەوێ..."
"مامۆستا شەله گوتی ئەمه بەکەڵک نایه."
"چووزانێ بەکەڵک نایه؟"
"گوتی نێزەی چزوو کار له فیلان ناکا."
"چووزانێ؟"

"نێزەی چزوو نەک هەر کار دەکاتە فیل، بگرە لە بەرد و ئاسن و داریش ڕۆدەچێ."
مێرووە زەردە ڕدێن ڕەنگکراوەکان تێکڕا هاواریان کرد:
"لەوانیش ڕۆدەچێ."
"نێزەی چزوو مێشوولە نەک هەر فیل، بگرە مرۆڤەکانیش دەکوژێ."
مێرووە زەردەکان قیژاندیان:
"مرۆڤەکانیش دەکوژێ."
"ئەم مامۆستا شەلە چاکە، دەستپاکە، ژیرە، تیژبیرە، ڕدێنسوورێکی بەناموسە، بەڵام مێشکی سواوە، لەو چیایانە دەست لەسەر دەست دانیشتووە، بەردەوام کتێب دەخوێنێتەوە و دەفکرێ. وێڕای ئەوەش مێروولەی ڕدێنسووری ناردووەتە ولاتی مێروولەکان و هەموو ڕۆژێ بە چوارچاو دیدەڕێی هەواڵەکانی ئەوانە."
هەرە بەساڵاچووی مێرووە زەردە ڕدێنسوورەکان گوڕاندی:
"هەڵەیە، هەڵەیە، ئەو هەڵەیە، حەق بە ئێوەیە."
ڕدێنسوورە تەوێڵ بە ئەستێرەکە دەنگی هەڵبڕی:
"حەق بە ئێمەیە. ڕێگە و نێزەی ئێمە ڕاستە..."
چیاگەڕە ڕدێنسوورەکان لە خۆشیان هاواریان کرد.
زایەڵەی دەنگیان چیا بە چیا ڕۆی.
"ئەو ڕێگەیەی ئێمە پێیدا دەڕۆین ڕاستە..."
سەرۆکی مێرووە زەردەکان گوتی:
"بەس کەمایەسییەکتان هەس؟"

مێرووه تەوێڵ بە ئەستێرەکە سوور سوور هەڵگەڕا و گوتی:
"چییە، پێم بڵێ، ئەی مێروولەی ئەشکەنجەچێشتوو... هاوڕێی لێقەوماو بێژە، ئەو کەمایەسییەی ئێمە چییە، پێمان بڵێ با ڕاستی بکەینەوە."
سەرۆکی مێرووە زەردەکان گوتی:
"ئێوە زۆر گەنجن. دەنا تا بڵێی ژیر و دلێرن. هێندە گەنج نەبوایەن، پێشتر ئەقڵتان بەو قسەیەی منیش دەشکا."
تەوێڵبەئەستێرەکە گوتی:
"وایە."
"فیل خۆ ناتوانن بەم گابەردانەدا هەڵڕووسکێن! بۆیە مامۆستا شەلەمان پەنای بۆ ئەم شاخانە هێناوە. لێرە بیر دەکاتەوە و شێواز و ڕێگەی بەزاندنی فیلەکان دەدۆزێتەوە..."
"هیچ بیرمان لەوە نەکردبووەوە."
"ئەگەر لێرە دابنیشن و تاهەتایە چاوەڕێ بن، نابینن تەنانەت فیلێک بەم شاخانەدا هەڵکشێ."
"ئەی دەبێ چ بکەین؟"
"ئەگەر من نەهاتبایەم، تا سەرەمەرگ لێرە چاوەڕێتان دەکرد."
"چاوەڕێمان دەکرد، چونکە مامۆستا شەلەمان پێی گوتووین: مادام گوێتان لە من نەگرت و بوونە چیاگەڕ، لانیکەم لە چیاکان بگەڕێن و چاوەڕوانی فیلەکان بن،

ئەکەن بەرەو دەشتەکان شۆڕ ببنەوە. مامۆستا شەلە پێی گوتووین چیاکەڕێتی ئەریتێکی کۆنە، ڕێوشوێنی تایبەت بە خۆی هەیە، ئەم ڕێوشوێنانەش ئەگۆڕن. بۆیە ئەگەر چیاکەڕێک بەرەو دەشت شۆڕبێتەوە، ئەوا یەکسەر ڕووبەڕووی مردن دەبێتەوە."

"چیاش فیلی لێ نییە."

تەوێڵبەئەستێرەکە گوتی:

"هیچ بیرمان لەمە نەکردبووەوە."

سەرۆکی مێرووە زەردەکان گوتی:

"سەیر کە هاوڕێ. باش گوێم لێ بگرە، تۆ یەکسەر بەرەو دەشت شۆڕ بەوە، سەرکردەی پەپووەکان بدۆزەوە، ئەو سەر بە هەموو شوێنێکی دەشتدا دەکا، چاوی، ڕدێنسوورێک بە مەودای چل ڕۆژ ڕێ دەبینێ، گوێی، دەنگی پێ بە مەودای چل ڕۆژ ڕێ دەبیسێ، بانگی بکە، بەڵام ڕمەکەتی تێمەگرە، چونکە ئەو نێوبژیوانە و نێوبژیوان سووچی نییە."

تەوێڵبەئەستێرەکە بە جۆشەوە گوڕاندی:

"نییەتی."

"پێی بڵێ شەڕم دژ بە فیلەکان ڕاگەیاندووە، لێرە چاوەڕێیان دەکەم. دەچێ بە فیلەکان دەڵێ، فیلەکانیش بە پەلەپەل دێن بۆ ئەوەی پانتان بکەنەوە. مەترسن، چاوی فیل، مێرووله نابینێ. دەخزێنە ناو خەندەقێک و دەست بە هاویشتنی نێزەکانتان دەکەن. ڕێک نێو چاوانیان دەپێکن، نێوەڕاست بیلبیلەی چاوەکانیان."

تەوێڵبەئەستێرەکە گوراندی:

"ڕێک نێوەڕاستی."

دەنگی دەتگوت دەنگی فیلە.

"بەم جۆرە هەر فیلێک نزیک ببێتەوە، دەیکوژن، هەر فیلێک نزیک ببێتەوە... ئێمەی مێروولەش بە ئازادیی خۆمان دەگەین."

تەوێڵبەئەستێرەکە هاواری کرد:

"پێی دەگەین. لەوانەشە ئەو فیلە زەبەلاحانە قەت نەکوژرێن... فیل بەم نێزە بچووکانە دەکوژرێن؟ ئەم نێزانە کار لە فیل ناکەن. مامۆستا شەلە گوتی پێستی فیلەکان ئەوەندە ئەستوورە، ئەوەندە ئەستوورە، گوللەش کاری تێناکا، مامۆستا شەلە وا دەڵێ. ئەو دەزانێ، ئەو ئاسنگەرە. مامۆستا شەلە تەنانەت مرۆڤەکانیشی فێری ئاسنگەری کردووە."

سەرۆکی مێرووە زەردەکان گوتی:

"فیل ئەگەر نەمردبایەن، دونیا پڕ دەبوو لە فیل."

تەوێڵبەئەستێرەکە دڕدۆنگانە گوتی:

"دەمرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر لێرە چاوەڕێیان بکەین باشترە. ڕەنگە بێنە ئێرەش. لەوانەیە سەرکردەی پەپووەکان جارێک بێتە ئێرەش."

مێرووە زەردەکان لە هەموو لایەکەوە گوشاریان بۆ سەر ڕدێنسوورەکان هێنابوو، لە کۆڵیان نەدەبوونە و بە گوێیاندا دەخوێندن، دواجار قایلیان کردن تا بەرەو دەشت شۆڕ ببنەوە و سەرجەم فیلەکان بکوژن.

ڕدێنسوورەکان بە خۆشحاڵییەوە بەرەو خواری، بەرەو دەشت و مێرووە زەردەکانیش دڵخۆشانە لە کاتێکدا مێروویەکی ڕدێنسووری ڕێزان ڕێبەریان بوو، بۆ سەری، بۆ چیاکان، بەرەو شوێنی ئاسنگەری شەل ملی ڕێیان گرت.

دەمەو سپێدە، کە تاریکیی شەو بارگەی دەپێچاوە، خۆر بە ڕیشۆڵەی گوڵەوە دەردەکەوت، خۆزیا بەردەوام خۆری ڕیشۆڵە گوڵ لە سەرمان هەڵبێ، مێرووە زەردەکان گەیشتنە بنکەی مێرووە شەلەی ڕدێنسووری ئاسنگەر کە لە گۆڕاییەکی نێوان چیا هەڵەمووت و هەزار بە هەزارەکان هەڵکەوتبوو. یەکسەر هەواڵیان بۆ ئاسنگەری شەل نارد. ئاسنگەری شەل لە کونی ئەشکەوتەکەیەوە سەیری ئەوانی کرد کە لێی نزیک دەبوونەوە، بەڵام هەرچەند هێنای و بردی نەیتوانی لە هیچیان بچوێنێ. گوتی:

"ئەقڵم ئەم مێرووڵە سوورانە نابڕێ. من لە ژیانمدا مێرووە سووری وام نەبینیوە. ئەمانە نیشانەی خێر نین. یەکسەر ڕاویان بنێن، کوێیان پێ خۆش بوو با بچنە ئەوێ..."

ئەو مێرووەی هەواڵەکەی پێ گەیاندبوو، بە گوێی هەڵێنا:

"ئەمان مامۆستا، ئەمان تووشی هەڵەیەک نەبی، ئەمان ها! ئەوان ئەشکەنجەی وایان بینیوە، خراپتر لەوەی مرۆڤ دەرهەق بە مرۆڤی دەکا."

هەست و سۆزی مێرووە شەلەکە وروو ژا:
"خراپتر لەوەی مرۆڤ دەرهەق بە مرۆڤی تری دەکا؟"
ئەوسا ڕەگی ملی وەک تیرۆک هەڵمسان، سەری بەرز کردەوە و گوڕاندی:
"نەخێر! نەخێر، ئەو بەڵایەی مرۆڤ بەسەر مرۆڤی دێنێ، هیچ ئاژەڵێک بەسەر ئاژەڵێکی تر و هیچ بوونەوەرێک بەسەر بوونەوەرێکی تری ناهێنێ. بڕوا ناکەم و ئەمانەشم ناوێ. ئەمانە درۆزنن."
مێروولەکانی تر پێداگر بوون، گوتیان ئەم مێرووە ڕدێنسوورانە تا ئێرە چیا و لێرەوارەکانیان تێپەڕاندووە و مەرگیان بە چاو بینیوە، بەم جۆرە دڵە پیرەکەی ئاسنگەری شەلیان نەرم کردەوە و ئاسنگەریش پێشوازیی لێ کردن.
"بەخێر بێن."
سەرۆکی مێرووە زەردەکان گوتی:
"زۆر سوپاس."
وەستا شەلەی ئاسنگەر مێروولەیەک بوو قسەی دەمی نەدەگێڕایەوە و لەناکاو پرسیی:
"ئێوە چ جۆرە مێروولەیەکی ڕدێنسوورن، وێدەچێ ڕدێنتان ڕەنگ کرابێ."
مێرووە زەردەکان سەراپای گیانیان هەڵلەرزی.
"کێ ڕدێنی ئێوەی سوور کردووە و بۆچی؟ یان دەنا خۆتان ڕەنگتان کردووە، ئەگەر وا بێ بۆچی ڕەنگتان کردووە؟"

دەنگی ئاسنگەر لە دەنگی کوتکێک دەچوو لە سندان بدرێ و مێرووە زەردەکانی وڕ و گێژ کرد. نەیاندەزانی چ وەڵامێک بدەنەوە و قەدەرێک لێک ڕامان.
سەرۆکی مێرووە زەردەکان بە حاڵەحاڵ هاتە گۆ:
"ئێمە نەهامەتییەکی زۆرمان چەشتووە، چەندین مانگە بەڕێوەین، لەژێر باران و بەفر و گللێرەدا چەندان ڕۆژ ڕێمان کرد. باران باری و شل بووین، خۆر دەرکەوت و وشک بووینەوە، بەم جۆرە ڕیشمان کاڵ بووەتەوە."
مێروولەکانی تریش بۆیان سەندەوە:
"باران باری، مامۆستا، بۆیە وامان لێ هاتووە. دەنا ئێمەش ڕیشمان وەک ئێوەی بریسکەی دەهات، جاران لەژێر تیشکی خۆردا سوور سوور دەینواند."
زیاتر لە سەری ڕۆیشتن، موو بە موو، یەک بە یەک چییان بەسەر هاتبوو، هەموویان گێڕایەوە. گریان و پاڕانەوە. کۆمەڵێک زانیارییان سەبارەت بە دونیای فیلەکان و مێروولەکان ڕاگەیاند. مێرووە سوورەکان کە هەر وا گوێیان بۆ ڕاداشتبوون، فرمێسک لە چاوانیان زا و دڵیان پڕ بوو لە بڵێسەی تۆڵە.
سەرۆکی مێرووە زەردەکان گوتی:
"خۆزگە هەموومان بە جارێ مردباین و ئەم ڕۆژە ڕەشانەمان نەبینیبا. پاش ئەم هەموو ئازارچەشتنە و دەستەویەخەبوونانە لەگەڵ مەرگ، ژیان چ سوودێکی هەیە؟"

مێرووڵەیەکی زەرد کە ئێسکەکانی دەرپەڕیبوون، بە نووزەنووز گوتی:
"ئێمە تامی تاڵی مەرگمان چەشت."
مێرووڵە زەردەکانی تر هەموو تێکڕا بەدەم گریانەوە گوتیان:
"ئەشکەنجە و ستەمی فیلەکانمان بینیوە."
وەستا مێرووە شەلەی ئاسنگەر بە هیچ جۆرێک دڵی بەرایی نەدەدا ئەوانە بۆ کارێکی دروست و خێرخوازانە هاتبن. شەپۆلێکی گومان لە ناخیدا لە جووڵان و هەڵچووندا بوو. مێرووە زەردەکانی لە مەیدانەکەدا ڕێز کرد و یەکە یەکە چاوی بە ڕیشیاندا خشاندەوە. پاشان دەستەکانی خستە ژێر چەنەی و لە گژ فکران ڕا چوو.
مێرووە ڕیشسوورەکانی تر کە بیستیان مێرووڵەی نوێ هاتوون، لە مزڵەکانیان ڕا، دەستە دەستە لە چیا و دارستان و زنارەکانەوە شۆڕ دەبوونەوە و مەیدانەکەیان دەئاخنی. مێرووڵە زەردەکانیش بێ ڕاوەستان ئەو شتانەیان دەگێڕایەوە کە بەسەریان هاتبوو: "ئەو بەڵایەی فیل بەسەر ئێمەیان هێنا، ئادەمیزاد بەسەر ئادەمیزادی ناهێنێ"، وایان دەگوت و کسپەیان لە جەرگی مێرووڵە ڕیشسوورەکان هەڵدەستاند. تەنانەت لەنێو چاوی دڵڕەقترین ئەو مێروولانەی لە مەیدانەکە جمەیان دەهات و شەپۆلیان دەدا، دڵۆپە فرمێسکێک بەدی دەکرا.

دواجار وەستا مێرووە شەلەی ئاسنگەر چووە سەر نووکی چلەپووشێک و هاواری کرد:
"هاورێیان، دەبێ پێتان بڵێم ئەم مێروولە تازەهاتوانە نەکەوتنە بەر دڵم. ئەم تازەهاتوانە نهێنییەکیان لەپشتە، موویەک لەم ماستە دایە، بەڵام تێنەگەیشتم چییە. من سەیری ڕیشی ئەم تازەهاتوانەم کرد، ڕیشیان هەیە، بەڵام لە ڕیشی ئێمە ناچێ، جوان جوان لە سیمای زەردیانم ڕوانی، خوو و خدەیان لە هیی ئێمە ناچێ."
کە ئەم قسانەی کرد، مێروولەکانی دیکە لە دژی وەستانەوە. دۆخەکە بە شێوەیەک شێوابوو کە تا ماوەیەک لەو تەپوتۆزەدا کەس بە کەسێک بوو نەبێتەوە.
"ئەوان برای ئێمەن."
"بە بەفر و با و بۆران ڕیشیان کاڵ بووەتەوە."
"فیلەکان چەوساندوویاننەتەوە."
"لەژێر ئەو هەمووە زوڵم و ستەمەی فیلەکاندا چ لە مێروولەباتیی مێروولە دەمێنێتەوە؟"
"بۆ ساتێکیش بیر لە خۆمان بکەوە، ئەو ڕۆژانەی ئێمە هاتینە ئێرە، لەوانە خراپتر نەبووین؟"
"کەمێک تێبفکرە، مامۆستا، بیر لە خۆت بکەوە..."
"کە لەسەر باڵی مەلەکە ڕا خۆت فڕێ دا، حەوت ڕۆژ و حەوت شەو نەهاتیەوە سەر خۆت، وەک مردوو تا ئێرە بە شان نەمانهێنای؟"

"هۆ مامۆستا، پاش ئەوەی لەسەر باڵی مەلەکە ڕا خۆت فڕێ دا، بریا خۆت بینیبا... تۆ واز لە ڕیشسوور بێنە، هەزار شایەتحاڵ پێویست بوون بۆ ئەوەی بڵێن ئەمە مێروولەیە."
مێروولەکانی مەیدانەکە، هەر کامە و میوانێکی تازەهاتوو و ماندوویان لە کۆڵ کردبوو، بە مەیدانەکەدا دەسووڕانەوە و هاواریان دەکرد.
دواجار مێرووە شەلە خۆی پێ نەگیرا، دەنگی بەرز کردەوە، گوڕاندی، ئیتر دەنگی بە کەس ڕانەدەگەیشت، هێندەی گوڕاندبوو، دەنگی نووسابوو، پەیتاپەیتا دەپاڕایەوە و دەیگوت:
"گوێم لێ بگرن، گوێم لێ بگرن."
ئەوەندەی قیژاندبوو، هێزی تێدا نەمابوو. ئیدی کەس گوێی لێ نەدەگرت. نەیدەتوانی ئاوا لەسەر ئەو چڵە پووشە بێتە خوارێ، دەبوایە ڕێگەیەکی دۆزیباوە و هەرچۆنێک بێ یەک دوو قسە بە مێروولەکان بڵێ.
کتوپڕ ئاسمان نێوچەوانی تێک نا، هەموو شوێنێ تاریک داهات، هەورەتریشقەی هێنا، باران دایکرد، وەک ڕق و کین... مێرووە زەردەکانی سەر کۆڵی مێروولەکانی تر لەژێر ئەم بارانەدا کە دەتگوت گۆزەیە و سەراوژێر بووەتەوە، لە تەوقی سەر تا نووکی پێ خووسان. ڕەنگی ڕیشی مێرووە زەردەکان شۆردرایەوە و بەسەر پشتی مێروولەکاندا بەرەو خوارێ شۆڕ بووەوە.

قوولکەکانی مەیدانەکە سوور سوور هەڵگەڕان. وەستای ئاسنگەر سەرکەوتوانە هاواری کرد:

"بڕوانن، بڕوانن هۆ مێرووولە ڕیشسوورەکانی برام، بڕوانن! لە ڕەنگی ڕیشیان بڕوانن. بە باران سڕایەوە. پێم نەگوتن ئەمانە نائاساییین؟ پێم نەگوتن ئەمانە ڕیشسووری تەزویرن؟ سەیری ئەم قوڵکە ئاوانە بکەن، بە ڕەنگی ڕیشیان سوور سوور دەنوێنن. ئەمانە زەردەڵەن، زەردەڵە. فیلەکان ئەمانەیان وەک سیخوڕ ناردووە بۆ لای ئێمە. دەریان بکەن، بیانکوژن."

مێرووولەکان سەرەتا لە ئەرزیان ڕوانی، پاشان مێرووولەکانی سەر کۆڵیان هێنایە خوارێ و یەکە یەکە لە ڕیشیان ورد بوونەوە. ڕەنگی ڕیشیان چووبوو و لەبری ڕیشێکی زەرد زەرد دەبینرا.

"چیتان بەسەر هاتووە، چ بووە، خۆ لەکنەخۆ ئێوە ڕیشسوور بوون؟"

مێرووە زەردەکان لە ترسی مردن هەڵدەلەرزین و گوتیان:

"بڕوانن چۆن هەڵدەلەرزین. لە ترسان، لە برسان و لە شەکەتیان وا زەرد هەڵگەڕاوین."

ئەوسا پرسییان:

"ئێوە ئەگەر بترسێن، لە ئێمە پتر زەرد هەڵناگەڕێن؟"

مێرووولەکانی تر تێکڕا گوتیان:

"ئێمەش زەرد هەڵدەگەڕێین، ئێمەش زەرد هەڵدەگەڕێین."

ئینجا بە ڕقەوە لەسەری ڕۆیشتن:

"ئەمانە برای ئێمەن، لێرە نابزوون و ناچنە شوێنی تر، ئەی سەرۆکی ئاسنگەران!"

ئاسنگەر لەبەر خۆیەوە گوتی ماڵوێران بووم. سوڵتانی فیلەکان پیاوەکانی ناردووەتە نێو ئێمە. بەڵام لە لایەکی ترەوە دوودڵ بوو، ئەگەر سوڵتانی فیلەکان پیاوەکانی ناردبایە نێو ئەوان، ئاوا دەیناردن؟ لانیکەم ڕیشی ئەم مێرووە زەردانەی باش باش بۆیاغ دەکرد، یەکە یەکە لەسەر باڵی پەپووەکان دەیهێنانە خوارێ. ئەوانیش دەهاتن و تێکەڵ بە مێرووله سوورەکان دەبوون. کەسیش ئاگای لێ نەدەبوو. ئەم ماستە بێ موو نییە، چ باسە؟ سەرۆکی ئاسنگەرەکان کە ئەو هەمووە سارد و گەرمیی ڕۆژگاری چەشتبوو، بەئەزموون و ژیر بوو، بەرامبەر بەم پرسیارە دۆش دامابوو.

لە مەیدانەکە ئیتر هەر کەسە و شتێکی دەگوت.

"تۆ، تۆ، تۆ ئاسنگەر، چما ئەو دەمەی لەسەر باڵی مەلەکە ڕا خۆت فڕێ دا و ڕات کرد، ڕیشت وا زەرد هەڵنەگەڕابوو؟"

"ئەتۆ خۆزگە ئەودەم خۆت لە ئاوێنەدا بینبا، خۆزگە..."

"ئەودەم خۆت بینبا."

"وەک مێوژۆکە هەڵدەلەرزیی."

"هەر ڕیش نا، بگرە تاڵ تاڵ قژت زەرد هەڵگەڕابوو."

"وەک لیمۆی لێ هاتبوو."

"هیچ کاممان ڕیشسوور نەبووین، بووبووینە ڕیشزەرد."

"وەک لافاوێکی زەرد خۆمان گەیاندە ئێرە."

"ئەی سەرۆکی ئاسنگەران، وەستای مەزن، چەند مانگ، چەند مانگ تێپەڕیێ تا لەو ڕەنگە زەردە ڕزگارمان بوو، تا ڕزگارمان بوو و..."
"هاتینەوە سەر خۆ."
سەرۆکی ئاسنگەران لەوێ، لەسەر چڵەپووشەکە جوولەی لێوە نەدەهات و چاوەکانی وەک مەرمەڕ دەرپەڕیبوون... دەیزانی ئەمانە پیاوی سوڵتانی فیلەکان و سەرکردەی پەپووەکانن، بەلام چۆن ئەم مێرووە ڕیشسوورە گەمژانەی تێگەیاندبا؟ لەگژ فکران ڕۆ چوو، کۆمەڵێک وشەی هەڵخەڵەتێنەر و قایلکەر و کۆمەڵێک ڕێگەی دۆزییەوە، لێ ئەوانی تر هەر گوێشیان پێی نەدەبزووت. دواجار گوتی:
"کەواتە دەیخەمە دەنگدانەوە. ئەمانە لێرە بمێننەوە یان بڕۆن."
هەموویان تێکڕا هاواریان کرد:
"بیخە دەنگدانەوە."
"دەیخەمە دەنگدانەوە، ئەمانە مێروولە زەردەن یان ڕیشسوور؟"
ئەوانی تر بەوپەڕی متمانەوە گوڕاندیان:
"بیخە دەنگدانەوە. بیخە دەنگدانەوە..."
"ئەمانە مێرووە زەردەن؟"
"نەخێر، نەخێر، نەخێررررر!"
"ئەمانە ڕیشسوورن؟"
"بەڵێ، بەڵێ، بەڵێێێ!"

مێروولەکـان لە خۆشـیان لاقەکـانی پێشـوویان بەرز کردەوە و پێکەوە شاییان گێڕا، دارستانێک لە لاقەکانی پێشوویان لە مەیدانەکە دروست بوو.
"چـش، ئیـدی بڵـێم چـی، بەرپرسـیارێتی لە ئەسـتۆی خۆتان، خۆتان پەسەندتان کرد."
"ئـێمە پێشـوازیمان لە براکانمـان کـرد، یـانی قەبوڵمـان نەکردبایەن و فڕێمان دابانەوە بن پێی فیلەکان!"
"بە هۆی ئەم مێروولە زەردانەوە بەڵای زۆر گەورەمان بەسەر دێ."
"ئەی سـەرۆکی ئاسنگەران، تۆ لەوێوە وەرە خـوارێ و ئیدی واز لە سووکایەتیکردن بە براکانمان بێنە."
"ئێســـتا ئەگەر هەموومـــان بـــڕوانیننە ئەم ڕیشـــە چەرمووەت..."
"تێکـڕا پێـت بڵێـین ڕیـش چەرمـوو و لەبەر ئەمەش بتکوژین، ڕەوایە؟ وەرە خوارێ."
چیـی بکـردایە وەسـتای ئاسـنگەران، چیـی لەدەسـت دەهـات، پێـی خـۆش بـوایە یـان نـا، چـاری ناچـار لە چڵەپووشـــەکە هـــاتە خـــوارێ، بە تـــاقی تەنـــێ بەرەو کـونەکەی ڕۆی. کەس لە کـونەکەی نەبـوو. کەسـیش بەدوایدا نەهاتبوو.
لە مەیـدانەکە تاوێـک دەبـوو ئـاگر لە هەمـوو سـووچێ داگیرسابوو و شایی و لۆغـان و میوانداری دەسـتی پێ کردبـوو. دەوروبەر بە هـۆی ئەو ڕەنـگەی لە ڕیشـی مێـروولە زەردەکـان چۆڕابـوو، ئـاڵ ئـاڵ دەینوانـد. دار،

پووشـوپەڵاش، مێـرووولە، زنـار، بەرد، گژوگیـا و خـۆڵ ڕەنگـی سـووری بەخـۆوە گرتبـوو. میوانـداری تـا بەرەبەیـان درێـژەی خایانـد. میوانەکـان خواردیـان و خواردیانەوە، هێندەیان خوارد تا مڕ بوون.

دەمەوبەیـان بـوو کە سـەرکردەی مێـرووە زەردەکـان سـەرجەم مێـرووولە زەردەکـانی لەپشـت گاشـەبەردێک کۆکردەوە:

"ئێسـتا نۆرەی ئەوەیە دەسـت پێ بکەیـن. دەبـێ تـۆڵەی مێرووولە زەردەکان لەمـانە بکەینەوە. دەبێ بەرامبەر بە هەر مێرووولەیەکـی زەرد کە کوشـتیان و فڕێیـان دایە بەردەم دەرگەی سـولتانی فیلەکـان، هەزار، دە هەزار، سـەد هەزار، سـەد ملیـۆن مێـرووولە بکـوژرێ. دەبـێ وەچەی مێـرووولە لەسـەر ڕووی زەوی بسـڕدرێتەوە. دەبێ نەمێننەوە. هەستی تۆڵە وا دڵمی پڕ کردووە کە چیی نەمـاوە سـینگم لە داخـان شـەق ببـا. ئـاخۆ لێرە تەنـانەت مێرووولەیەکـی زەرد بەدی دەکـرێ کەسـێکی نزیکـی بەدەسـتی ئەو مێـرووولە کـوێلە بێشـەڕەفانە نەکوژرابێ؟ ئەگەر ئێمەش هەڵنەهاتباین و خۆمان قوتار نەکردبـا، مێـرووولە کوێلەکـان وەچەی مێـرووولە زەردەکانیان لەسەر گۆی زەوی دەسڕییەوە. هاوڕێیان، بەدەم ڕێـوە قسـەمان کـرد، هەر مێرووولەیەکـی زەرد دەزانێ چ بکا و چ نەکا. ئێسـتا پێش ئەوەی ئەم مێرووە هەشبەسەرە نارەسـەنە ڕیشسـوورە شـەلە، ئەم مێرووە ساویلکە ڕیشسوورانە هەڵبخەڵەتێنێ، دەبێ ببینە تۆز و

نەمێنین. دوو مێرووی زەرد لێک کۆنابنەوە. دەبێ لەنێو
ئەم ئاپۆرا گەورەیەی مێروولەکاندا خۆمان بشارینەوە
چەند ڕۆژی دیکەش مێرووە ڕیشسوورەکان ئێمەیان لە
بیر دەچێتەوە. پاش ئەوەی تەواو تێکەڵ بە مێروو
سوورەکان بووین، ئەوکات دەزانن دەبێ چ بکەن
لەسەر ڕێ چیتان بە مێرووله چیاگەڕەکان کرد
بەمانەشی بکەن، گشت مێروولەکان بەگژ ئەم ئاسنگەرە
ڕیشسوورەدا بکەن، تاکو هەموو ڕیشسوورەکان پێک
هەڵپرژێن، چاوی یەکتری دەربێنن و وا بەرببنە گیانی
یەکتری کە تەنانەت مێروولەیەکی سوور لە گۆڕێ
نەمێنێتەوە. هەر لە کۆنەوە گەلەک ڕێگە هەن بۆ ئەوەی
ڕیشسوورەکان و مێروولەکانی تر ببنە دوژمنی یەکتری
و هەمووتان بە سەدان ڕێگەی بەم جۆرە دەزانن."
مێروولە زەردەکان تێکڕا هاواریان کرد:
"دەزانین."
"لە بیرتان نەچێ زۆر مێروولەی سوور هەن خۆیان پێ
جەغزی دونیایە. بەم پێیە نێچیرەکانتان هەڵبژێرن
ئەوانە پێیان وایە گەورەترین ڕزگاریبەخشن..."
"دەزانین."
"لەنێو ناخی بەشێک لەم مێرووە سوورانەدا شێری
بوون بە فیل خەوتووە... با ئاگادار بن."
"دەزانین، ئاگادارین..."
"هەندێکیان کوشتە و مردووی ناوبانگن. بەم پێیە نزیکی
ئەم دەستەیە ببنەوە."

"دەزانین. لەو ڕێگەیەوە بۆی دەچین..."
"دیارە ئەو مێروولە گەنجە ڕیشسوورانە چاک دەناسن. باش و خراپ هەر خۆیان دەبینن..."
"چاک شارەزای ئەوانیشین، لە نزیکەوە دەیانناسین."
"زۆر زوو دەتوانن لاڕێیان بکەن و بیانکەنە دوژمنی یەکتری."
"ئەوان لە ڕێگەی کتێب و ڕامانەوە بکەنە دوژمنی یەکتری. ئەگەر ویستیان بخوێننەوە با کتێبی فیلەکان بخوێننەوە."
"فیلەکان تێک ناشکێن، تا قیامەت، تا ئەو کاتەی خۆر دەردەکەوێ فیلەکان لە بان سەرمان دەمێننەوە، دەبێ هەموان و سەرجەم مێروولە سوورەکان وا لێ بکەن بڕوا بەمە بێنن."
"ئەمەش دەزانین."
"دەزانم، ئێوە هەموو شتێک دەزانن، باش پێگەیشتوون. بەڵام شتێک هەمیشە و هەمیشە لەبەر چاو بگرن، ئەویش دەزانن چی؟"
مێروولە زەردەکان هەموو تێکڕا وەڵامیان دایەوە:
"چی؟"
"ئەویش ئەو مێروولە سوورانەن دەستیان توێکڵی هەڵداوە. ئەمان، پێتان وا نەبێ دەتوانن لە خشتەیان بەرن. هەر لێشیان نزیک مەبنەوە... هەوڵ مەدەن بە لاڕێیاندا ببەن، ئەوان جیاوازن. لەوەتەی دونیا دونیایە ئەوان زۆریان خەڵەتاندن و درۆودەلەسە بینیوە. ئەوان

لەقاودەر و خولقێنەرن. ترسنۆک و بوێر و نەزان و حاکم و منداڵ ئەوانن. هەڵفریواندن و لە ڕێ دەرکردنی ئەوان بەو مێروولە ڕیشسوورە چاویلکە لە چاوانە بسپێرن کە لە تۆرەمەی ئەوانن."

مێرووە زەردەکان کەیلی خۆشی هاواریان کرد:

"ئەوانیش زۆر لە نزیکەوە دەناسین."

"ئەو دەست قرتماغەبەستوانە مایەی ترسن. دواجار، ئەوان ئەگەر پێیان خۆش بێ، فیلەکانیش دەبەزێنن. ئەوان لە خیز و چەوی دەریاکان و ئەستێرەی ئاسمانەکان پترن."

"دەزانین."

"ئەگەر دەرفەتتان بۆ لوا، چاویان کوێر، گوێچکەیان کەڕ، لووتیان بێ هەستی بۆنکردن و ناخیان بێ سۆز بکەن... سەرجەم مێروولە سوورەکان بۆ ئەم مەبەستە هان بدەن. گەورەترین دوژمن و گەورەترین مەترسی بۆ سەر باب و باپیرانی ئێمەی مێروولە زەردەکان، بۆ سەر سوڵتانی شامان ئەو مێرووە ڕیشسوورە دەست قرتماغە بەستوانەن."

"خۆڵ دەکەینە چاوی مێرووە ڕیشسوورە دەست قرتماغە بەستووەکانەوە، خۆڵ دەکەینە چاویانەوە، خۆڵ."

مێرووی بەساڵاچوو گوتی:

"باشە. زۆر باشە. چاک بزانن لە ناخی زۆر لەو ڕیشسوورانەدا ئاگری فیل بوون کڵپەی دێ. وەک

پێشتریش گوتم ئەم هەستەیان دەرنابڕن. جا ئەم ڕیشسوورانە گەورەترین دوژمنی دەست قرتماغە بەستووەکانن. ئەوان لە ئێمە و لە فیلەکان زیاتر، دوژمنی ئەو دەست قرتماغە بەستوانەن، با خۆیشیان دۆست نیشان بدەن، ئێوە دەبێ شەو و ڕۆژ، بێ ڕاوەستان ئەمانە دژ بە دەست قرتماغە بەستووەکان بورووژێنن.'

'دەیانوروژێنین.'

'بە کورتی، ڕیشسوورەکان دەکەنە هەزار پارچە، هەر دەستەیە و دەبێ بە خوێنی دەستەکەی تر تێنوو بێ.'

مێرووە زەردەکان هاواریان کرد:

'بە خوێنی دەستەکەی تر تێنوو دەبێ!'

'بەشی هەرە زۆری ئەم ڕیشسوورانە بەرز و نزمیی ژیانیان نەبینیوە، بۆنی شیری خاویان لە زاری دێ. بەرامبەر بە ژیان سینگیان کراوە نییە. خۆیان زۆر مەزن دەبینن.'

'دەزانین.'

'ئیتر بەم پێیە هەڵسوکەوت بکەن. ئێوە دەرهەق بە ڕیشسوورەکان زۆر شت دەزانن. کەواتە ئێستا بڵاوەی پێ بکەن و لەبەر چاوان ون بن، لە ناخ و دڵی هەر ڕیشسوورێکدا ئاگرێکی لە وەسف نەهاتووی تۆڵە و ترس و دوژمنی دەرهەق بە ڕیشسوورەکانی تر دابگیرسێنن. تۆقاندنتان لە بیر نەچێ. تۆقاندن، گەورەترین و کۆنترین ڕێگەیە بۆ ئەوەی مێروولەکان پێکدا هەڵپڕژێن. لە یەکتریان بسڵەمێننەوە. تۆوی ترس

لەنێو دڵیاندا بچێنن، پەرەی پێ بدەن، تا لەنێو دڵ و مێشک و ڕۆحیاندا چەکەرە بکا. ترس لە فیل، ترس لە لافاو، هەرچی بە مێشکتاندا گوزەری کرد، هەر ترسێکی پێتان شک هات، وەک باران بە سەریاندا ببارێنن. ترس، مێروولەکان سەقەت دەکا، لە پەلوپۆیان دەخا، لە مەرگ خراپتریان بەسەر دێنێ. ترس لە خودا و ترس لە یەکتری بێوچان پەرە پێ بدەن."

"پەرە بە ترساندنیان دەدەین. هەزاران خوداوەندی ترس لە بان سەری ڕیشسوورەکان دروست دەکەین."

"ئاگری خۆپەرستی و ترس پێکەوە هەڵبگیرسێنن، ئەوان دەڵێن ئێمە براین، هاوڕێین، گوێتان بەم قسانە نەبزوێ. لە ناخی زۆربەیاندا ئاگرێکی نەکوژاوەی خۆپەرستی لرفەی دێ، دوژمنایەتیی یەکتری لای مێروولەکان لەم خۆپەرستییەدا گەرا هەڵدێنێ، مردن، ترسان و ساردوسڕی بەم خۆپەرستییە لەدایک دەبن. بە هیچ شێوەیەک مۆڵەت مەدەن ڕیشسوورێک ڕیشسوورێکی تری خۆش بوێ. ئەگەر ئەمانە یەکتریان خۆش بوێ، لەو شوێنانەی ئەڤین هەبێ، خۆپەرستی لانە ناکا، ترس و سووکایەتی گەرا هەڵناهێنن، ئامان، مۆڵەت بە خۆشەویستی مەدەن. ئەگەر ئەمانە فێر بن یەکتریان خۆش بوێ، درەنگ یان زوو ڕێگەیەک بۆ تێکشکانی ئێمە و فیلەکانیش دەدۆزنەوە. ئامان، ئێزن مەدەن ئەمانە یەکتریان خۆش بوێ. قەت ئەم دەست قرتماغە بەستوانە پشتگوێ مەخەن، هەر ئانوساتێ بۆی هەیە

لافاوی ئەوین وەک تیشکێک لەوانەوە هەستێ و بەنێو سەرجەم ڕیشسوورەکاندا بڵاو بێتەوە، ئەوکات هەموومان تێدا دەچین. هەر کام لەو دەست قرتماغە بەستوانە کانییەکی ئەوینە. تێگەیشتن؟ ئاگری بێ ئەوینی و دوژمنایەتی خۆش بکەن."
"تێگەیشتین، ئاگری بێ ئەوینی و دوژمنایەتی خۆش دەکەین."
"گەردنی یەکتری ئازاد بکەن، ئەم ڕێگەیە چوون و تێداچوون، گەڕانەوە و مردنی تێدایە. ئەمنیش دەچم ئاسنگەری شەل بە لاڕێدا بەرم و پۆلووی شەکەتی، گومان، ترس، بێباوەڕی و بێئەوینی لە ناخیدا بکەشێنمەوە."
مێروولەکان گوتیان:
"بەخێر بچی."
مێرووی پیر فەرمانی پێ دان:
"دەقەیەک لێرە چاوەڕێم بن."
ئینجا پشتی تێکردن، لەودیو تاشەبەردێکی تەنیشتیان لەبەر چاو ون بوو و زۆری پێ نەچوو هاتەوە و گوتی:
"سەیری ڕیشم بکەن. ئێوە تا ئێستا بینیوتانە هیچ ڕیشسوورێک ڕیشێکی وا بریقەدار، درێژ، ئاڵ و گەشی هەبێ؟"
بەڕاستییش ڕیشی وەک تیشکی خۆر بریسکەی دەهات. ڕیشی وایان بە هیچ ڕیشسوورێکەوە نەبینیبوو. ڕیش تاڵ تاڵ و چڕ و پڕ بوو. لە لێرەوارێکی سوور دەچوو.

"ئەگەر ئاسنگەری شەل لە ماوەی چل ڕۆژە ڕێ ڕا ئەم ڕیشە ببینێ، کڕنووش دەبا یان نا؟ پێم بڵێن لەمەوبەدوا کێ لە سووربوونی ڕیشم وەگومان دەکەوێ؟"

مێرووە زەردەکان بە سەرسامییەوە هاواریان کرد:

"چ قەوما، ئەم ڕیشەت لە کوێ دۆزییەوە، ئەی سەرکردەی مەزنمان؟"

مێرووەکە گوتی:

"بێدەنگ، مەگوڕێنن."

ئەوەی ڕاستی بێ پیرترین مێرووی زەرد بەم هونەری ڕیشەی، شایانی ئەوە بوو پێشەنگایەتی بکا.

"بێدەنگ بن و لێرە بڕوانن."

وای گوت و ئاماژەی بە قەڵشتی تاشەبەردەکە کرد، مێرووە زەردەکان بە پڕتاو لەوێ نزیک بوونەوە، بینییان تەرمی مێرووولەیەک پانەوپان کەوتووە، ڕیشیشی پێوە نەماوە.

"وەرنە پێشێ، گوێتان باش بە زارمەوە بنێن، من ئەم ڕیشسوورەم کوشتووە، ڕیشیم بڕیوە و بە دەموچاوی خۆمەوە نووساندووە. جوان سەیرم بکەن، ئاخۆ لەگەڵ ڕیشسوورێک هیچ جیاوازییەکم هەیە؟"

مێرووولەکان بە ئەسپایی گوتیان:

"نەخێر."

"تەواو بوویتە مێرووولەیەکی ڕیشسوور ئەزبەنی، ئاوا تەنانەت ئاسنگەری شەل نازانێ کە تۆ ڕیشسوور نییت."

سەرکردەی مێروولەکان پێکەنی و بە شانازییەوە گوتی:
"پێ نازانێ. وام پێوە نووساندووە نەبێتەوە. ئەگەر بێت و فیلێک قۆرتمەکەی لە ڕیشی من بهاڵێنێ و ڕایکێشێ، تەنانەت ناتوانێ تاڵێکی لێ بپسێنێ."
مێروولەکان هاواریان کرد:
"بژی! بژی فەرماندە! لەمەوبەدوا پێت دەڵێین فەرماندە... فەرماندەی گەورەمان..."
"ئەگەر لە دەستتان هات، ئێوەش هەر کامتان ڕیشسوورێک بکوژن، ڕیشی هەڵقەنن و لە چەنەی خۆتانی بدەن. ئەوکات، کەس نازانێ داخوا ئێوە مێروولەی زەردن یان نا. ئەوسا وەک ماڵی باوکتان لە وڵاتی ئەم مێروولە سوورانە دەسووڕێنەوە و جڕت لێ دەدەن. جا وازیشیان لێ دێنین خۆبەخۆ یەکتر بکوژن و تۆڵەی خۆمان لە وەچەی مێروولەکان دەکەینەوە. زۆریش خۆشحاڵ بووم بە فەرماندە بانگتان کردم."
"هەر کاممان سێ مێروولە دەکوژین و ڕیشیان هەڵدەقەنین."
"دەی بەخت یارتان بێ."
ئینجا لە بوومەلێڵی بەیانیدا، مێرووە زەردەکان کتوپڕ لەبەر چاوان ون بوون، هەر دەتگوت قەت نەبوون.
مێروولەی فەرماندەش بەرەو کولانەی ئاسنگەری شەل هەنگاوی نا. ئاسنگەری شەل لە کوونەکەی لاقە شەلەکەی بە سکیەوە نووساندبوو و خەوی لێ کەوتبوو. سێ ڕیشسووری زۆر گەنجیش لە بان

سەری بوون. فەرماندە لەبەر خۆیەوە بیری لەوە کردەوە چۆنە ئەو سێ گەنجە ڕیشسوورە و ئاسنگەری شەل بە یەکەوە بکوژێ. چەقۆکەی دەرهێنا و پەلاماری کونەکەی دا، لەناکاو لاقێک وەبەر لاقی درا و بەسەر سکدا کەوتە ئەرز.

"ڕاوەستە، قەدەغەیە!"

مێرووە زەردەکە گوتی:

"من فەرماندەم. فەرماندەی گشتیی ڕیشسوورەکانی پشت چیای قافم. لای ئێوە بە پاشقولدان پێشوازی لە میوان دەکەن؟ چیی وای نەمابوو مێشکم بپژێ."

گەنجی ڕیشسوور داوای لێبوردنی لێ کرد و گوتی:

"ببوورە. ئەخر مامۆستا خەوتووە..."

فەرماندە گوتی:

"خێرا هەڵیسێنن. هەر ئێستا. من چل ڕۆژە بەڕێوەم. فیلەکان وڵاتی ئێمەیان وێران و تاڵان کرد، ئاگریان تێبەردا، مێروولەکانیش بە دیل گرت. من بە ئەستەم توانیم خۆم ڕزگار بکەم و خۆم بگەیەنمە ئێرە."

گەنجە ڕیشسوورەکە مامۆستای هەستاند و فەرماندەی پێ ناساند:

"ئەمە لەپشت چیای قافەوە دێ. ڕیشسووری چیاکانی قافە... ماوەی چل ڕۆژە بە ڕێوەیە."

مامۆستا لە میوانە تازەهاتووەکەی پرسی:

"چۆن هاتی هاوڕێ؟"

فەرماندە، ماندوو، خەواڵوو و لارەمل گوتی:

"باڵندەیەکی گەورە هەیە، حاجی لەقلەقی پێ دەڵێن، دڵێکی پاقژی هەیە، بێهەوایە، خێرخوازە، سواری باڵەکانی کردم و هەتا لای تۆی هێنام."

"کێ بە تۆی گوت من لێرەم؟"

فەرماندە بە بزەوە وەڵامی دایەوە:

"حاجی لەقلەق گوتی."

"حاجی لەقلەق چووزانێ من لێرەم؟"

"تۆی بینیوە."

"سەیرە... ئەو حاجی لەقلەقە گەورەیە لە ئاسمانەوە چۆن بوونەوەرێکی بچووکی وەک منی بینیوە!"

فەرماندە گوتی:

"حاجی لەقلەقەکان ئاوان. چاویان لە مەودای چل ساڵ ڕێگەوە مێروولەیەکی ڕەشی سەر بەردێکی ڕەش دەبینێ. منیشی ئاوا بینی. کە فیلەکان وڵاتی ئێمەیان خاپوور کرد و ئاگریان دا، زۆربەی هەرە زۆری مێروولەکانیان کوشت و ئەوانی تریان بە دیل گرت، من هەڵاتم و پەنام بردە بەر لوتکەی چیای قاف، لەوێ لەنێو بەفر و بەردەکاندا مامەوە. لە لوتکەی چیای قاف هیچ شتێک بۆ خواردن چنگ ناکەوێ. لە برسان چاوم ڕێشکەوپێشکەی کرد. هێز و تینم نەما، لەسەر بەفرەکە کەوتم، لە گیانەڵادا بووم کە گوێم لە خشەخشێکی قورس بوو، لە بان سەرم هەستم بە گەرما کرد، لە پشتەوەم دەنگێکم بیست، دەنگەکە لێی پرسیم 'گیانەوەری یان جندۆکەی، تۆ کێی ئەی بوونەوەرەکە؟'

لە ترسـان بـێ ئەوەی چـاوم هەڵێنم وەڵامـم دایەوە، بە ئاستەم توانیم ئەو شتانەی بۆ بگێڕمەوە کە بەسـەرمان هـاتبوو. لـێم پرسـی 'ئەی تـۆ کێـی؟' گـوتی 'مـن حـاجی لەقلەقـم. چ داواکارییەکـت هەیە پـێم بڵـێ.' بڕسـتم لـێ بڕابـوو، لە برسـان هێـزی دەسـت و پـێم نەمـابوو. پـێم گوت 'برسیمە. سکم تێر کە با چاوم بۆ هەڵبێ، پاشـان قسە دەکەین.' یەکسـەر هەنگوین و شیلەی گوڵی پێ دام و یەکســـەر چاوەکـــانم کـــرانەوە. پـــێم گـــوت 'مـــن مێروولەیەکی ڕیشسـوورم.' لـێم پرسـی 'ئـاخۆ دەتـوانی ببمەیە لای ڕیشسـوورەکان؟' منـی لەنێو درزی گەرمـی تاشـــەبەردێک خەوانـــد، هەنگـــوین و شـــیلەیەکی زۆری گوڵی لەپێش دانام، بێ ئەوەی وشـەیەک بڵێ لە شـەقەی بـــاڵی دا و فـــڕی. کە ڕێـــک دوای پێـــنج ڕۆژ بینـــیم گەڕاوەتەوە، لە خۆشـیان خەریـک بـوو شـێت بـم. پێـی گوتم 'دۆزیمەوە. لەسەر لوتکەی چیا بەرزەکەی ئەودیو ئاسنگەرێک دەژی، سـەرجەم ڕیشسـوورەکانی دونیـاش لەوێن. دەتوانم بتبەم بۆ ئەوێ.' پێم گوت 'ڕاوەستاو بی. هەر بـژی. بمـبە بـۆ ئەوێ.' لەسـەر بـاڵی دانـام، لەسـەر پەڕە نەرم و گەرمەکـانی... لەوێـوە فـڕیین و تاوێـک لەمەوپێش، لێرە، لەپشت ئەم بەردانە دایبەزاندم.'

وەستای ئاسنگەر گوتی:

'بەخێر بێی.'

خـواردنەکەی خـۆی پـێ دا. بە تێروتەسـەلی دوانـدی، لە تاڵ تاڵی ڕیشـی ڕوانـی، هەڵیسـەنگاندن، پرسیاری چەکە

و بنەچەکەی لێ کرد، بڕوای بەوە هێنا کە ڕیشسوورە و فەرماندەی ڕیشسوورەکانە.
ڕووخۆشانە گوتی:
"هاوڕێم، مێروولەی وەک تۆ بۆ من زۆر پێویستن. بەخێر بێی و سەر چاوم هاتی. پێ و قەدەمت لە بان سەرم. دوێنێ کۆمەڵێک مێروولەی زەرد هاتنە ئێرە کە ڕەنگی سووریان لە ڕیشیان دابوو و خۆیان بە ڕیشسوور دەناساند، سیخوڕی فیلەکان بوون..."
فەرماندەکە بە ترسەوە پرسیی:
"چییان لێ هات، ئێستا لە کوێن؟ ئەو مێرووە زەردانە بوون ولاتی ئێمەیان ڕوخاند، ئەو مێرووە زەردانە... دەخیلە وەستا، با زوو بیاندۆزینەوە."
وەستای ئاسنگەر لە داخان دڵی هەپروون بە هەپروون بوو و بە ئەسەفەوە گوتی:
"تازە بۆمان نادۆزرێنەوە، ڕیشسوورەکانی خۆمان لە دژی من داڵدەیان دان و داکۆکییان لێ کردن. ئەگەر بشمرم، ئەو گەمژانەی ئێمە تەنانەت تاڵێکی ئەو مێرووە ڕیش زەردانەم پێ نادەن."
فەرماندەکە ورەی بە ئاسنگەری شەل دا و گوتی:
"من ئەوانت بۆ دەدۆزمەوە، تۆ هیچ خەفەت مەخۆ، ئاسنگەری برام. بە ڕیشسوورەکانت دەسەلمێنم ئەوانە مێرووە زەردەن و مێرووە زەردەکانیش خیانەتکارن."
فەرماندە و ئاسنگەری شەل بە سۆزەوە باوەشیان بە یەکدا کرد. مێرووی شەل چۆن دڵخۆش نەبوایە کە

لەنێو ئەو هەموو گەمژەیەدا جێگرێکی ژیری بۆ خۆی دۆزیبووەوە. بەتایبەت کە ڕیشسوورێکی ڕەسەن بوو. نەخاسمە کە وڵاتەکەی لە داوێنی چیای پیرۆزی قاف هەڵکەوتبوو. بەتایبەت کە ڕیشە سوورەکەی لە هیچ ڕیشێک نەدەچوو. نەخوازە کە ڕیشە درێژەکەی لە چەنەیەوە تا سەر سینگی شۆڕ بووبووەوە و شۆقی دەدایەوە و ڕووناکایی لێ دەباری.

مێرووە شەلە بە کەیف و متمانە و تینی دۆستایەتییەک کە ناخی تەژی کردبوو، بیری دەکردەوە. لەبەر خۆیەوە دەیگوت بە دەستێک چەپڵە لێ نادرێ، بەڵام بە دوو دەست با. مەست و سەرخۆشی بیرکردنەوە بوو. دیارە ئەم ڕیشسوورە پیرە، ئەم فەرماندەیە کوێرەوەرییەکی زۆری چەشتووە. دیارە زۆر ئاقڵ و فێڵزانە. لەگەڵ ویدا دەتوانێ زۆر کێشان چارەسەر بکا.

ئەو بەیانییە سەرجەم چیاکان، زنارەکان، ڕێ و بانەکان، خاکە نەزۆکەکان، دەشت و چۆمی خرۆشاو، گۆل، ئەستێر، کانی و نێوقەدی دارەکان لەناکاو پڕ بوون لە گوڵ. بۆنی نیانی گوڵ بەو ناوەدا بڵاو بوویەوە. هەورە سپییەکان، لە ئاسمان، لە دووردەست، لە باشوور ڕەوینەوە. دونیا لە زوڵاڵی پاش باراندا بوو. مێروولەکان لە هێلانەکانیان، لە قەڵشتە بەردەکان و لە کونەکان هاتبوونە دەرێ، خۆیان وەبەر تاوێ دابوو و ڕیشیان دادەهێنا. مەست و ئارام ڕاکشابوون و مەیدانە پان و ڕێکەکەیان ئاخنیبوو.

مێرووه شەلەش هاتبووه بەر دەرکی هێلانەکەی، پشتی بە چڵەپووشێکەوە دابوو، خۆی لەبەر تاوێ هەڵخستبوو و لەگەڵ فەرماندەدا دەئاخفی. لە قسەکانی فەرماندە تێر نەدەبـــوو، حەیرانـــی هەڵســـوکەوت و بۆچـــوونە شۆڕشگێڕییەکانی بوو. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: "ئەگەر لەنێو مێروولەکاندا سێ مێروولەی وەک ئەمە هەبوایە، نەک هەر فیل، بگرە تەقلەم بە مرۆڤەکانیش لێ دەدا." بێ ڕادە بەختەوەر بوو هاوڕێیەکی وا ژیر و ڕیشسوورێکی وا دڵســـۆزی دۆزیـــوەتەوە. لەوەتەی لەســـەر بـــاڵی پەپوولەکە ڕا خۆی فڕێ دابوو و هاتبووە ئێرە، ئەوە یەکەم جار بوو تووشی بە تووشی مێروولەیەکی وا ئاقڵ دەبوو. فەرماندە بەردەوام سەری دەجوولایەوە. ئەگەر ڕۆژێک فیلەکان تێک بشکێن، بێگومان لە سایەی ســـەری ئەم فەرمانـــدە ژێـــرەوە هەرەس دێـــنن. مێروولەیەکـــی چەنـــد جوانیشـــە. پشـــتی زەرد زەرد، چاوەکانی درشت، دەتگوت چاوی زەردەواڵەن، لەشی بەهێز، ڕیشێکی بریقەدار، لاقەکانی وەک لاقی مێرووە عەجەمە پـتەو و خێـرا بـوون. لەوەتەی دەژی، تەنیـا مێروولەیەک لەگەڵیدا هاوڕا بووە، ئەم فەرماندەیەیە.

فەرماندەش قاچەکانی ڕاکێشابوو، شل شل خۆی دابووە بەر تاوی تازەهەڵاتوو و پشووی دەدا. فەقیرە زۆر ماندبوو بووبوو، چ بکا، لەژێر قاچی فیلەکان خۆی ڕزگار کردبوو و لە داوێنەکانی چیای قافەوە تا ئێرە ڕێی کردبوو. مێروولەکانی ئەوێ ئاوا نەبوون، ئەوان لە

شارەکانی ژێر ئەرزدا کۆشکی سێ و پێنج و حەوت نهۆمیان هەبوو. وا بە ئاسانییش خۆیان ڕادەستی فیلەکان نەکردبوو، تا کۆتایی شەڕیان کردبوو، تا هێزیان لێ بڕابوو. بەشی زۆری مێروولەکانی چیای قاف لە چیاکانیاندا بوون و هەرچەندەش هیوابڕاو بوون، بەڵام دژ بە فیلەکان درێژەیان بە شەڕ دابوو.

بۆ یەکەم جار لەوەتەی هاتبوو، پرسیی:

"مامۆستا، ئێوە لێرە چ دەکەن، دژ بە فیلەکان شەڕ دەکەن؟"

تا ئەو ساتە بەس بەسەرهاتەکانی خۆی گێڕابووەوە. وەستای ئاسنگەریش خۆشحاڵ بوو کە سەبارەت بە هیچ شتێک پرسیاریان لێ نەکردبوو.

ئاسنگەر وەڵامی دایەوە:

"ئێمە ئیستا چاوەڕێین فەرماندەی هاوڕێم، شەڕکردن دژ بە فیلەکان هێندە سانا نییە."

"بە هیچ شێوەیەک سانا نییە، بەڵام دەکرێ ئاوا دانیشی و دەست لەسەر دەست دانێی؟ جگە لەوە، ئەگەر بەتاڵوحەتاڵ دابنیشی، ئەم مێرووە سوورانە تەوەزەل دەبن و شەڕیان لە بیر دەچێتەوە."

"فیلەکان زۆر زەبەلاحن و مێروولەکان زۆر بچووکن فەرماندەی هاوڕێم. بە ڕۆژ و مانگ پەیتاپەیتا بیر دەکەمەوە و ڕێگەیەکم بۆ شەڕکردن دژ بە فیلەکان نەدۆزیوەتەوە."

وای گوت و بە مەراقەوە لە فەرماندەی پرسی:

"چۆن دەکرێ شەڕیان لەگەڵدا بکەی؟"
فەرماندە قسەکەی پشتڕاست کردەوە و گوتی:
"وایە. هەمــوو ئەو مێــروولانەی ئێــرە کــۆبکەیتەوە و بیاننێری بۆ شەڕ، دەرەقەتی فیلێک نایەن. دەڵێن وڵاتێک هەیە مێروولەکــانی هێنــدەی فیلێــک گەورەن، بەڵام ئەو وڵاتە زۆر دوورە، ئەگەر هەواڵ بـۆ مێروولەکـانی ئەوێ بنێرین، ڕەنگە بێن و لە کۆیلایەتی ڕزگارمان بکەن."
"ئەوان دێن، من دەیانناسم، فیلەکان ڕاو دەنێن و پاشـان دەمـانکەنە یەخسـیر و کـۆیلەی خۆیـان. دەبـێ خۆمـان چارەیەک بۆ خۆمان بدۆزینەوە."
"ئێمە نـاتوانین چـارەیەک بـۆ دەردی خۆمـان بـدۆزینەوە، مامۆستا. فیلەکان زۆر گەورەن."
"بێهیـوا مەبە، لەوانەیە ڕێـگەیەک بـدۆزینەوە، فەرمانـدەی هاوڕێم. سـەیر بکە بزانە مـن چیم کردووە، مێروولەی سـوورم نـاردووەتە سـەرجەم وڵاتــان و نێـو مێـرووله کوێلەکراوەکان. ئەوان ڕیشـیان تاشـیوە و کتومـت وەک مێروولەکانی تریـان لـێ هـاتووە، شانبەشانی ئەوان کـار دەکەن، زوڵــم و ســـتەم دەبیـــنن، برســـی دەمێنـــنەوە. ئەمنــیش شـــەو و ڕۆژ، ســـەبارەت بە مێروولەکـــان، دەربـــارەی فیـــل و مێروولەکـــانی پێشـــوو کتێـــب دەخـــوێنمەوە، لایەنگرەکانیشـــم بێوچـــان خەریکـــی کتێبخوێنـدنەوەن. ئـێمە لێـرە کتێـب دەخـوێنینەوە و بیـر دەکەیـــنەوە، ســـەرجەم مێروولەکـــانی هاوڕێمـــان لە

سەرانسەری دونیادا کتێب دەخوێننەوە، کار دەکەن و بیر دەکەنەوە."
فەرماندە گوتی:
"جا ئەمە چیی لێ شین دەبێت. بە کتێب خوێندنەوە و ئیشکردن شانبەشانی مێرووە یەخسیرەکان فیلەکان تێک ناشکێن..."
"بڕوانە فەرماندەی هاوڕێم، گوێم لێ بگرە، من لە هەمان کاتدا کاری ڕێکخستن ئەنجام دەدەم... ئەگەر ڕۆژێک ڕێگەکەمان دۆزییەوە و گشت مێروولەکان پەلاماری فیلەکانیان دا..."
فەرماندە لە قاقای پێکەنینی دا، ئەوەندە پێکەنی فرمێسک بە چاوانیدا دەهات.
"بۆچی پێدەکەنی فەرماندەی هاوڕێم؟"
فەرماندە لەبەر پێکەنین نەیدەتوانی وەڵامی بداتەوە، وا پێدەکەنی چیی نەمابوو لەسەر پشت بکەوێ.
"پێ... پێدەکەنم... پێدەکەنم، چونکە..."
"چونکە چی؟ قسەکانم مایەی پێکەنینن؟"
"هەر زۆۆۆر..."
"باشە بۆچی؟"
فەرماندە تێر تێر پێکەنی، پاشان کەمێک هاتەوە سەر خۆ، ڕوخساری سوور سوور هەڵگەڕابوو، هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:
"بڕوانە مامۆستا، مامۆستای لەهەنگ و بوێر و شێرم، ئاخر فیل قەت دەبەزن؟ لەوەتەی دونیا دونیایە کێ

بینیوبەتی مێرووله فیل ببەزێنن؟ دونیا هەر وا بووه و هەر وا دەبێ. فیل فیله و مێرووله مێروولەیه... فیلەکان حوکمڕانی دەکەن، ئەمه کاری ئەوانه، مێروولەکانیش ئیش دەکەن، فیلەکان پاڵ دەدەنەوه و بۆی دەنوون، خۆشترین خۆراکەکان دەخۆن، جوانترین جلەکان له بەر دەکەن و له بەشکۆترین کۆشکەکاندا دەژین... مێروولەکانیش ئەمه وەزعیانه، به کولەمەرگی دەژین، ساڵ دوانزەی مانگ کار دەکەن و له کۆتاییشدا هەرچی هەیانه و نیانه دەیخەنه چنگی فیلەکانەوه، خۆشیان برسی دەمێننەوه. قانوونی سروشت وایه، قانوونی مرۆڤەکانیشە، ئەو مرۆڤانەی خۆیان به مەخلووقی پیرۆزی سروشت دەزانن و پەسنی خۆیان دەدەن. ئەم دونیایه ئاوا هاتووه و هەر واش دەڕوا. بیر بکەوه وەستا، کەمێک تێڕامێنه برام، ئەگەر بەقەد چیایەک مێرووله له دەوری یەک کۆببینەوه و فیلێک پەلامارمان بدا، چ دەقەومێ؟"
وەستا شەلەی ئاسنگەر بۆ یەکەم جار به شک و گومانەوه چاوی له چاوانی مێروولەکه بڕی. له دڵی خۆیدا گوتی ئەمه مێروولەیەکی زەرد نەبێ. ئەمه مێروولەیەکی زەردی خیانەتکار... پاشان دیسان له دڵی خۆیدا گوتی ئەم فەرماندەیه ترساوه. مێروولەیەک له کوشت و کوشتارێکی وا ڕزگاری بووبێ و ئافاتی فیلەکانی به چاو بینیبێ، چۆن وا نائومێد نابێ؟
ئاسنگەر پێی گوت:

"هەق بە تــۆیە. هەق بە تــۆیە، بەڵام ئەم مێــروولانە بەهێزتــرین بوونەوەرەکــانی گەردوونــن. فیلەکــان چەندەش بەهێز بن، دەبێ ڕێگەیەک بدۆزینەوە و لەم ژێردەستییە ڕزگارمان بێ. دیارە ئەو ڕێگەیەش دواجار دەدۆزینەوە!"

فەرماندە گوتی:

"لێ بۆ ئەم مەبەستە هیچ ناکەین و هیچ چالاکییەکمان نییە. پێویستە هەڵمەت بەرین، لانیکەم دەبێ وەک مێروولەکانی ئێمە درێژە بە شەڕ بدرێ. من تەنانەت بۆ جارێکیش بیرم لەوە نەکردووەتەوە بتوانین فیلەکان ببەزێنــین، بەڵام شــــەڕم بە پێویســـت زانیــــوە. نەشیانبەزێنین، دەبێ شەڕ بکەین. شەڕ تاکە هیوایە."

ئاسنگەری شەلیش بەم جۆرە بیری کردبووەوە و بە هیچ ئاکامێک نەگەیشتبوو. تاکە هیوا شەڕە، بەڵام چۆن شەڕێک؟ شەڕ بە بێهیوایی دەکرێ؟ ئەگەر بێهیوا بچیتە شەڕەوە، ئەوە شەڕ نییە، مردنە، شەڕ چەندین جۆر و شێوازی هەیە. دەبێ بە هیواوە بچی بۆ شەڕ، ئەگەر بەزیی ئەوە شتێکی ترە، بەڵام دەبێ دڵ پڕ لە هیوا بچی.

ئەم فیکرانەی بۆ فەرماندە باس نەکرد. تەنیا گوتی:

"ئەگەر مێروولەکانی ئێوە لەپێناو نەبەزاندنی فیلەکان شــەڕ دەکەن، ئەمە شــێتبوونە، باشــە مــرۆڤ لەپێنــاو نەبەزاندنــدا شــەڕ دەکــا؟ مێروولەکــان شــێوازێک بــۆ تێکشکاندنی فیلەکان دەدۆزنەوە."

فەرماندە هەمدیس پێکەنی:

"هەهەهە... نادۆزرێتەوە، مەحاڵە. فیل چۆن تێک دەشکێن؟"
ئاسنگەری شەل گوڕاندی:
"تێک دەشکێن. ڕێگەیەک بۆ بەزاندنی فیلەکان دەدۆزینەوە. مێرووولەکان ڕقئەستوور و داهێنەرن. فیلەکان دەبەزێنین..."
فەرماندە دەنگی بەرز کردەوە:
"کەوایە شەڕ بکەن. بە دانیشتن لەو شاخوداخانە فیلەکان نابەزن."
"ڕێگەیەک هەر..."
ڕێک لەو ساتەدا چەقوهەرایەک لە مەیدانەکە ساز بوو کە ئاسنگەری شەل لەوەتەی هاتبووە ئێرە، ژاوەژاوی وای نەبیستبوو. دەنگێک بوو دەتگوت ئەو چیا گەورەیە لە نێوەڕاستەوە درزی بردووە. مێرووە شەلی ڕیشسوور یەکسەر بەرەو ئەوێ ڕای کرد و بینیی مەیدانەکە لیپاولیپ بووە لە مێروولە کە بەسەر یەکدا کەوتبوون و تێک خزابوون... ڕیشسوورێکی گەنجیش چووبووە سەر بەرزترین چڵی پنچکێک و بە سۆزەوە قسەی دەکرد، زایەڵەی دەنگە گوڕەکەی چیا و چیا دەڕۆی. دەیگوت:
"نا بۆ فیل و بۆ سوورەکان! نا بۆ فیل و بۆ سوورەکان، بەڵێ بۆ مێروولەی ئازاد و سەربەخۆ..."
ژمارەیەک لە مێروولەکانی مەیدانەکەش چەپڵەیان بۆ لێ دەدا.

مێرووله‌ی سه‌ر چڵه‌كه‌ ده‌یگوت:
"ئێمه‌، ئێمه‌ ته‌واوی مێرووله‌كان ده‌هێنینه‌ سه‌ر ئه‌م چیایه‌، ولاتانی مێرووله‌كان چۆڵ ده‌كه‌ین و ڕاكێشی ئێره‌یان ده‌كه‌ین، سه‌رجه‌م مێرووله‌كانی گه‌ردوون ده‌هێنین و شه‌ڕ هه‌ڵده‌گیرسێنین. به‌ مێرووله‌ كرێكاره‌ ژێرده‌سته‌كان به‌ره‌و ڕزگاری ده‌چین، نه‌ك به‌ فیله‌كان و ڕیشسووره‌كان و ده‌ست قرتماغه‌ به‌ستووه‌كان."
چه‌پڵه‌ڕێزان زیاتر و فراوانتر بوو.
"مێرووله‌ ژێرده‌سته‌كانیش ته‌نیا خۆیان ده‌توانن خۆیان ڕزگار بكه‌ن. هیچ پێویستییه‌كمان به‌ ده‌ست قرتماغه‌ به‌ستووه‌كان نییه‌. نه‌ ده‌ست قرتماغه‌ به‌ستووه‌كان و نه‌ فیله‌كان، به‌ڵكو مێرووه‌ ژێرده‌سته‌ ئازاد و سه‌ربه‌خۆكان. چاوی فیله‌كان ده‌ردێنین. فیلێكی كوێر ولاتی مێرووله‌كانی بۆ نادۆزرێته‌وه‌، ئیتر ڕێگه‌یان لێ تێك ده‌چێ و ده‌كه‌ونه‌ نێو ده‌ریاوه‌. به‌م جۆره‌ دونیا له‌ چنگ فیله‌كان ڕزگاری ده‌بێ."
چه‌پڵه‌ڕێزان حه‌شری به‌رپا كرد.
ماوه‌یه‌كی زۆر قسه‌ی كرد، له‌ كاتێكدا ده‌یگوت نا بۆ ده‌ست قرتماغه‌ به‌ستووه‌كان و نا بۆ فیله‌كان، كه‌یلی ئاره‌ق له‌سه‌ر چڵه‌كه‌ هاته‌ خوارێ. ئه‌و مێروانه‌ی چه‌پڵه‌یان لێ ده‌دا، خستیانه‌ سه‌ر قه‌لاندۆشییانه‌وه‌.
به‌دوای ویدا مێرووله‌یه‌كی درێژی ڕه‌ش به‌سه‌ر چڵه‌كه‌دا هه‌ڵزنا، دركه‌كانی پنچكه‌كه‌ سكیان ڕووشاند، چونكه‌ سكی ڕووت بوو.

دەستی بە ئاخاوتن کرد:

"هاورێیان، ڕیشسوورەکان. ڕووی قسەم لە ئێوەیە، گوێم لێ بگرن، باش گوێ ڕادێرن... هەر ئێستا شەڕ ڕادەگەیەنین. فیلەکان تەفروتوونا دەکەین. مێروولەیەک، ئەویش مێروولەیەکی ڕیشسووور یەکسانە لەگەڵ گەردوون. فیلەکان ئەو بوونەوەرانەن هەرگیز تێک ناشکێن. ئێمەش ناتوانین بیانبەزێنین، بەڵام شەڕ دەکەین. بە تاڵی جاڵجاڵۆکەکان داو دەتەنین و لەسەر ڕێی فیلەکانی دادەنێین، ئەم داوانە لە پێی فیلەکان دەهاڵێن... بەڵێ هاورێیان، ناتوانین فیلەکان ببەزێنین، بەڵام دەیانخەینە نێو داوی جاڵجاڵۆکەکانەوە. دوێنێ لەگەڵ سەرۆکی جاڵجاڵۆکەکان قسەم کرد، سەرۆکی جاڵجاڵۆکەکان گوتی هەر جاڵجاڵۆکەیەک حەوت قولانج، هەڵبەت قولانجی مێروولان داوتان بۆ دەتەنێ، ئێوە نەک هەر فیل، بگرە دەتوانین ئەم دونیا پان و بەرینە بەو داوانە گرفتار بکەن، پاشان بیپێچنەوە و بەرەو خۆری فڕێ بدەن. بەڵام فیلەکان لە شکان نایەن. ئەم دونیایە ناگۆڕدرێ... ئێمە مێروولە شەڕ دەکەین. مادام ئەو هەمووە داوە جاڵجاڵۆکەیەمان بە دەستەوە بێ، بۆ شەڕ نەکەین، وا نییە؟ نەمان بۆ ئەوانەی ڕێگریمان لێ دەکەن، لە بەردەم شەڕکردنمان دەبنە ئاستەنگ، نەمان بۆ ئاسنگەرە شەلەی هیچ لەدەست نەهاتوو!"

سەرانسەری مەیدانەکە دەنگی دایەوە:

"نەمان!"

"ئێمەش کە فیلەکان و پەپووە سلێمانکەکانمان خستە نێو ئەو داوانەوە و ڕزگـار بـووین، مێشـومەگەزی دونیـا پێشـکەش بە جاڵجاڵۆکەکـانی برامـان دەکەیـن بە هـۆی ئەوەی یارمەتییـان داویـن. هـیچ مێرووولەیەک دەسـت لە هـیچ مێشـێکی ئەم دونیـایە نـادا، تەنـانەت ئەگەر لە برسانیش بمرێ..."

مەیدانەکە تێکڕا گوتی:

"تەنانەت ئەگەر لە برسانیش بمرێ."

"هەتا داوی جاڵجاڵۆکەکەمان هەبێ..."

ئینجا سـەبارەت بە تـاڵی جاڵجاڵۆکەکـان و پتەوبوونیـان بە تێروتەسەلی قسەی کرد:

"داوی جاڵجاڵۆکە نەک هەر فیل، بگرە چل هەزار هێسـتر گرفتـار دەکـا. داوی جاڵجـاڵۆکەیەک، نەک هەر فیل بگـرە مرۆڤیش یەخسیر دەکا. داوی جاڵجاڵۆکەیەک..."

ئەوسـا وەک فەرمانـدەیەکی سـەرکەوتوو، بە سـینگێکی دەرپەڕیـو لەسـەر شـانۆ هـاتە خـوارێ. مەیـدانەکە بە دەنگی چەپڵەڕێزان وەلەرزین کەوتبوو.

ئاسـنگەری شـەل لەوێ، لە قەراغ مەیـدانەکە ڕاوەسـتابوو، فەرمانـدەکە و ئەو سـێ گەنـجە ڕیشسـوورەش لە کنـی بوون، ئاسنگەر لە داخان خەریک بوو شێت بێ. دەیگوت:

"قسـەی هەڵـلەق مەڵـلەق. شـتی هـاتەران پـاتەران... لەو هەموو فشەفشە. ئای فشەچینە!"

لەو کاتەدا مێرووولەیەکی لاو کە ڕیشـی لە ئەرز دەخشـا، چاوێکی سێگۆشـەی هەبوو، سمێڵی ئاوێزان و قژی تـا

سەر سینگی درێژ بووبوو، بەسەر چڵەکەدا سەرکەوت.
زمانی کەمێک دەگیرا، وێڕای ئەمەش ڕێکوپێک دەئاخفی:
"ئێمە قەت، بە هیچ شێوەیەک ناتوانین فیلەکان ببەزێنین."
زۆر لەسەرەخۆ، ئەرخەیان، قایلکەر و پێداگر قسەی دەکرد. جارجارە کە گەرم دادەهات، مێرووڵەکان تەنانەت هەستیان بەوە نەدەکرد زمانی دەگیرێ، بە وردی گوێیان بۆ ڕاداشتبوو.
"با ڕاستییەکان ببینین هاوڕێیان. ئێمە هەرگیز ناتوانین فیلەکان ببەزێنین، ئەگەر پێیان وێرابایین، لەوەتەی دونیا هەیە دیل و یەخسیری ئەوان دەبووین؟"
مەیدانەکە یەکبەخۆی گوڕاندی:
"نەخێر."
ئاسنگەری شەل گوتی:
"لەوەتەی دونیا هەیە یەخسیر و دیلی ئەوان نین، تازە وامان لێ هاتووە."
کەس دەنگی ویی نەبیست. یان گوێیان لێ بوو و وایان نواند کە نەیانبیستووە.
"بۆیە با شەڕکردن لەگەڵ فیلەکان و بەزاندنیان لە ئەقڵمان دەربکەین و بیر لەوە بکەینەوە چۆن ڕێگری لە بەردەم چوونی فیل بۆ وڵاتی مێرووڵەکان بکەین، وا نییە؟"
ئاپۆرای مێرووڵەکان منگاندی:
"ئەمە باشترین ڕێگەیە."

"جا هاوڕێیان، من گەڕام و ڕاوێژم کرد، پرسیم لەوانەی خوو و خدەی فیلەکان دەزانن، لە مار و مۆر و مرۆڤان، هەموو خوویەکی فیلەکانم بۆ دەرکەوت. لە هەمووی گرنگتر فیلەکان ناتوانن بەسەر خەندەقدا باز بدەن. خەندەق بە دەوری وڵاتی مێروولەکاندا لێ دەدەین و فیلەکان ناتوانن بێنە نێو وڵاتەکانمانەوە. هەی فیلەکان کوێر دەکەین، هەی دەیانخەینە نێو داوی جاڵجاڵۆکە و نازانم چی، ئەوانە هەموو قسەی زلن... چما مێروولە دەتوانێ چاوی فیلەکان کوێر بکا، ئادەی پێم بڵێن، فیلێک بە داوی جاڵجاڵۆکانەوە دەبێ؟"

ئاپۆرای لەنێو یەک خزیو تێکڕا گوڕاندی:

"پێوە نابێ."

"با ڕاستییەکان ببینین هاوڕێیان، ئێستا با هەموو مێروولە سوورەکان بگەڕێینەوە بۆ وڵاتەکانی خۆمان، هاووڵاتییەکانمان هان بدەین خەندەق بە دەوروبەری وڵاتەکانماندا لێ بدەن."

مەیدانەکە بە چەپڵەڕێزان و فیتوو و هەرا دەلەرزییەوە. مێروولەکان ئەم مێرووە ڕیشسوورە ڕیشن و قژدرێژەشیان بە کۆڵان گێڕا.

پاشانیش کە خەڵکەکە بێدەنگ بوو، مێروویەکی ڕیشسووری قۆڵە و ورد کە هەر هێندەی نووکەدەرزییەک دەبوو، بە چڵەکەدا هەڵرووسکا. ئەم مێروولەیە ئەوەندە بچووک بوو مێروولەکانی تر بە ئەستەم دەیانبینی کە لەسەر ترۆپکی چڵەکەیە.

بەلام ئەم مێرووولە وردە دەنگێکی گڕی هەبوو. بەم جۆرە هاتە ئاخاوتن:

"هاوڕێیان، با ڕاستییەکان ببینین. ئێمە قەت دەتوانین فیلەکان بە خۆڵکردنە چاویانەوە کوێر بکەین؟ ئەوەندەی من بزانم فیلەکان چاویان بەو شێوەیە نابینێ، ئەوە داینێین کوێریشمان کردن، هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕدرێ. گۆیا فیلەکان بە گوێ دەبینن. چما دەتوانین گوێی فیلەکان ببڕینەوە، هاوڕێیان، ئادەی پێم بڵێن، ئەو هێزەمان هەیە گوێچکە چارۆکەئاساکانیان ببڕین؟"

ئاپۆراکە هاواری کرد:

"نیمانە!"

"سەبارەت بە داوی جاڵجاڵۆکە..."

ئاپۆراکە تێکڕا گوتی:

"نابێ، نابێ. با واز لە خەندەقیش بێنین."

"بیستوومە هیچ خەندەقێک بەرگەی فیل ناگرێ، فیل دەتوانێ بەسەر خەندەقدا باز بدا و بپەڕێتەوە."

مێروولەکان هاواریان کرد:

"دەپەڕێتەوە."

"لەم دونیایەدا هێزێک بەدی ناکرێ فیلەکان بە چۆکدا بێنێ. ئەو هێزەی فیلەکان بە چۆکدا بێنێ، هێشتا لەدایک نەبووە."

ئاپۆراکە هەمدیس هاواری لێ بەرز بووەوە:

"هێشتا لەدایک نەبووە."

"کەواتە چارە چییە ئەی هاوڕێیان، ئەی بەنرخترین بوونەوەرەکانی گەردوون، خودا، ئێوەی مێرووە

سووری ستایش کرد و ئینجا ئێوەی هێنایە بوون، ئێوەی کردە سوڵتانی هەموو مێروولەکان. کەواتە دەبێ چ بکەین؟"
مێروولەکان نقەیان لێوە نەهات، هەموویان گوێقوڵاغ بوون و چاویان بڕییە زاری مێرووە وردەکە.
"بە پێی ئەوەی هێزێک نییە باڵاتر لە هێزی فیلەکان، ئێمەش کەڵک لە هێزی فیلەکان وەردەگرین و خۆمان ڕزگار دەکەین. بەشێک لەو فیلانە، هێندەی سوڵتانی فیلەکان لە نیعمەتەکانی مێروولەکان سوود وەرناگرن. ئێمە بەو فیلە فەقیر و بێکەس و داماوانە دەڵێین ئەگەر یارمەتیمان بدەن و لەژێر چنگی فیلەکان قوتارمان بکەن، ئێمەش هەتا ڕۆژی قیامەت، ئێوە و وەچە و وەچەکانی ترتان بە هەنگوین و شیلەی گوڵ و جووڵەوەر بەخێو دەکەین. کۆشکی بلوورینیشتان بۆ ساز دەکەین. ئێوەی فیل نەبن، ئێمەی مێروولەی ورد بە فیلەکان ناوێرین. ئادەی پێم بڵێن دەرەقەتیان دێین؟"
"دەرەقەتیان نایەین."
"کەوایە بژی برایەتی و هاوپەیمانیی فیلەکان و مێروولەکان. فیلەکان و مێروولەکان دەست لەناو دەست... نەمان بۆ لایەنگرانی داو، چیاگەڕەکان، خەندەقچییەکان، ئاسنگەرەکان، دەست قرتماغە بەستووەکان، نەمان! بژی هاوکاریی مێروولە و فیل... "
دروشمی "فیلەکان و مێروولەکان دەست لەناو دەست"، لە مەیدانە بەرینەکە دەنگی دایەوە. مێروولەکان وروژان

و وەجموجووڵ کەوتن. لەژێر تیشکی خۆری گەشاوەدا چاوەکانی چەند ملیارد مێرووڵە بریسکەیان دەهات.

مێرووڵە وردەکە لە کاتێکدا سینگی دەرپەڕاندبوو، لەسەر چڵەکەڕا خۆی فڕێ دا، لەنێو لاقی مێرووڵەکانی تردا ون بوو. مێرووڵەکان دۆزییانەوە و خستیانە سەر قەڵاندۆشیان.

مێرووڵەی فەرماندە کە لە تەنیشت ئاسنگەری شەل ڕاوەستابوو، لەپڕ ئەم ڕستەیەی لە زار دەرپەڕی:

"وایە. ئەمەش ڕاست دەکا."

ئاسنگەری شەل چاوێکی سەیری تێبڕی. ئەم فەرماندەیە کە لە تەنیشتی ڕاوەستابوو، دەمێک بوو بۆ هەر مێرووڵەیەکی سوور کە دەهاتە خوارێ، لەبەر خۆیەوە هەندێک شتی دەهێنایە زمان، بەڵام ئاسنگەری شەل لێی تێنەدەگەیشت. بۆچوونی هەر مێرووڵەیەکی پشتڕاست کردبووەوە و گوتبووی "ڕاست"ە. مێرووڵەی فەرماندە وشەی "ڕاست"ەی لە زار دەرپەڕیبوو، بەڵام چ سوود، ئاسنگەری شەل ئیتر بیستبووی. ئێستا ئەمەی چۆن ڕاست کردباوە، ڕاستکردنەوەش ئیتر دادی نەدەدا. مێرووە شەلە بە چ گومان و ترسێکەوە سەیری دەکرد. فەرماندە چارەیەکی نەبوو بێجگە لەوەی پێداگری بکا، ڕەنگە تەنیا بەم جۆرە ڕزگاری بوایە:

"هەموویان ڕاست دەکەن، وا نییە مامۆستا؟"

مێرووە شەلە لە داخان نەڕاندی.

"دەتوانین فیلەکان کوێر بکەین."

"گەمژە."
"بە داوی جاڵجاڵۆکە دەتوانین فیلەکان..."
"بوودەڵە."
"هاوکاری لەگەڵ فیلەکان..."
"گێلە، ئەمن پێم وا بوو شتێکت لە بار دایە. لەکنەخۆ فەرماندەی وڵاتێکی زل و زەبەلاحی. لەکنەخۆ ڕیش..."
بۆی تەواو نەبوو بڵێ لەکنەخۆ ڕیشسوورێکی، چونکە نەدەکرا ڕیشسوورێکی وا پیر بەو قسە هەڵیتوپەڵیتانە بڵێ ڕاستە. مێرووە شەلە زۆر ئەزموونی تێپەڕاندبوو. پەشیمان بووبووەوە لەوەی بۆچوونەکانی ڕاشکاوانە دەربڕیبوو. بە هۆی ئەوەی خۆی لەقاو دابوو، ئەم مێرووە فەرماندەیە بۆی هەبوو پەنا بۆ هەندێک کاری نائاسایی ببات. بۆی هەبوو هەموو مێروولەکان دنە بدا و لەناوی بەرن. ئەم مێرووە فەرماندەیە مێروولەیەکی زۆر بە جەربەزە بوو. دەیتوانی شەو لە خەودا بیکوژێ... هیچیشی نەکردبایە، دەیتوانی ڕابکا.
لەناکاو مێرووە شەلە بزەی هاتێ و گوتی:
"کورە هەر بژی فەرماندەی هاوڕێم. تۆ لە هەموویان بەئەزموونتری. ببوورە، سەرەتا باش تێنەگەیشتم و لە وەڵامی ئەو بۆچوونە جوانانەی تۆدا گوتم بوودەڵە. من دەزانم هەر فیکرێک پیرۆزە."
خیانەتکار گەمژایەتی دەکا، چەندەش زرنگ بێ...
مێروولەی فەرماندە زوو بڕوای بەم بادانەوەیەی شەلە

کرد، چونکە خۆی بە ئاقڵترین مێروولەی سەر ڕووی زەوی دەزانی.
بە خۆشحاڵییەوە هاواری کرد:
"هەر فیکرێک پیرۆزە. ئەم بیروبۆچوونانە فیلەکان تەفروتوونا دەکەن جا با زۆریش بەهێز بن."
مێرووە شەلە گوتی:
"ڕاستە. درەنگ یان زوو فیلەکان لەناو دەبەین."
لە کاتێکدا ئەوان ئاوا قسەیان دەکرد، مێروولەیەک خۆی فڕێ دایە سەر چڵە پنچکەکە و بەسەر بەرزترین لقیدا هەڵزنا. مێروولەکە دەستی پێ کرد:
"هۆ هاوڕێیان، مێرووە سوورە خاوەن شکۆ و پیرۆز و زەحمەتکێشەکان، فیلەکان سەرچاوەی ئێمەیان وشک کردووە و ئێمەیان کردووەتە ژێردەستەی خۆیان... دەزانم ڕزگاربوون لە چنگ فیلەکان مەحاڵە. فیلەکان بەهێزترین بوونەوەرەکانی گەردوونن. ئێوەش دەزانن و ئەمنیش دەزانم، دونیا و عالەم شاهیدە. مامۆستای گەورەمان ئاسنگەری ڕیشسووریش بەم ڕاستییە دەزانێ. هاوڕێ ڕیشسوورەکەی ئەویش کە لە بیلبیلەی چاوی بۆ وی خۆشەویستترە و فەرماندەی مێروولەکانی چیای قافە، ئەمە دەزانێ."
مێرووە شەلە لە کاتێکدا خەریک بوو لە داخان بتەقێ، هاواری کرد:
"ڕاستە، ڕاستە."

له لایەکەوە داخ له دڵ بـوو و له لایەکـی تریشـەوە بـۆ ئەوەی فەرمانـدە وەسـەر خـۆی نەهێنـی، بەم قسـه هەڵلەقومەڵلەقانەی دەگوت "ڕاستە".
فەرماندەش سەرخۆش لەوەی مێرووە شەلەی هێناوەته ڕێ، گوتی:
"ڕاستە، ڕاستە، ڕاستە."
مێرووە شەلەکە هاواری کرد:
"دەزانین."
"لەم دونیـایەدا نەک هەر مێـرووله، هـیچ هێزێـک نـاتوانێ فیلەکـان ببەزێنـێ، بگـرە فیلەکـانیش دەڕۆسـتی فیلەکـان نـایەن، مرۆڤەکـانیش... بـەس هێزێـک دەتـوانێ شکسـتیان بـدا، ئەویـش مێـرووله عەجەمەکـانی هاوڕێمـانن. تەنیـا هێزێـک لەم دونیـایەدا به فیلەکـان بـوێرێ، مێـرووله عەجەمەکانن. مێرووە عەجەمە لاقدرێژەکان."
فەرماندە هاواری کرد:
"ڕاستە، مێرووله عەجەمە لاقدرێژەکانن!"
مێرووە شەله پێی خۆش بوایه یان نا، دەبوایه قسـەکانی دووپات کردباوە و به هێمنی گوتی:
"ڕاستە، مێرووە عەجەمەکانن."
ئینجا به دزییەوە له فەرماندەی ڕوانی. فەرمانـدە فیکەی سمێڵانی دەهات و دەستەکانی ڕێک دەخشـاند. مێـرووە شەله چاوی لەسـەر فەرمانـدە هەڵنەبڕی، له نـووکی پـێ تـا تەوقـی سـەر هەڵیسـەنگاند و لێـی ورد بـووەوە. به

دڵنیاییەوە تێگەیشتبوو کە ئەمە مێروولەیەکی سوور نییە.
مێرووی سەر چڵەکە دەعبایەکی درێژ بوو، ئێسکوپرووسکی بەدەرەوە بوون. سەروریشی ئاڵۆز بوو، لووتێکی نووکتیژی پەمەیی هەبوو و کە قسەی دەکرد کەڵەبابەی قورگی دەچووە سەرێ و دەهاتەوە خوارێ.
'هەزار و پێنجسەد مێروولەی عەجەمە بۆ ئەم ئەشکەوتە بانگهێشت دەکەین. ئەم ئەشکەوتە رێک چوار میلیارد مێروولەی تێدا جێ دەبێتەوە. هەزار و پێنجسەد مێروولە عەجەمەکە دەخەینە ئەو ئەشکەوتەی چوار میلیارد مێروولە هەڵدەگرێ و دەرزیی فیلیان لێ دەدەین. پاش ئەوەی دەرزیی فیلمان لە مێروولە عەجەمەکان دا، هەرچی خواردەمەنیی دونیا هەیە کۆی دەکەینەوە و دەرخواردی ئەوانی دەدەین. شەش مانگ دواتر ئەو مێرووە عەجەمانەی دەرزیی فیلیان لێ دراوە، بەقەد پێنج تا دە فیل گەورە دەبن. ئەم مێروولانە کە بەقەد پێنج تا دە فیل گەورە بوون، هەر کامەو وەک دێوزمەیەکیان لێ دێ. هەر کامەو فیلێک دەخاتە نێو لاقەکانی و دەیکات بە دوو لەتەوە. مێرووە جەنگاوەرەکانمان بەردەدەینە گیانی فیلەکان و دەڵێین خۆتان و خودای خۆتان. شەرێکی قورس لەنێوان فیلەکان و مێرووە عەجەمەکان بەرپا دەبێ. تا دەمەو خۆرئاوابوون، تەنانەت فیلێک لەم دونیایەدا زیندوو

نامێنێتەوە. مێروولە عەجەمەکان پڕ دەدەنە هەموویان و لە نێوەڕاستەوە دوولەتیان دەکەن. هۆ هاوڕێیان، مێرووە ڕیشسوورەکان، قسەکانم ڕاستن یان نا؟"

مەیدانە پانەکە شەپۆلی دا و هەموو تێکڕا گوتیان:

"ڕاستن!"

"تۆ ئەی ئاسنگەرە شەلەی سەرۆکی مێروولە سوورەکان، قسەکانم ڕاستن یان نا؟"

ئاسنگەر پێشبەندەکەی ڕاتەکاند و گوتی:

"ڕاستن، ڕاستن."

بەدوای ویشدا فەرماندە هاواری کرد:

"ڕاستن، ڕاستن، زۆر ڕاستن."

ئەوسا مێرووە شەلەی ئاسنگەری ڕیشسوور لەبەر خۆیەوە پێکەنی، لە دڵەوە خۆشحاڵ بوو. بە وەختی خۆی تێگەیشتبوو ئەم فەرماندەیە کێیە. ئەم مێروولەیە، کەسێک نەبوو جگە لە سەرکردەی مێرووە زەردەکان و ئەوانەی ئەم قەرەباڵغییەیان دروست کردبوو و مێروولەکانیشیان دەوروژاند، هەر مێرووە زەردەکان بوون. بەڵام چۆن لەنێو مێرووە ڕیشسوورەکاندا خۆیان ون کردبوو؟ چۆن لەوانی تر هەڵدەهاوێردرێن و دەدۆزرێنەوە، چۆن دەکرا ئەم ئاپۆرایە قایل بکەی کە ئەوانە مێرووە زەردەکانن؟ ئەستەم بوو، ئەستەم بوو، بەڵام مەحاڵ نەبوو.

مێرووە باریکەڵە درێژەکەش لەسەر ترۆپکی چڵەکە هاتە خوارێ. ئەویشیان لەسەر قەڵاندۆشیان دانا و بەدەم

گوتنی "بژی، هەر بمێنی"، ماوەیەک بەو ناوەدا گێڕایان. دەنگیان لە چیا بەرزەکان دەزرینگایەوە. پاشان سەرۆکی ڕەهەندلێدەرەکان بەسەر چڵەکەدا هەڵڕووسکا و پێشنیاری کرد لەسەر ڕێگەی فیلەکان چاڵ هەڵبکەنن، بەدوای ویدا مێروولەی بزمارژەن چووە سەرێ و پێشنیاری کرد چواردەوری وڵاتی مێروولەکان بزمارڕێژ بکەن. مێروولەکان قەت پێ لەم بزمارانە نانێن بۆ ئەوەی بچنە وڵاتی مێروولەکانەوە. دوای بزمارژەن، ژارسازەکان، ئاوکێشەکان، ڕێگرەکان، چەتەکان و ماڵەکێشەکان بە نۆرە چوونە سەرێ و پێشنیاری هەر هەموویان سەرنجڕاکێش بوو. لەنێو ئاپۆرای مەیدانەکە هەندێک کەس چوونە سەر چڵەکە کە قسەکانی هەموویان بە جیا پشتڕاست دەکرایەوە و جەماوەر هاواری دەکرد ڕاستە.

ئاسنگەرە شەلە و فەرماندەش قسەی هەموویانیان پشتڕاست دەکردەوە. مێروولەکان سەرجەم وتارەبێژەکانیان لە کۆڵ کرد و بە مەیدانەکەدا گێڕایانن. ماوەیەک دواتر کتوپڕ ئاپۆراکە هاروژا، مێروولەکان دەستەویەخەی یەکتری بوون. خەنجەر و شمشێر بەرز کرانەوە، داو و تەپکە نرانەوە، مێروولەکان وەک خێز و خۆڵ، بەردیان گرتە یەکتری، هەورێکی چڕ لە تەپوتۆز ئاسمانی مەیدانەکەی داپۆشی. داد و هاوارێک ئەو ناوەی داگرت کە گوێچکەکانی کەڕ دەکرد. کەللەسەر، پێ، قۆڵ و گەدە وەحەوا کەوتبوون. لەوەتەی دونیا

دونیا بوو، لەوەتەی مێروولە مێروولە بوو، جەنگێکی وا نەبینبرابوو.
مێرووە شەلەکە و فەرماندە بەسەر بەرزترین چڵی پنچکێکی ئەستوور و بڵینددا هەڵڕووسکان، کە لە دارێک دەچوو و لەوێوە سەیری شەڕەکەیان دەکرد. ئاسنگەرە شەلە لە خەفەتان خەریک بوو بمرێ، کەچی فەرماندە فیکەی سمێڵانی دەهات، شایی لە دڵ دەگەڕا، هەڵبەت بە ڕواڵەت خەفەتبار بوو، ئیتر هیچ هەڵسوکەوتێکی لەبەر چاوی ئاسنگەری شەل ون نەدەبوو.
ئاسنگەری شەل زۆر بەپەرۆش بوو، ئەم شەڕە هەتا کەنگێ ئاوا بەردەوام دەبوو؟ لەوانەش بوو دوای شەڕەکە مێروولەیەک زیندوو نەمابا‌وە. بۆ ئەوەی پێش بەم کوشتوبڕە سامناکە بگیردرێ، پێویست بوو چ بکرێ؟
داوای شەیپوورێکی لە مێروولە سوورە گەنجەکان کرد، سەرێ شەیپووری زۆر لێ بوو، هەرە گەورەکەیان هێنا و دایان بە ئاسنگەر. ئاسنگەر دەستی بە ئاخافتن کرد، قیژاندی، جنێوی دا، بەڵام کێ هەبوو گوێ بگرێ؟
ئاسنگەری شەل کسپەی لە جەرگی هەڵدەستا. ئەو هەمووە ڕەنجەی چەشتبوو تاوەکو مێروولە سوورەکان ببنە تاکە هیوای نەتەوەی مێروولەکان، کەچی بە فیتی مێروولەیەکی زەرد پێک هەڵپڕژابوون و یەکتریان دەکوشت. ئەویش لەبەر چاوی یەکتری. ئەگەر بێت و ئەم مێروولە سوورانە نەمێنن، ئیتر تا ڕۆژی قیامەت

مێروولەکان ژێردەستەی فیلەکان دەمانەوە. بە چاوانی پڕ لە فرمێسکەوە لە سیمای فەرماندەی ڕوانی. فەرماندە سەرتاپا نوقمی شادی بوو. ئاسنگەری شەل هەوڵی دا ئەو بە خەموخەفەتی دەروونی نەزانی. بە ئاستەم بزەیەکی کرد:

"خەریکە یەکتری دەکوژن، با یەکتری لەناو ببەن. هێشتا ڕیشسوور لە دونیادا زۆرن، وا نییە؟ لە لای ئێوەش زۆرن، وا نییە؟"

فەرماندە گوتی:

"هەن بەڵام ئەوانیش بە بیانوویەکی بچووک پێکدا هەڵدەپرژێن و ئاوا یەکتری دەکوژن. لە وڵاتە بەشکۆکەی من تەنانەت مێروولەیەکی ڕیشسوور نەماوەتەوە."

"لێیان گەڕێ با یەکتری بکوژن، چاکتریش، دیارە ئەمانە کۆمەڵێک مێروولەی گەمژە و گێل بوون. مردنیان بۆ نەتەوەیلی مێروولەکان باشترە، ئەو نەتەوانە مێروولەی ڕیشسووری وا بێئاقڵیان نەبێ باشترە. ئێمە هێشتا ڕیشسوورمان زۆرە، لەوە بترازێ ئەوان ژیرن..."

فەرماندە دەسبەجێ پرسیی:

"ئەوان لە کوێن؟"

ئاخ، ئەگەر شوێنی ئەوانیشی زانیبا... هەتا فەرماندە لە دونیادا ماوە، نابێ تەنانەت مێروولەیەکی ڕیشسوور ساغ بمێنێتەوە.

ئاسنگەری شەل گوتی:

"له چین و ماچین. له ولاتی مێرووه پیسترزەردەکان."
"بۆ ڕیشی مێرووه پیسترزەردەکانیش سووره؟"
ئاسنگەری شەل گوتی:
"ئەی چی. ڕیشسوورەکانی ئەوان ئاوا گەمژه نین، ئەوان بەم جۆره یەکتری ناکوژن."
فەرمانده له دڵی خۆیدا گوتی پەله مەکه، با من ئەو مێرووه زەرده بەئەزموونانەم بنێرمه چین و ماچینەکەت، ئەودەم هەموو شتێکت بۆ دەردەکەوێ، بزانه خراپتر لەوانەی ئێرەیان بەسەر ناهێنین!
چینێک تۆزی ئەستوور مەیدانەکەی داپۆشی، ئەو خوێنەی له گۆڕەپانەکه ڕژابوو، بەرەو داوێن شۆڕ دەبووەوه و دۆڵەکەی تەڕی دەکرد. ئاسنگەری شەل تەنانەت لەو بەرزاییەڕا جگه له قۆڵی بڕاو، قاچ و سک و کەللەسەری وەحەواکەوتوو هیچی تری نەدەبینی. هاواری کرد و قوولاندی، بەڵام سوودی نەبوو، ئاسنگەری شەل شەپوورەکەی دەستی بۆ نێوەڕاستی مەیدانی شەڕ فڕێ دا. ئەم بێموبالاتییه دەیکوشت.
لەم کاتەدا قاقایەک وەک هەورەتریشقه له دوورەوه بیسترا. قاقاکه چیاکانی هەژاند و گابەردەکانی لەرزاندەوه.
فەرمانده گوتی:
"سوڵتانی فیلەکان، سوڵتانی فیلەکان."
بەم جۆره جارێکی تر خۆی لەقاو دا.

"سولْتانی فیلەکان بە حاڵی مێرووە سوورەکان پێدەکەنن."
"سولْتانی فیلەکان چووزانن ئێمە لێرە لە چ دۆخێک داین؟"
فەرماندە کە لە خۆشیان خۆی لەقاو دابوو، درۆیەکی هەڵبەست.
"چاوی سولْتانی فیلەکان لە مەودای چل ڕۆژ ڕێگەوە مێرووولەیەکی ڕەشی سەر بەردێکی ڕەش دەبینێ، تەنانەت ئەگەر لە پشت حەوت شاخەوە بێ. زۆری نەمابوو من بکوژن، هەلاتم و خۆم هاویشتە سەر بەفری چیای قاف. فیلەکان چیای بەردین و بڵیندیان خۆش ناوێ، نەخاسمە ئەگەر ئەو چیایانە بە بەفری سارد داپۆشرابن.
قاقایەک، قاقایەکی تر تەقییەوە. قاقاکان زەوی و ئاسمانیان دەلەرزاندەوە و پەیتاپەیتا وەک گوللە تۆپ دەتەقینەوە.
ڕێک لەم کاتەدا پەرچوویەک ڕووی دا. شتێکی باوەڕپێنەکراو قەوما، کتوپڕ هەرا و هەنگامەی گۆڕەپانەکە کپ بوو. تەنانەت دەنگی پەڕی مێشێ نەدەبیسترا. ئاسنگەری شەل ماوەیەک گوێی ڕاداشت و پاشان بە کەسەرەوە پرسیی:
"چییان لێ هات ئەمانە، تەنانەت سرتەیەک لە مەیدانەکەوە نایە، ڕیشسوورەکانم چییان بەسەر هات؟"
فەرماندە گوتی:

"هەر هەموویـان مـردن. یەکە یەکە یەکتریـان کوشـت. تەنانەت ڕیشسوورێک نەماوەتەوە. ئاخ، ئاخ، ئاااخ."
بە هەموو هێزی خۆی لە پرمەی گریانی دا.
"وەی وەی..."
ئاسنگەری شەل مەنگ و لەسەرەخۆ وەستابوو، دڵۆپێ فرمێسک لە چاوانی نەدەهاتە خوار، لە جێی خۆی ڕەق هەڵاتبوو و مووی سەری نەدەبزووت.
دەنگـی قاقـای سـوڵتانی فیلەکـان تـا دەهـات زیـاتر دەبیسـترا. تەپوتـۆزی بـان مەیـدانەکەش هێـدی هێـدی دەنیشتەوە و دەوروبەر باشتر دەبنیرا. ئاسنگەری شـەل چاوەکـانی بڕیبـوونە مەیـدانەکە و نیگـای لەسـەر هەڵنەدەبڕی. دەستی لەسەر دڵی دانابوو.
تەپوتۆز نیشتەوە، تەم لە دەوروبەر نەما، ئا لەو ساتەدا قاقا تیژ و شکێنەر و کوشندەکانی سوڵتانی فیلەکان بوو بە ڕق و تووڕەبـوونێکی بێکۆتـایی. ئاسـنگەری شـەل لە خۆشیان شاگەشکە بوو و هاواری کرد:
"زۆربەی هەرە زۆری مێروولەکـان زینـدوون! شـوکر، شوکر، سەد شوکر!"
فەرماندە کە ئەم دیمەنە و جموجووڵی مێروولەکانی لە مەیـدانەکە بینـی، زۆری نەمـابوو لە داخـان لەسـەر چڵەکەوە بکەوێ و بمرێ.
ئاسـنگەری شـەل لەسـەر لـقەکە هـاتە خـوارێ و بەرەو مەیدانەکە ڕۆیشت. کوژراو و بریندار لەنێو چەقی مەیدانەکە لەسەر یەک کەڵەکە بووبوون.

ئاسنگەری شەل گوتی:
"شوکر، بۆ ئەوە دەبێ دیسان بڵێی شوکر. من پێم وا بوو تەنانەت مێروولەیەکی سووریش زیندوو نەماوەتەوە."
لەم نێوانەدا، ئەو مێروولانەی بە قاقای سوڵتانی فیلەکان گێژ بووبوون و وازیان لە شەڕ هێنابوو، هەر وا جێنویان بە یەکتری دەدا. ئاسنگەری شەل بە چڵەپووشێکدا سەرکەوت و گوتی:
"بەسە ئیتر. وەرنەوە سەر خۆتان. سەیر بکەن بزانن چۆن سوڵتانی فیلەکان بەو وەزعەی ئێوە پێدەکەنێ."
ئاسنگەری شەل زۆر قسەی تری کرد. یەک مێروولەش وەڵامی نەدایەوە. ڕیشسوورەکان ملشۆڕ و فەدیکار گەڕانەوە کوونەکانیان. گەڕانەوە بەڵام...
فەرماندە، ڕێک لەپشت سەری مێرووە شەلەکە بوو، کە ئەو قسەی دەکرد، گوتی:
"سەیر کە هاوڕێ، ئێستا تۆ پێت وایە جارێکی دیکە ئەوانەی پێک هەڵپڕژاون و خوێنی یەکتریان ڕشتووە، دەتوانی لە دەوری یەک کۆ بکەیتەوە؟ لەمەوبەدوا ئەم ڕیشسوورانە ئیتر هیچ شتێکیان لەدەست نایە. ئەمانە تا هەتایە یەکتری دەکوژن. خوێن و خۆپەرستی و فیتنە کەوتووەتە نێوانیانەوە. ڕیشسوورەکان بوونەتە هەزار پارچەوە، ئیتر هەموو شتێکیان بیر چووەتەوە و پێکدا هەڵدەپرژێن. چاویان نە دونیایە دەبینێ و نە فیلەکان."

مێرووه شـەلە هەم بەم ڕووداوە غەمگین بـوو و هەم دڵخـــۆش، زۆر شـــوکر کە هەمـــوو مێروولەکـــان نەمردبـوون. دوای ئەم ئەزمـوونە ئیتـر دەبـێ ئەقڵیـان وەگەڕ کەوتبێـتەوە. پـاش ئەم ڕووداوە ئیـدی فریـوی مێرووە زەردەکانیان نەدەخوارد. گەڕانەوە کوونەکانیان، شەکەت و هیلاک بوون.

فەرماندە گوتی:

"وەرە هاوڕێی ئاسنگەر، وەرە با پێکەوە بچینە ئەودیوی چیای قاف، بچینە وڵاتی من. لە وڵاتەکەی خۆم دەتکەمە سـەرۆکوەزیر... بە هەنگـوین و شـیلەی گـوڵ، ئەویـش شـیلەی گوڵەکـانی چیـای قـاف پێشـوازیت لـێ دەکەم. کەوتـیە بەر دڵـم. بـا بـاقیی تەمەنـت وەک مێـروولە نـا، بەڵکوو وەک فیل بژی. ئەگەر پێت خۆش بێ دەتوانی لە بەیـانییەوە تـا ئێـوارێ کەفەڵـت بخـورێنی. خـۆت بینیـت، ئەوەی بـــڕوات نەدەکـــرد ڕووی دا، ڕیشســـوورەکانت یەکتریـان کوشـت. لەمەودوا ئیتـر هەر ئـاوا دەمێنـنەوە، هەتاهەتـایە، تـا ئەو کاتەی تەنانەت دوو مێـروولە لەسـەر ڕووی زەوی بمێنـنەوە، چـاوی یەکتـری دەردێـنن. وەرە هاوڕێ، پێداگری مەکە، ئەم مێروولانە نرخی تۆ نازانن، وەرە با بچینە لای ئێمە. ئەگەر پێت خۆش بێ ماوەیەکی تـر پەپـوویەک، پەپـووش نەبـوو حـاجی لەقلەقێـک هەڵمانـدەگرێ و لەودیـو چیـای قافمـان دادەنـێ. دەی هاوڕێ..."

ئاسنگەرە شەلەی ڕیشسوور بە هیچ شێوەیەک وەڵامی نەدایەوە، بەس ئەو سێ مێرووڵە گەنجە ڕیشسوورەی چاوەڕێی بوون، بانگ کردە سووچێک و بە گوێچکەیانیدا چرپاند:

"ئەمان کوڕینە، باش گوێ بگرن، ئەو فەرماندەیەتان بینیەوە، ئەو ڕیشسوورە دەڵێم، ئەو هاوڕێیەم؟ ئەو سەرۆکی مێرووە زەردەکانە. سوڵتانی فیلەکان ئەمانەی ناردووەتە نێو ئێمە. شەڕی ئەمڕۆش هەر ئەوانە هەڵیانگیرساند. زۆری نەمابوو تەنانەت ڕیشسوورێک زیندوو نەمێنێتەوە. ئاگادار بن، لەوانەیە ئەم فەرماندەیە بیەوێ هەڵێ، ئەگەر ڕایکرد و نەتانتوانی بیگرن، بیکوژن. ئەمان کوڕینە، بە جۆرێک هەڵسوکەوت مەکەن وەک ئەوەی زانیبێتتان ئەمە سەرکردەی مێرووە زەردەکانە."

"بەسەر چاو مامۆستا."

مێروولەکـان هەر چۆنێـک بـێ، کـوێر، شـەل، برسـی و نەخـۆش خۆیـان گەیانـدە وەرزی بەهـاری. بەڵام ئەو میلیارد مێروولانە بە بەفر و قاتیوقڕی نیوەیان لـێ کەم بووبـووەوە. لەگەڵ ئەوەشـدا بە عەشـق و جۆشـەوە، بە منەتەوە بەرەوپیری بانگەوازی سوڵتانی فیلەکـان چوون کە زستانێ خواردەمەنیی پێ دابوون.

سوڵتانی فیلەکان گوتی:

"ئەمسـاڵ کۆشـکێکی تـرم لێتـان دەوێ... دوو هێنـدەی کۆشکە کۆنەکە گەورە بێ. دەبێ لە بلووری پەمەیی بێ. لە ناوەوەش قەرەوێڵەی بە پەڕی مەل دروستکراو..."

مێروولەکان بێ ئەوەی نارەزایی دەرببڕن یان ڕاڕا بن، گوتیان:

"بان سەرمان سوڵتانی خۆمان."

"کورسـییەکی پەمەییشـم دەوێ، لە ئەڵماسـی پەمەیـی نێوەڕاستی زەوی دروست کرابێ..."

هەموو مێرووولەکان بە یەک زار هاواریان کرد:
"سەر سەرمان سوڵتانی خۆمان. کورسیی پەمەیی لەسەر چاومان."
"تایبەتترین و گەورەترین باخچەی دونیام لەم چیایانە گەرەکە، چی تۆوی گوڵ هەیە لەم دونیایەدا، هەمووی بێنن و لەم باخچە تایبەتەدا بیچێنن."
"سەر سەرمان سوڵتانی خۆمان، تۆ بەس داوای بکە. سەرجەم مێرووولەکانی دونیا لەژێر فەرمانی تۆ دان، مێرووولەکانی ئاسیا، ئەمریکا، ئەفریقا، ئەورووپا، تەنانەت مێرووولەی سەر ئەستێرەکانیش..."
"چی دار لەسەر ڕووی زەوی هەیە، چی داری میوە هەیە، داری گوڵ هەیە، هەموویم دەوێ."
"بان سەرمان سوڵتانی خۆمان."
"گشت عەمبارەکانی بن ئەم چیایە بە شیلەی گوڵ، هەنگوین، کاکڵ، گەنم و گزرە پڕ بکەن..."
"تۆ بەس داوا بکە سوڵتانی خۆمان."
"ئێوە وەکو پار دیسان هیچ بۆ خۆتان کۆمەکەنەوە. وەک ساڵی پار، دیسان من خواردەمەنیتان پێ دەدەم. بەم جۆرە لە کۆکردنەوەی خواردەمەنی بۆ دوو شوێن ڕزگارتان دەبێ. هەروەها عەمبارەکانی من قایم و پتەون، هیچ کەس، هیچ دزێ زات ناکا لە ترسان لە عەمبارەکانی من نزیک بێتەوە."
"بەسەر سەرمان سوڵتانی خۆمان، تۆ بەس داوا بکە."
"هێشتا زۆر شتی ترم لە ئێوە دەوێ..."

"هەر چیت بوێ بان سەرمان."
"کەرەستەیەکی کەفەڵخوراندنم دەوێ. چ خودا بەرداره ئێوەی مێروولە هەبن، بە بەفر و سەرما و ڕۆژی حەشەر، نیوەی شەو بۆ کەفەڵخوراندن بچمە دەرێ و کەفەڵم بەو چنارە بەرزەوە بنێم؟ پێم بڵێن، ڕەوایە سوڵتانێک بەم جۆرە کەفەڵی خۆی بخورێنێ؟"
"کەرەستەی کەفەڵخوراندنیش دروست دەکەین سوڵتانی خۆمان."
"ئێوە تا ئێستا مەکینەی کەفەڵخوراندنتان دروست کردووە؟"
"دروستمان نەکردووە بەڵام دروستی دەکەین."
"ئەی ئەگەر بۆتان دروست نەکرا؟"
"مرۆڤەکان زۆریان مەکینەی کەفەڵخوراندن هەیە سوڵتانی خۆمان، ئەگەر بۆمان دروست نەکرا هیی ئەوان دەدزین."
"کەوایە ئێوە خۆتان بە دروستکردنی مەکینەی کەفەڵخوراندنەوە سەرقاڵ مەکەن، لە مرۆڤەکانی بدزن و بیهێنن."
"لە مرۆڤەکانی دەدزین و دەیهێنین سوڵتانی خۆمان."
"متمانەتان پێ دەکەم مێروولەکانم. ئێوە هەموو شتێکتان بۆ من، بۆ ئێمە ئەنجام دا و ئەنجامی دەدەن. ئەمڕۆ سەد هەزارەمینساڵیادی برایەتیی فیلەکان و مێروولەکانە. سەد هەزار ساڵە مێروولەکان و فیلەکان لەپاڵ یەکتری بە ئازادی و برایەتی دەژین. برایەتیی

مێرووله‌كان و فیله‌كان بووه‌ته نموونه‌یه‌ك بۆ سه‌رجه‌م بوونه‌وه‌ره‌كانی تر."
مێرووله‌كان هاواریان كرد:
"بووه‌ته نموونه‌!"
سوڵتانی فیله‌كان له‌ مێرووله‌كانی پرسی:
"ئێوه‌ له‌ من ڕازین؟"
مێرووله‌كان هاواریان كرد:
"زۆر له‌ تۆ ڕازین."
"مه‌رگی من به‌ ئاوات ناخوازن، وا نییه‌؟"
مێرووله‌كان هاواریان كرد:
"نه‌خێر، ئه‌وه‌ چ قسه‌یه‌كه‌."
"كه‌واته‌ ئاوی حه‌یاتم بۆ بدۆزنه‌وه‌."
بێده‌نگییه‌كی قووڵ زاڵ بوو. ڕۆژێكی به‌تینی به‌هاری بوو. له‌ چیاكانه‌وه‌ شه‌پۆل شه‌پۆل بۆن ده‌هات و دونیا لێوانلێو بوو له‌ گوڵ.
چه‌ند ده‌نگێكی لاواز له‌ ئاپۆرای مێرووله‌كان به‌رز بووه‌وه‌:
"ئه‌مه‌ له‌ كوێیه‌، به‌كه‌ڵكی چ دێ؟"
سوڵتان دڕدۆنگانه‌ گوتی:
"بوونه‌وه‌رێك كه‌ ئاوی حه‌یات بخواته‌وه‌، نه‌مر ده‌بێ، تا كۆتایی دونیا ده‌ژی. هه‌موو هه‌شتا ساڵێكیش گه‌نج ده‌بێته‌وه‌."
هه‌مدیس چه‌ند ده‌نگێكی لاواز پرسییان:
"ئه‌م ئاوی حه‌یاته‌ له‌ كوێ بدۆزینه‌وه‌؟"

سوڵتانی فیلەکان ئیتر بە دەنگی مێروولەکان ڕاهاتبوو، بگـــرە گــوێی لە سرتەســـرتیان دەبـــوو. ســـەرجەم مێروولەکانیش فێری زمانی فیلەکان بووبوون. بۆیە بە ســـانایی دەیتـــوانی لەگەڵ مێروولەکـــان قســـە بکـــا. پەپووســـــــلێمانەکانیش لەســـــــەر لقوپـــــــۆپی دارە چرۆدەرکردووەکـــانی دەوروبەر هەڵنیشـــتبوون و بە بێـــدەنگی ســـــەیری ئەم دیمەنانەیـــان دەکـــــرد. پەپووسلێمانەکان پاڵیان بە درەختەکانەوە دابوو، پۆپە پەمەییەکانیان لەسەر لقەکان وەک خونچە توێ توێ پشکوتبوون.

سوڵتانی فیلەکان بە دەنگێکی غەمگینەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:

"نـــازانم. ئـــاخ، ئەگەر دەمزانـــی لە کـــوێیە، لەمێـــژ بـــوو ناردبووم بۆم بێنن و خواردبوومەوە."

مێروولەیەکی پیر:

"ڕەنگە مرۆڤەکان هەیانبێ، ئەویش دەدزین و دەیهێنین سوڵتانی خۆمان."

سوڵتانی فیلەکان بزەیەکی تاڵی بۆ کرد:

"مرۆڤەکـانیش نیـانە، هـیچ بوونەوەرێـک نییەتـی. لەنێـو ئادەمیزادەکانـدا تەنیـا "کوێرئۆغڵـو" و ئەسـپە ڕەشـەکەی کوێرئۆغڵو لەو ئاوەیان خـواردووەتەوە. هەروەهـا خدر و ئەســـپە بـــۆزەکەی. ئەلیاســـی پیاوچـــاکیش... لەنێـــو بوونەوەرەکانی دونیادا مەخلووقێکی ترم پێ شـک نـایە لەم ئاوەی خواردبێتەوە. بەس ئێوە، مێروولە عەبدەکانی

من دەتوانن ئەم ئاوەم بۆ بدۆزنەوە. مرۆڤ ئەگەر ئاوی حەیات بدۆزێتەوە، بۆ دڵۆپێکی هەموو شتێکی فیدا دەکا... سەیر کەن مێروولەکانی برام، ئەم ئاوی حەیاتە زۆر گرنگە، ئەگەر بێتو سەرچاوەکەی بدۆزینەوە..."
مێروولەیەکی لاوی قۆز هاواری کرد:
"دەیدۆزینەوە! مەگەر بۆ سوڵتانی خۆمان نییە، ئەرز و ئاسمان لێک دەدەرووین و سەرچاوی ئاوی حەیات دەدۆزینەوە. سوڵتانی خۆشمان ئەو قورتمە درێژ و بەشکۆ و پیرۆزەی بە سەرچاوەی ئاوی حەیاتەوە دەنێ و چل ڕۆژ و چل شەو بێوچان لێی دەخواتەوە. ئاوی حەیات بۆ سوڵتانی خۆمان دەدۆزینەوە بۆ ئەوەی تا هەتایە سایەی لە سەرمان کەم نەبێ. ئەگەر هیچ شتێکمان لەدەست نەهات، لە هیچ ڕێگەیەکەوە نەگەیشتینە ئاوی حەیات، لەگەڵ مرۆڤەکان، لە تەک ئەو بوونەوەرە هونەرمەند و ژیرانە هاوکاری دەکەین و ئەو ئاوی حەیاتە لە کوێ بێ، بۆ سوڵتانی خۆمانی دەدۆزینەوە."
سوڵتان بە دەنگێکی خەمبارتر لە پێشوو گوتی:
"ئاخ، ئاخ برا ئازیزەکانم، مێروولەکانم، هیواتان بە مرۆڤەکان نەبێ. بۆ ئەم کارە بچووکترین ئومێدتان بە مرۆڤەکان نەبێ، من ئەزموونێکی زۆرم لەگەڵ مرۆڤەکان هەیە. ئەم برایەم سەرکردەیەی پەپووەکان، لەوەتەی دونیا دونیایە مرۆڤەکان دەناسێ، تەنانەت سوڵتانی مرۆڤەکان دەناسێ. پۆپەبەرزا!"

"فەرموو سوڵتانی خۆمان!"
سەرکردەی پەپووەکان لەسەر ئەو چڵەدارەوە هەڵفڕی، لەسەر چڵێکی تەنیشت قۆرتمی سوڵتان نیشتەوە.
سوڵتان فەرمووی:
"ئادەی باسی ئادەمیزادیان بۆ بکە. بەپێی ئەو قسانەی دەیکەن، مانای وایە مرۆڤەکان ناناسن. دەی بۆیان باس بکە."
سەرکردەی پەپووەکان ملی درێژ کرد و قورگی خاوێن کردەوە، باڵەکانی لێک دان، خۆی ڕاتەکاند، دەتگوت خۆی بۆ وتارێکی زۆر گرنگ ئامادە دەکا.
"مرۆڤەکان بەگشتی دوو بەشن. ئەوانیش بەشێکیان فیل و بەشێک مێروولەن. ڕێک وەک ئێرە، فیلەکان کەمینە و مێروولەکان زۆرینەن. کتومت وەک ئێرە، ئەو بەشەی مرۆڤەکان کە فیلن دوانزە مانگی ساڵ دەست لە ڕەش و سپی نادەن، بێوچان وەک فیلەکانی ئێرە کەفەڵیان دەخورێنن و هەنگوین و مرەبا و شیلەی گوڵان دەخۆن. مێروولەکانی ئەوان تەنانەت شیری مەلیان بۆ دەدۆزنەوە. بەڵام نە فیلەکانی ئەوان و نە سوڵتانی فیلەکانیان، وەک فیلەکانی ئێمە، وەک سوڵتانی ئێمە دڵکراوە نین. بڕوانن زستانی ئەمساڵ ئێوە برسی مانەوە و فیلەکانی ئێمە و سوڵتانەکەمان چۆن بە هاناتانەوە هاتن. مرۆڤە-مێرووەکان لە برسانیش بمرن، فیل-مرۆڤەکان تۆسقاڵێک شتیان پێ نادەن. ساڵی وا هەیە لە دونیادا بەرهەمێکی زۆر ڕەعەمەل دێ، مێرووە

مرۆڤەکـــان بەرهەمێکـــی زۆر بـــۆ فیـــل مرۆڤەکـــان کـــــۆدەکەنەوە، بەرهەمێکـــــی ئەوەنـــــدە زۆر کە لە عەمبارەکاندا جێیان نابێتەوە، ئەوکات فیل-مرۆڤەکان چ دەکەن، دەزانن چ دەکەن؟"

چاوی بەسەر ئاپۆرای مێروولەکانی مەیدانەکەدا گێڕا کە پاڵەپەستۆی یەکتریان دابوو.

"چ دەکەن؟"

هەمـدیس هـیچ وەڵامێکـی نەبیسـت. مێروولەکـان چـۆن بزانن فیل-مرۆڤەکان چ لەو بەرهەمانە دەکەن!

مێروولەیەک گوتی:

"دەیدەن بە مێرووە-مرۆڤەکان."

پۆپەبەرز زەردەخەنەیەکی هاتێ و گوتی:

"پێیان نـادەن. پێیـان نـادەن! مێرووە-مـرۆڤە برسـییەکان بەدەم قووتدانی ئاوی زاریانەوە سـەیری ئەو بەرهەمـانە دەکەن. لە برسـان سـوێیان دەبێـتەوە، فیـل-مرۆڤەکـان تەنـانەت دەنکێـک لەو بەرهەمـانە نـادەن بە مێـرووە-مرۆڤەکان."

مێروولە گەنجەکە دیسان بێسەبرانە پرسیی:

"ئەی چیی لێ دەکەن؟"

سەرکردەی پەپووەکان گوتی:

"دەیسووتێنن، دەیسووتێنن، بەرهەمی زێدە دەسـووتێنن. لەپێش چاوی مێرووە-مـرۆڤە برسـییەکان دەیسـووتێنن. بە دەریـــــا و ڕووبارەکـــــانی دادەکەن، مێـــــرووە-مرۆڤەکانیش لە برسان دەمرن."

سوڵتانی فیلەکان قۆرتمەکەی بەرەو حەوا بەرز کردەوە و بە شانازییەوە گوتی:
"دەمرن."
"سوڵتانی ئێمە، فیلەکانی ئێمە بە هیچ شێوەیەک لە فیل-مرۆڤەکان ناچن. ئەو مرۆڤ-فیلانە خاینترین ئاژەڵن زەوی بە خۆیەوە بینیبێ و هیچ شتێک نەماوە بەسەر مێرووە-مرۆڤەکانی نەهێنن، لەوەتەی دونیا دونیایە خوێنی ئەوان دەمژن."
مێرووە گەنجەکە پرسیی:
"باشە مێرووە-مرۆڤەکان بەرامبەر بەم چەوسانەوە و ئەشکەنجە و برسیبوونەدا ئاوا دەستەوەستاون؟"
سوڵتانی فیلەکان بە پەلە ئاماژەیەکی بۆ سەرکردەی پەپووەکان کرد، ئەویش دەسبەجێ لە پرسیاری مێرووە گەنجەکە گەیشت و وای نواند نەیبیستووە.
"سوڵتانی ئێمە باشە، دەبێ ئاوی حەیاتی بۆ بدۆزرێتەوە، نموونەیەکە بۆ هەموو فیلەکانی دونیا. بۆ سەرجەم فیل-مرۆڤەکان، فیل-مانگاکان، فیل-چەقەڵەکان، فیل-مارەکان، فیل-کەرەکان و فیلەکان نموونەی چاکەیە."
سوڵتانی فیلەکان سەری قسەکانی گرتەوە دەست و گوتی:
"برا مێروولەکانم، جا ئەو فیل-مرۆڤانە هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دونیاوە بەدوای ئاوی ژیاندا وێڵن. ئەوان بە ڕادەیەک زاڵم و خراپ و چەوسێنەرن کە سروشت ئاوی حەیاتی پێ نەداون. ئێستا برا

مێروولەکانم ئێوە بە هونەر و ئەقڵی خۆتان ئاوی حەیاتم بۆ بدۆزنەوە."
مێروولەکان لە کاتێکدا لە مەیدانەکە بە دار، بەرد، زنار، گیا، پووش و گوڵەکانەوە لکابوون، بە یەک زار هاواریان کرد:
"دەیدۆزینەوە."
"ڕاوەستاو بن، سەلامەت بن، ئەمنیش ئەمڕۆ بە بۆنەی سەد هەزارەمین ساڵیادی برایەتیی فیلەکان و مێروولەکان، حەوت عەمباری گەورە و ئاخنرا بە شیلەی گوڵ و گەنم و کاکڵتان بۆ دەکەمەوە. گشت مێروولەکانی ژێردەستم بە بۆنەی سەد هەزارەمین ساڵوەگەڕی برایەتیمان حەوت ڕۆژ و حەوت شەو دەخۆن و دەخۆنەوە و هەڵدەپەڕن. پاشانیش، دوای حەوت ڕۆژ بەشێکی بەرچاو لە ژیرترین مێروولەکان بۆ دۆزینەوەی ئاوی حەیات دەکەونە ڕێ و تا ئاوی حەیات نەدۆزنەوە، ناگەڕێنەوە."
ئیستێکی کرد، قۆرتمە درێژەکەی بەسەر مێروولەکاندا گەڕاند و هاواری کرد:
"نامەوێ بمرم، نامەوێ بمرم، نامەوێ بمرم."
ئەرز و ئاسمان لەرزی.
"نامەوێ بمرم."
دیسان ئیستێکی کرد، ئەوەندەی دەلوا قۆرتمەکەی بەسەر مێروولەکاندا درێژ کردەوە:

"ئەگەر مێروولەکـان ئـاوی حەیـاتم بـۆ بـدۆزنەوە، ئەم دونیـایە دەگـۆڕم. ئەو مێـروولانەی ئـاوی حەیـاتم بـۆ بـــدۆزنەوە دەیـــانکەمە فیـــل و ئەو فـــیلە لاقنگپـــانە بەکەڵکنەهـــاتوانەی دەوروبەریشـــم دەکەمە مێـــروولە. بەڵاااام ئەگەر بێتــو مێروولەکـــان ســـەرچاوی ئـــاوی حەیاتم بۆ نەدۆزنەوە، لەم دونیایە بێهیوا بن، ئەم فیلە لاقنگپـانە بەکەڵکنەهـاتوانە ڕەوانەی وڵاتـی مێروولەکـان دەکەم، هەموویان پان دەکەنەوە و ناهێڵن یەک مێروولە لەسـەر ڕووی زەوی بمێنێتەوە. نـامەوێ بمـرم، نـامەوێ بمرم، نامەوێ بمرم! سوڵتانی فیلەکان چۆن دەبێ بمرێ، مەرگ بە شایانی خۆم نازانم. کەس بڕوا بە مەرگ ناکا، منـــیش بـــڕوای پـــێ نـــاکەم. مەرگ، ئەی بـــانتر لە ئاسمانەکان، ناتوانم دڵ بە تۆ بدەم. نامەوێ بمرم. بۆیە دەبێ سەرچاوەی ئاوی حەیاتم بۆ بدۆزنەوە."

هاواری مێروولەکان لە مەیدانەکە دەنگی دایەوە:

"دەیدۆزینەوە."

"دەی کەواتە بیکەنە جەژن."

حەوت کلیلی گەورەی لەبەر پشتێنەکەی دەرهێنا و دایە فیلی عەمبارچی.

"دەرگەی حەوت عەمباران هەر ئێستا بکەرەوە."

مێروولەکـــــان پاڵەپەســـــتۆی یەکتریـــــان دا و بە خۆشـــحاڵییەوە بەرەو عەمبارەکـان ڕایـانکرد. جەژن و شـــایی دەســـتی پـــێ کـــرد. مێروولەکـــان خواردیـــان،

خواردیانەوە و هەڵپەڕین. داوەتەکەیان، داوەتی جەژنە کۆنەکانی مێروولەکان بوو.
دوای حەوت ڕۆژ جەژن کۆتایی هات.
سوڵتانی گازی کردە پۆپەبەرز و گوتی:
"سەرکردەی پەپووەکان، برای بەڕێزم، ئەم ماستە بێ موو نییە. هەر شتێکی داوام کرد، بێ ئەوەی نارەزایی دەرببڕن، پەسەندیان کرد. من لەو کردارەیان بەدگومانم. بە شتی مەحاڵیش هەر دەڵێن بەڵێ."
پۆپەبەرز پرسیی:
"باشە چ چاوەڕوانییەکت لێیان هەبوو، سوڵتانی خۆمان؟"
سوڵتان:
"لانیکەم بەرامبەر بە داواکارییەکم نارەزاییان دەربڕیبایە..."
"نەیاندەتوانی نارەزایی دەرببڕن سوڵتانم."
"بۆچی؟"
"چونکە ئەو چیایانەی پشتیان پێ بەستبوون، ڕوخان."
"چ بووە؟"
پۆپەبەرز ئەو ڕووداوانەی لە چیا قەومابوون، ئەوەی کە چۆن ڕیشسوورەکان فریوی مێرووە زەردەکانیان خواردووە کە ڕیشیان بە خۆیانەوە هەڵواسیوە و پێکهەڵپرژانیانی بە بیر سوڵتان هێنایەوە.
سوڵتان شانزە جار سکی با دا و بە پێکەنینەوە گوتی:
"هاتەوە یادم، هاتەوە یادم. ئەو ڕۆژەم بە بیر دێ، جوان جوانم بە بیر دێ. کەواتە ئەوێ مێروولەی سووری لێ نەماوەتەوە؟"

پۆپەبەرز گوتی:

"ئەگەر مـــــــابێتیش گــــــوێ مەدەیە. لەمەوبەدوا ڕیشسـووورەکان هیچیـان لەدەسـت نـایە. وەهـا تـۆوێکی دووبەرەکیمـان لەنێوانیانـدا چانـدووە کە ئیتـر تـا ڕۆژی قیامەت ناتوانن پشتیان ڕاست بکەنەوە..."

"ئەو ڕۆژەم بە بیـر دێ، باشـم بە بیـر دێ. چ ڕۆژێکـی خۆش بوو ئەو ڕۆژە. چ خۆش بوو..."

"زۆر پێکەنیین سوڵتانم."

"ئەو ڕۆژەم بە بیر دێ، بە بیرم دێ مێرووولەکان چـۆن یەکتریان دەکوشت و من لە خۆشیان پێدەکەنیم."

"لەگەڵ چیاکـــان، بەردەکـــان، دەریاکـــان، زنارەکـــان، ئاسـمانەکان و دارسـتانەکان بەو مێـرووولە قارەمانـانە پێکەنیبووی کە یەکتریان دەکوشت سوڵتانی خۆمان."

"مێرووە زەردەکـانم، جوامێرەکـانم! حەیـف ئەو مێرووە بێشـەرەفانە زەردەڵەکـانی منیـان کوشـت... مێرووولەکـان ڕەنگی سـوورریان لە ڕیشـی مێرووە زەردەکـانی مـن دا، کوشـتیانن و تەرمەکانیـان لەبەر دەرگەی کۆشـکەکەی مـن فـڕێ دا. پێیـان وا بـوو مـن بەم فێڵەیـان لە خشـتە دەبرێم و بڕوایان پێ دەکەم."

"ئێسـتاش هەر وا بیـر دەکەنەوە سـوڵتانم. هێشـتا پێیـان وایە ئێمە بە چـاوی مێرووولەی ڕیشسـوور سـەیری ئەو تەرمانەمان کردووە."

"توخـوا بـا هەر وا بیـر بـکەنەوە پـۆپەبەرزی بـرام! بـا تێـنەگەن بە فـێڵەکەی ئەوانـم زانیـوە... لە ناچارییـان

چاوپۆشـــیم لەم تاوانەیـــان کـــرد. ئەوەتـــا مێـــرووە زەردەکانم تۆڵەی ئێمە و خۆیان بە زیادەوە لەوان و لە ڕیشسـوورەکانی پشـتوپەنایان کـردەوە... ئـاخرییەکەی تۆڵەیان کردەوە، تۆڵەیان کردەوە..."

پۆپەبەرزیش بە جریوەی خۆشی قسەی فیلی پشتڕاست کردەوە کە دەیگوت "تۆڵەیان کردەوە، تۆڵەیان کردەوە."

"تۆڵەیان کردەوە، تۆڵەیان کردەوە!"

پەپوولەکـــان بە دڵخۆشـــییەوە لەســـەر لقوپۆپەکـــان خوێندیان و بەشداریی ئەو بەزمەی سوڵتان و پۆپەبەرز بـوون، فیلەکـانیش بـۆ سـەدەمین جـار کەفەڵیـان بە دارەکاندا خشاند و مەست و سەرخۆش بوون.

"تۆڵەی خۆیان کردەوە... بۆیەش ئەم مێروولە فیلبازانە سزا نادەین، سوڵتانی خاوەن شکۆم."

سوڵتان بە گوڕوتینەوە بەردەوام بوو:

"سزایان نادەین."

پۆپەبەرز پێشنیاری کرد:

"کاری قورس، هیی زۆر قورسیان دەخەینە ئەستۆ."

"کاری وا قورسـیان دەخەیـنە ئەسـتۆ کە تەنـانەت کـاتی ئەوەیـان نەبـێ بـۆ سـاتێک تێبفکـرن. هەرگیـز دەرفەتـی ئەوە بەو مێـــرووڵانە نـــادەین تەنـــانەت سەریشـــیان بخورێنن. بەردەوام دەبێ ترسـی کـار، ترسـی تێکۆشـان، ترسـی برسـیبوون، ترسـی هەژاری، ترسـی داهاتوویـان هەبـێ. ئەم ترســانە کــوێر و کەڕ و گێلیــان دەکــا و

مێشـکیان دەفەوتێنـێ. فیـل-مرۆڤەکـان بەردەوام وا لە مێروو-مرۆڤەکان دەکەن."
سوڵتانی فیلەکان بە سەرسوورمانەوە گوتی:
"ئەی لەوانە! هـیچ بیـرم لەمە نەکردبـووەوە. ئەم فیـل-مرۆڤانە چ مێشکێکیان هەیە."
"مێشـکێکی زۆر لە مرۆڤسـتان بـۆ ئەوان، بـۆ ئەو فیـل-مرۆڤانە کار دەکەن. ئەو مێرووە-مرۆڤانەیش وا کەمێک بیر دەکەنەوە، وەک خۆیان دەیانکەنە فیل."
سوڵتان لە کاتێکدا فیکەی سمێڵانی دەهات، گوتی:
"بـا ئـێمەش وا بکەیـن. کەواتە ئێسـتا تـۆ کـارێکم بـۆ بدۆزەوە، کار... با ئەوەندەیان کار بخەینە ئەستۆ، نەک هەر نەتـوانن بیـر بـکەنەوە، بگـرە دەرفەتـی هەناسەدانیشـیان نەبێ، ڕێک وەک مێرووە-مرۆڤەکانی مرۆڤستان."
"جـا چ زۆرە کـار سـوڵتانم، مـن ئەوەنـدە کـار بـۆ مێرووولەکـان دەدۆزمەوە کە ئەگەر ئەمـڕۆ دەسـت بە یەکیان بکەن، پانزە ساڵی تر بۆیان تەواو نەبێ."
"پێم بڵـێ، بە منـیش بڵـێ، زوو پێم بڵـێ، پاشـانیش بـڕۆ فەرمانەکەم بە مێرووولەکان ڕابگەیەنە."
"بۆ هەر فیلێک کۆشکێک."
"باشە، جوانە. فەرمـانەکەم هەر ئێستا بە گوێی مێرووولەکان بگەیەنە. با بۆ هەر فیلێک کۆشکێک ساز بکەن. ئەوان هێندە زۆر و هێنـدە بەکـارن، نەک هەر کۆشـێک، بگـرە بـۆ هەر فیلێک دەتوانن سێ کۆشک دروست بکەن."

"هێشتا ماوە ئەزبەنی، هێشتا ماوە. دەبێ عەمبارەکانی ئەوبەری چیاکەش بۆ پەپووەکانی من پڕ بکەن لە مێشومەگەز."
"یەکسەر بڕۆ و فەرمانی من بە مێرووولەکان ڕابگەیەنە."
"هێشتا ماوە سوڵتانم. لەسەر لوتکەی ئەو چیا بەرزە، دەبێ پەیکەرێکت بۆ دابتاشن کە هێندەی چیاکە بڵیند و بەسام بێ. بە حوکمی ئەوەی تۆ قەت نامری، ئارامگە پێویست ناکا. دەبێ پەیکەرەکەت سەر لە ئاسمان بسوێ و بگاتە ئەستێرەکان. بۆ هەر پەپوویەکیش هێلانەیەک و عەمبارێک کوللە... ئێمەی پەپوو کوللە، هەروەها پەیکەری سوڵتانی خۆمانمان زۆر خۆش دەوێ..."
"هەر ئێستا، هەر ئێستا دەفرێت و فەرمانی من بە مێرووولەکان ڕادەگەیەنی، لەگەڵ ئەوەی فەرمانەکەمیان بیست، دەست بە کار دەبن. لەبەر کارێ نابێ سەریان هەڵبڕن و چاویان بترووکێنن. دەی بفڕە، بڕۆ بۆ ئەوێ، لە هیچ شوێنێ خۆت مەخافڵێنە و زوو بگەڕێوە."
پۆپەبەرز دەسبەجێ وێڕای سێ پەپووی گەنج بەرەو وڵاتی مێرووولەکان هەڵفڕی، فەرمانی سوڵتانی بە یەکە یەکەی وڵاتی مێرووولەکان ڕاگەیاند.
سەرکردەی پەپووەکان زۆری پێ نەچوو گەڕایەوە کۆشک.
"زوو پێم بڵێ، کاردانەوەیان چۆن بوو؟"
"گوتیان فەرمانی سوڵتان بان سەرمان، یەکسەر دەست بەکار بوون. کە بەرەو ئێرە دەهاتمەوە، بەسەر ئەواندا

فڕیم، لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا، مێروولەکان لەسەر ڕێوبان، لەنێو دەشت و لە شاخەکان بە دووی یەکدا ڕیز بووبوون و بەرەو نێوەڕاستی زەوی دەڕۆیشتن. بۆ گەیشتن بە نێوەڕاستی زەوی و دۆزینەوەی ئەڵماسی پەمەیی، هەمدیس خۆڵیان دەدایەوە."

"ئەی ئەم ئاوی حەیاتە بوو بە چی؟"

"بۆ گەڕان بەدوای ئاوی حەیاتدا دەمێکە مێروولەی هەرە هەڵبژاردە و بزۆز و زانایان لەگەڵ مێروووە عەجەمەکان بۆ چوار سووچی دونیا ناردووە."

"کەواتە هەموو نارەزاییەکانیان، فیلبوون و کەفەڵخوراندنەکان و شیلەی گوڵ ویستنیان لەبەر ئەم ئاسنگەرە شەلە بوو. هەواڵەکە ڕاستە، وا نییە؟ ئاسنگەری شەل مردووە؟ ئەمن بڕوا ناکەم."

"سەرکردەی مێرووە زەردەکان کوشتوویەتی، ئێستا مێرووە زەردەکان بە فەرماندە بانگی دەکەن."

"ئەگەر فەرماندە کوشتبێتی، ئەگەر کەللەسەری ئەو ئاسنگەرە شەلەم بۆ بێنێ، ئەمنیش پلەی فەرماندەیی پەپووەکان و فیلەکانی پێ دەبەخشم."

"فەرماندەی پەپووەکان منم سوڵتانم..."

"دەی ئەمنیش دەیکەمە فەرماندەی چێرگ و سوێروو و داڵاش و جونە و باز و چۆلەکەکان. فەرماندەیی کام مەلی پێ خۆش بێ... بە درێژایی تەمەنیشی، ئەوەندەی پێی خۆش بێ، عەمباری پڕ لە خواردەمەنیی پێ دەدەم،

هەروەها کۆشکێک بۆ فەرماندە بە دروستکردن دەدەم...
پەیکەریشی بۆ بە دروستکردن دەدەم."
"کوشتوویەتی سوڵتانم. بەم زوانە هەواڵی بۆ دەنێرم بۆ
ئەوەی کەللەسەری ئاسنگەریشت بۆ بێنێ."
"تۆ هەر ئێستا برۆ بۆ ئەوێ و وەرەوە..."
"چـــوونی مـــن بە قـــازانج نیـــیە. مێـــرووە زەردەیەکـــی
ڕیشدەستکرد دەنێرم. فەرماندە لەوێ سوێندی خواردووە
تا مێروولەیەکی ڕیشسوور مابێ درێژە بە شەڕ بدات."
سوڵتان گوتی:
"ئەمان با درێژەی پێ بدا. نامەوێ، با نەیەتەوە. با یەک
ڕیشســــووریش نەمێنێـــتەوە، تـــۆ ئەو مێـــرووە زەردە
ڕیشدەستکردە لە کۆڵی پەپوویەک بکە با بیبا بۆ ئەوێ
و لەوێ دایبەزێنێ. پێی بڵێ با بە فەرماندە بڵێ تا ڕەگی
فیتنە وشک نەکا، نەگەڕێتەوە. ئێستا گوێم لێ بگرە،
ئینشـــاڵڵا ئاســـنگەر مـــردووە، ئەگەر زینـــدووە دەبـــێ
بکوژرێ. لەگەڵ ئەوەشدا لەوە دەترسێم ئەم مێرووڵانە
شتێک بکەن. ڕۆژێک دادێ، ئەمانە بە بیریان دێتەوە
مێـرووله بـوون. جـا ئەودەم لە ڕێگەیەک دەگەڕێـن لە
چنگ ئێمە ڕزگاریـان بـێ، ئەو ڕێگەیەش دەدۆزنەوە...
ئەوان هێنـدە زۆر و هێنـدە بەهێـزن نەبێـتەوە... لەبەر
ئەوەش بـا ڕاسـتییەکان ببینـین، بە دڵنیـاییەوە ڕۆژێـک
دادێ ئەوان بە بیریان دێتەوە مێروولە بوون."
"ئەوان قەت لە بیریان ناچێتەوە کە مێروولەن سوڵتانم.
زۆرن ئەوانەی لە بیریـــان دەچێـــتەوە، بەڵام زۆریـــنە لە

یادیـــان نـــاچێتەوە. بەس وا دەنـــوێنن کە لە بیریـــان چووەتەوە. زۆر باش دەزانن مێروولەن! هـاواری ئێمە فیلـین، ئـێمە فیلـین فشـەیە، خۆفریـودانە... ئەو کاتـانەی دەیانزانی ئاسنگەری شەل زیندووە، ئومێدێکیان هەبوو، هەم بە هەمـوو شـتێ ڕازی دەبـوون و هەم لاسـارییان دەکرد. ئێستا بێهیوان."
"باشـە کە بێهیـوان. یەکەم کارێـک ئـێمە دەبـێ بـیکەین ئەوەیە هیوایـان بکوژین. ئەو ڕۆژەی هیـوا بە یەکجـاری لە دڵیاندا کوژایەوە، مێرووولایەتیشیان تەواو دەبێ. پێیان وا دەبـــێ کۆمەڵێــک بـــوونەوەری لەبەردڵانـــن و بـــۆ کارکردن و خزمەتکردن بە فیلەکان ئافرێنراون."
"فیـل-مرۆڤەکـان ڕێـک ئـاوا لەگەڵ مێـرووە-مرۆڤەکـان مامەڵە دەکەن، هیوای ناخیان دەڕزێنن."
"زۆر باشە، کەواتە فیکرم بۆ شتێکی چاک چووە. ئێمە بۆ ئەم مەبەستە دەتوانین چی بکەین؟"
"قوتابخانەی فیلکردنـی مێروولەکان دەکەینەوە. بێچووە مێروولەکـان هەر لە هـێلکە هـاتنە دەرێ، دەیـانبەینە ئەو قوتابخانـــانە و پەروەردەیـــان دەکەیـــن. ئەوان بـــا مێـروولەش بـن، خۆیـان وەک فیـل دێتە پێش چـاو، لە فیلەکان زیاتر دڵیـان بۆ فیلبوون لـێ دەدا. سـەدان ساڵە لە مرۆڤســـتانێ ئەم سیســـتەمی پەروەردەیە بەڕێـــوە دەچێ. ئەوان دەبنە فیل، خۆیان وەک فیل دێتە بەرچـاو، بەڵام قەت لە بیریان ناچێ کە بەقەد مێروولەیەک فیلن."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:

"زۆرم مێروولەی وا پێویستە. وەکوتر چیت بە مێشک دەگا سەرکردەی پەپووەکان، وەکوتر چی؟"
"وەکوتر، سولتانی خۆم، لەسەر هەر گردێ، هەر شوێنێ، هەر شارەمێروولەیەک سەدان شەیپوورچی دادەنێین. ئەو شەیپوورچییانە، بەردەوام، بێ ڕاوەستان، بێ ماندووبوون، شیلگیرانە گەورەیی فیلەکان و نەگۆڕبوونی ئەم سیستەمە دووپات دەکەنەوە، کە ئەگەر ئەم سیستەمە بگۆڕدرێ دونیا سەراوبن دەبێ و تەنانەت بوونەوەرێک لەسەر ڕووی زەوی و لە گەردووندا زیندوو نامێنێتەوە، جەخت لەوە دەکەنەوە مێروولەکان بە ڕەگەز فیل بوون، بەڵام بەقەد مێروولەیەک فیلن."
"خێراکە، چەندە شەیپوور پێویست بێ، ئەوەندە شەیپوور لە مرۆڤەکان بکڕە."
"دەیکڕم سولتانم."
"لە کوێ، چۆن؟"
"شەیپوور داهێنانێکی کۆنە سولتانم، لای هەر قەومێ دەست دەکەوێ. بۆیە پەپووەکانم بە دونیادا بڵاو کردەوە، لە کوێ چەندەیان شەیپوور بینیبێ، کڕیویانە و هاتوونەتەوە."
"چاکە، چاکە، کارەکان باش دەڕۆنە پێش پۆپەبەرزی برام. تەماشا کە، ئەو هەموو ساڵە، ئەم هەموو مێروولەیە هەبوون و ئێمە گێل و حۆل، ڕووتوڕەجاڵ ژیاوین!"

"وایە سوڵتانم، چ بکەین، با لەمەودوا مل پێوە بنێین."
"مـــن پـــێم وا نیـــیە ئەم مێـــروولانە بەو جەســـتەی بچووکەیـانەوە ئەوەنـدە گەمـژە بـن بیـر لەوە بـکەنەوە دژی مـن و ئێمەمانـان ڕابپەڕن، مێروولەیەک چاوی بە فیلێک بکەوێ، لە ترسان زراوی دەتۆقێ."
"بەڵام ڕیشسووریشیان تێدا هەڵدەکەوێ سوڵتانم."
"هێشتاش هەن ئەوانەی هەڵدێن و دەچنە ئەوێ؟"
"هیچـت لـێ حەشـار نـادەم سـوڵتانم. ئەوان پـۆل پـۆل هەڵـدەهاتن و دەچـوونە لای ئاسـنگەرە شـەلە و ئەوانە، بەشـــداری ئەوان دەبـــوون. ئێســـتا کە بیســـتوویانە ئاسنگەری شەل مردووە، هەموویان دۆش داماون."
"شـــەیپوورەکان هەرە زێـــدە ئەوان هیـــوابڕاو دەکەن، شـــەیپوورەکان بەردەوام دووپـــاتی دەکەنەوە کە خـــوا و سروشت ئەم دەورانەیـان ئاوا دروسـت کردووە، فیـل فیـل و مێروولە مێروولە دروست کراوە، ئەمە قەت نـاگۆڕدرێ، بەس بە کـارکردن و زەحمەتکێشـان دەتـوانن خۆتـان لەبەر چاوی فیلەکـان خۆشەویست بکەن، مێروولەکـان تەنیـا بەم جۆرە دەتـوانن ببـنە فیـل، ئەویش بەس بەقەد مێروولەیەک دەبـنە فیـل. شـــەیپوورەکان دەبـــێ گـــۆرانیی دڵنشـــین و گـــوێبزوێن بچـــڕن، ســـاز بـــژەنن، گشـــت ئەمـــانە دەبـــێ بێهۆشـــکەر و هیـــوابڕ و ڕەش بـــن. دەبـــێ مێروولەکـــان بڕزێنن."
"چەنـد ڕۆژێکـی تـر شـــەیپوورەکان وەگەڕ دەخەیـــن، ســـوڵتانم... قوتابخـــانەش ســـبەینێ دەکەمەوە. دەمـــێکە

ئامادەكاریم بۆ كردووە. دوژمنمان مێروولەش بێ، نابێ پێمان هیچ بێ.

لە سەرجەم وڵاتی مێروولەكان و شوێنی ئیشەكانیان شەیپوور داندران. شەیپوورەكان ڕۆژانە بیستوچوار سەعات كاریان دەكرد. مێروولەكان پێشان ئەم هەموو قسە و ئاوازەیان بە لاوە نامۆ بوو، پاشان هێدی هێدی ڕاهاتن. هەموو شتێكیان لە بیر چووەوە و شەیدای شەیپوورەكان بوون. شەیپوورەكان ئەگەر ڕۆژێك، ئەگەر چركەیەك بێدەنگ بونایە، مێروولەكان شێت دەبوون. بە جۆرێك بەو شەیپوورانە ڕاهاتن كە شەیپوورەكان بوون بە پارچەیەك لەوان. ئیدی بەرامبەر بە هیچ شتێك نارەزاییان دەرنەدەبڕی، ئەگەر ڕۆژێك سوڵتان دەنگی شەیپوورەكانی كپ بكردایە، ئەوا قیامەت بەرپا دەكرا. بەو شەیپوورانە گۆڕانكارییەكی بەرچاو لەنێو مێروولەكاندا ڕووی دا. پۆپەبەرز و پەپووەكان و ئەو مێروانەی خۆیان بە فیل لەقەڵەم دەدا و لە سوڵتان نزیك بووبوونەوە، هەموو ڕۆژێ، سەبارەت بە ڕووداوەكانی وڵاتەیلی مێروولەكان تەنانەت بچووكترین وردەكارییان بە سوڵتان ڕادەگەیاند. سوڵتان دەستەیەكی دامەزراندبوو كە بە وردی سەرجەم ڕووداوەكانیان تاوتوێ دەكرد.

دوای ئەو شەیپوورانە، ژمارەی ئەوانەی دەبوونە ڕیشسوور و لە چیاكانیان دەدا بە ڕادەیەك كەم بووبووەوە كە دەتتوانی بڵێی هەر نەماوە. جا با ئەو

مێـرووولانەی بەرئەنـدامی فیلبـوونن، قوتابخـانە تەواو بکەن و بڵاو ببنەوە، ئەودەم مێروولەکـان جارێکی تـر نـاتوانن پشتڕاسـتی بـکەنەوە و بـۆ هەمیشـە لە بیریـان دەچێـتەوە کە مێـروولە بـوون. ئەو دەسـتە زانسـتییەی سـولتان دایمەزرانـدبوو، بە وردبینـی و سـەرنجەوە لێکۆڵینەوەیان لە بارەی ڕیشسوورەکان دەکرد.

سـولتانی فیلەکـان متمـانەیەکی زۆری بە مێروولەکـانی هەبـوو کە ئەم کۆشـک و کورسـییەیان بـۆ دروسـت کردبـوو و ئەو هەمـووە خواردەمەنییەیـان بـۆ کۆکردبـووەوە. ئەوان ئـاوی حەیاتیشـیان بـۆ سـولتانی خۆیان دەدۆزییەوە.

ئەوەی ڕاسـتی بـێ، زۆری پـێ نەچـوو مێروولەکـان مەکینەی کەفەڵخوراندنیان بۆ سولتانی خۆیان دۆزییەوە و بۆیـان هێنـا. ئەویـش پێنج یـان دە مەکینە نـا، بەڵکو هەزاران هەزار... مرۆڤەکانیـان بە شـتی ورتکەوپـرتکە هەڵخەڵەتانـدبوو و ئەم مەکیـنە بەنرخانەیـان بـۆ سولتانەکەیان هێنابوو. سولتان بێڕادە دڵی بەو مەکینانە خـۆش بـوو. مێروولەکـان کە ئەم مەکینـانەی کەفەڵخوراندنیان دۆزیوەتەوە، بێگومـان ئـاوی حەیـاتیش دەدۆزنەوە. سـولتان سـەرەتا جـوانترین مەکیـنەی بـۆ خۆی هەڵبژارد، بە کەفەڵییەوە نـا، مەکینەکە بە کەفەڵیدا هات و چوو و خوراندی، سـولتان مەسـت و سـەرخۆش بـوو. ئەم فیـل-مرۆڤـانەی مرۆڤسـتان چ پێشـکەوتوون. ئـافەرین! بوونەوەرێـک لە سـەرووی ئەم فیـل-مرۆڤـانە

بەدی ناکرێ لەم جیهانەدا. تەنانەت لەسەر مانگ و ئەستێرەکانیش. ئەو بوونەوەرانەی مەکینەی کەفەڵخوراندنیان دروست کردووە، چی هەیە لەدەستیان نەیە...؟ نەخێر نەخێر، مێروو مرۆڤەکان ئەم مەکینانەیان بۆ دروست کردوون. بۆ دروستی نەکەن جا؟ لە هەزاران ساڵ لەمەوپێشەوە فیل-مرۆڤەکان ڕێگەی کارپێکردنی مێرووە-مرۆڤەکانیان دۆزیوەتەوە، لە کاتێکدا فیلی فیل دوێنێ و ئەمڕۆ دەستی پێ کردووە. ئەم مێرووە مێروانە وەک مێرووە مرۆڤەکان هێمن نین، یەکسەر بوونە ڕیشسوور، بەدوای ئەو ئاسنگەرە شەلە کەوتن، ڕاپەڕین و ڕۆیشتنە سەر ئەو چیایە. چا نییە پۆپەبەرزی سەرکردەی پەپووەکان زۆر شت لە مرۆڤەکانەوە فێر بووە و بەکەڵکمان دێ.

سوڵتان، هەر لەوێ مەکینەیەکی کەفەڵخوراندنی دا بە پۆپەبەرز. سەرکردەی پەپووەکان بە ڕادەیەک خۆشحاڵ بوو کە یەکسەر کەفەڵی بە مەکینەکەوە نا و بەکاری هێنا.

"سوڵتانم، ئیتر ئەگەر بەم مەکینەیەش نەبمە فیل..."

سوڵتان بە زمانێکی لووس گوتی:

"تۆ بەردەوام فیل بووی برام، ئەویش فیلێکی باڵندە و ژیر."

پۆپەبەرز بەم قسانە شایی لە دڵ گەڕا و لە خۆشیان فرمێسک لە چاوانی زا.

"ئەم مەکینەیەش بۆ فەرماندە... کەی هاتە ئێرە با مەکینەکەی وەربگرێ. ئەم مەکینەیە لە باشترین شوێنی کۆشک دابنێن."

سەرکردەی پەپووەکان ئێرەیی بە فەرماندە برد، بەڵام بە ڕووی خۆی نەهێنا.
"بەپێی پێویست ئەمانە با بەسەر قوتابخانەکانی بەفیلکردنی مێروولەکانیشدا بڵاو بکەینەوە."
"بڵاویان دەکەینەوە سوڵتانم."
"با چەند دانەیەکیش بدەین بە فەرماندە فیلەکان."
"پێیان دەدەین سوڵتانم."
"ئەگەر ئەم ئاسنگەرە نەمردبێ، با مەکینەیەکی کەفەڵخوراندنی بۆ بنێرین، بەم جۆرە لەوانەیە گیرۆدەی کەفەڵخوراندن بێ، مەست بێ، لەسەرخۆ بچێ و بێتە ژێر فەرمانی من، وا نییە؟"
پۆپەبەرز گوتی:
"لەوانەیە. کێ دەزانێ، ڕەنگە بهاتایە ژێر فەرمانت، بەڵام ئەو لەمێژە مردووە. ئەم جۆرە کارانە لە لای مێرووە-مرۆڤەکانیش بینراون، گەلەک سەرکردەی مێرووە-مرۆڤەکان هاتوونەتە ژێر ئەمری فیل-مرۆڤەکان. سوڵتانم، مێرووە شەلەی ئاسنگەر بۆچی نەیەتە ژێر فەرمانی سوڵتانێکی گەورە و بەشکۆی وەک جەنابت؟ بەڵام دەزانم فەرماندەکەمان، مێرووە زەردەکەمان کوشتوویەتی. ئەم فەرماندە زەردە قارەمانێکی لێ هەڵکەوت، کەسێکی زرنگ و ڕێکخەری لێ هەڵکەوت."
"ئەگەر فەرماندە ئەوێ چارەسەر بکا و بێتەوە، دەیکەمە ئەندامی دەستەی زانستی و فیلەکانیش..." سوڵتان، خێرا بۆی دەرکەوت سەرکردەی پەپووەکان بەم قسانە زویر

بووه و ئێرەیی بە فەرماندەی مێرووە زەردەکان دەبا و قسەکەی لێرەدا بڕی. "لەم فیلستانەدا بە دڵی تۆ دەکەین. تۆ زاناترین کەسی فیلستانی. من لە سایەی تۆوە بەم بەختەوەرییە گەیشتم. بۆیە تۆ ڕووناکی و بیلبیلەی چاوی منی. ئەمە باش بزانە پۆپەبەرزی برام، زاناترینی زانایان."

پۆپەبەرز لە خۆشیان هەڵلەرزی و گوتی:

"ڕاوەستاو بی سوڵتانم."

مەکینەی کەفەڵخوراندنەکەی هەر وا کاری دەکرد و لارانی هەڵدەکڕاند. چاوەکانی مەست بووبوون. گوتی:

"سوڵتانم، بە هۆی ئەم مەکینەوە ئیتر پەڕوپۆم پێوە نامێنێ، وا نییە؟"

سوڵتان گوتی:

"پێوەی نامێنێ. ئەم فیل-مرۆڤانەش بێهاوتان، حەزم دەکرد لەگەڵ سوڵتانی ئەوان ببمە دۆست. زۆر پێم خۆشە ببینم."

پۆپەبەرز گوتی:

"ئەویش وەک سەرجەم فیل-مرۆڤەکانی ترە. کتومت لەوان دەچێ... بەس تاج و گوستیلە و شتەکانی لە فیل-مرۆڤەکانی تر جیای دەکاتەوە. سەرکردەی فیل-مرۆڤەکان کەمێکیش گەمژەن."

سوڵتانی فیلەکان بە سەرسووڕمانەوە گوتی:

"بەڕاست! یانی ئەوان وەک ئێمە و مێروولەکان نین؟"

پۆپەبەرز گوتی:

"نەخێر، ئاوا نین. هەردووک لا وەک یەکن، هەم فیل-مرۆڤەکان دوو چاو و دوو قاچ و دوو دەستیان هەیە و هەم مێرووە-مرۆڤەکان... لە جەستەدا هیچ جیاوازییەکیان نییە."

"سەیرە..."

پۆپەبەرز گوتی:

"بەڵێ، سەیرە. لەوە بترازێ مێروولەکانی مرۆڤستان لە بەرخ دەچن... ڕیشسوورەکانی مرۆڤستانیش زۆر لە ڕیشسوورەکانی ئێمە خراپترن. مێرووە زەردێک بە تەنیا دەتوانێ دەرەقەتیان بێ و بۆ ماوەی چل ساڵی ڕەبەق پێکیان هەڵپرژێنێ."

"سەیرە."

سەرکردەی پەپووەکان گوتی:

"بەڵێ، زۆر سەیرە."

زۆری نەخایاند قوتابخانەی بەفیلکردنی مێروولەکان کرانەوە و پەروەردە دەستی پێ کرد. لە ماوەیەکی کەمیشدا قوتابخانەکان بەرهەمیان دا. وەی کە تینووی فیلێتی بوون ئەم ڕەگەزی مێروولانە! ئەو مێروولانەی دەچوونە قوتابخانە، لە ماوەی تەنیا چەند مانگێکدا ڕێک وەک خودی فیلەکانیان لێ دەهات. وەک فیلەکان هەڵدەستان و دادەنیشتن، خورد و خۆراکیان وەک فیلەکانی لێ هاتبوو، وەک فیلەکان هەڵسوکەوتیان دەکرد، چەشنی فیلەکان بە نازەوە کەفەڵیان لە دارەکان دەخشاند و ڕێک وەک فیلەکان قسەیان دەکرد. هەر

ئەوە مابوو قۆرتمێکی فیل بەو جەستە بچووکەیانەوە بلکێنن و بەو جۆرە لە فیلستاندا بسووڕێنەوە. بەڵام ئەوان قەت لە بیریان نەدەچووەوە کە بەقەد مێرووولەیەک فیلن، وەک ئەو مێرووە ئاوەسۆ و شێتوشوورانەی پێشوو نەبوون. ڕۆژێک دادەهات، ئەوان وەک فیلێک دەبوونە فیل. چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوون. ئەگەر بەقەد فیلێک فیل نەبونایە، بەکەڵکی چ دەهات، ڕەنگە بەقەد فیلێک فیل بوون قازانجی لە بەقەد مێرووولەیەک فیل بوون زێدەتر بێ. هەم بەرپرسیارێتیت بەقەد فیلەکان نییە، هەم ئەو قورساییە هەڵناگری، هەم وەک فیلەکان و بگرە باشتر لەوان دەژی. ئەم مێرووولە خوێندەوارانە، لووتبەرزانە سەیری مێرووولەکانی تر و دایک و باوک و شارۆمەندەکانی خۆیان دەکرد، وا سووک سەیری ئەوانیان دەکرد کە تەنانەت سوڵتانی فیلەکان لەچاو ئەوان بێتەکەبور دەینواند. ئەم مرۆچە وردانە هەر لە ئێستاوە بووبوونە فیلێکی سەیر و بچووکی بەقەد نووکەدەرزییەک، کتومت... لە هەموو ڕوویەکەوە وا خێرا خۆیان گۆڕیبوو نەبێتەوە... ماوەیەکی تر ئەم مێرووە فیلانە قوتابخانەیان تەواو دەکرد، بە ناوی سوڵتانی فیلەکان بەڕێوەبەرایەتیی مێرووولەکانیان دەگرتە دەست. سوڵتان بەڕێوەبەرە کۆنەکانی لەسەر کار لادەبرد، بەڵام چونکە تەمەنێک بەو وەفادار مابوونەوە، ئەوانی دەرنەدەکرد و هەر وا وازی لێ نەدەهێنان، لە کۆشک کاری پێ دەسپاردن و

ئەوانی دەکردە ڕاویژکاری خۆی. بەم جۆرە خەڵکی بە هێزی زیاتر بە خۆیەوە گرێ دەدا و ئەو ڕیشسوورە خیانەتکارانەی لە چیاکانیان پێش لەدایکبوون کپ دەکرد. جاری با ئەو قوتابخانانە، مێروولە فیلەکانی دەرچواندبا، دوای ئەوە ئیتر ئاسان بوو.
شەیپوورەکانیش دەستیان بە قسە کردبوو. مێروولەکان کوێوە چووبان، دەنگی شەیپوورێک لە گوێیاندا دەزرینگایەوە، تەنانەت لە کاتی نووستنیشدا.
شەیپوورەکان هەر کە زاریان لێک دەکردەوە دەیانگوت ئەم سیستەمە ناگۆڕدرێ. ئەم دونیایە گۆڕانی بەسەردا نایە. ئەم مێروولانە، ئەم فیلانە ناگۆڕدرێن، لە شانۆنامەکان، شیعرەکان، گۆرانییەکان، ڕۆمانەکان و چیرۆکەکاندا بەردەوام ئەمانەیان دەگوتەوە. مێروولە ئافاتی مێروولەیە، ئەم دونیایە فانییە، کۆتاییەکەی نەمانە. دەیانگوت ئەم دونیایە، ئەم دونیا ڕزیو و پەست و پیسە شیاوی ژیان نییە. گۆڕینی ئەم دونیایە هەم گەوجیتی و هەم هەوڵێکی بێهوودەیە. لەم دونیا فانییەدا کە هیچ شتێک ناگۆڕدرێ، تێکۆشان بۆ گۆڕینی دونیا گەوجیتی نەبێ، چییە! هیچ مێروولەیەک لەم دونیایەدا بەختەوەر نابێ، چما فیلەکان بەو جەستە زل و زەبەلاحەیانەوە بەختەوەرن؟ تەنانەت سوڵتانی فیلەکانیش بەختەوەر نییە. تەنیا کرداریێ کە دەتوانێ مێروولەکان بەختەوەر بکا، گیانفیدایی لە ڕێی سوڵتان و کارکردن و کارکردن و دیسان کارکردن و قوربانیدانی

مێروولەکانی برایە لەپێناو فیلستاندا. پەیتاپەیتا سەبارەت بە فیداکاریی مێروولەکان بۆ فیلەکان و سوڵتان نموونە دەهێنرایەوە. بەڵێ، مێروولەکان دواجار دەبوونە فیل، ئەوەی ڕاستی بێ ئەوان فیلی تووک لێکراون. هەموو مێروولەیەک پێشتر فیل بووە، بەڵام لەعنەتی لێ کراوە و بەم جۆرە بووەتە مێروولەیەکی ورد. بە کارکردن و بە ئیزنی سوڵتان هەر مێروولەیەک بۆی هەبوو ببێتە فیل. بەڵێ، بە ئیزنی سوڵتان... سوڵتان دەیتوانی پلەی فیلی بدا بە هەر مێروولەیەکی کارکەر. مێروولەکان بە ئیزنی سوڵتان دەیانتوانی ببنە فیل، بەڵام بەس بەقەد مێروولەیەک دەبوونە فیل.

شەیپوورەکان بێوچان، شەو و ڕۆژ، لە بەیانییەوە تا ئێوارە کاریان دەکرد. دەنگی شەیپوورەکان لە ئەرز، ئاسمان، درەختەکان، ڕووبارەکان، دەریاکان، بای هەڵکردوو، ئاوی خرۆشاو، ئەستێرەکان، لە مانگ و خۆر و تیریژەوە دەهات.

مێروولەکان، لە لایەکەوە بە هۆی کار، لە لایەکی دیکەوە بە هۆی شەیپوورەکان، لە لایەکی تریشەوە بە هۆی بەڕێوەبەرە نوێیەکانەوە، ئەوانەی لە قوتابخانەی فیلەکانەوە وەک فیل هاتبوونە دەرێ، ئەو بەڕێوەبەرە مێرووە فیلە نوێیانەی وەک زمانی دایک بە زمانی فیلەکان قسەیان دەکرد، هیچ شتێکیان نەدەبینی، بیریان لە هیچ نەدەکردەوە و هیچیان نەدەبیست. ئیتر وەکو پێشوو هەڵخەڵەتاندن و خۆنواندن لەگۆڕێ نەبوو، هەر

مێـرووولەیەک خـۆی بە فیلێکـی بچـووک لەقەڵەم دەدا، غـــرووری فیلبــوون مەســتی کردبــوون، بەڵام بەقەد مێـرووولەیەک فیـل بـوون، لە نـاخی دڵەوە هەسـتیان بە فیلێتـی و شـەڕەفی فیلبـوون دەکرد و بێ ماندووبوون، وەک فیلێکی مێرووولەئاسـا بۆ سـوڵتان، بۆ فیلەکـان ئەو بوونەوەرە مەزن و دەستپێڕانەگەیشتوانە و تەنانەت بۆ ئەو پەپوانەی بە ئاسماندا دەفڕین، کاریـان دەکرد. ئیتر ئەوان نە مێـــرووولە بـــوون و نە فیـــل، هەر کـــامەو مەکینەیەک بوو و خۆی بۆ فیلستان تەرخان کردبوو.
شەپیوورەکان و قوتابخانەی بەفیلکردنی مێرووولەکـان لە چـاوەڕوانی و ئومێـدی سـوڵتان ئەولاوەتـر چووبـوون. سوڵتان، مێرووولەکانی هان دا شەپیووری پتر، ڕۆژنـامە، سینەما، ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن دابهێنن... دیارە مێرووولەکـان زۆربەی هەرە زۆری ئەم داهێنانەیـــان لە مرۆڤەکـــان دەدزی، بەڵام سـوڵتان وای دەنوانـد بـڕوای بە فیـل و دەهۆی ئەوان کردووە، بۆ هەر داهێنانێک، داهێنەرەکەی بە دیـارییەکی هەزار قـات قورسـتر لە خـۆی خەڵات دەکرد. ئەم داهێنـانە نوێیـانە کـاریگەرییەکی پتریـان دانـا. ئیتر هیچ مێرووولەک بێجگە لەمـانە فیکری بۆ وشـەیەکی تر نەدەچوو.
ئەگەر بەیـانییەک تەلەڤزیۆنەکـان، ڕادیۆکـان، سـینەماکان و شـــەپیوورەکان گوتبایـان: "دونیـایەک لە گـۆڕێ نیـیە، گەردوونێـک لە گـۆڕێ نیـیە، بەس سـوڵتان و فیلەکـان هەن"، ئەوا مێرووولەکـان هەموویـان لێکـدا لێکـدا وەک

کۆمەڵێ پەیڤی پیرۆز ئەم قسانەیان دووپات دەکردەوە: "دونیایەک لە گۆڕێ نییە، گەردوونێک لە گۆڕێ نییە، بەس سوڵتان و فیلەکان و پەپووەکان هەن." مێروولەکان هەندێک ڕۆژ وێڕای ئەم تەلەڤزیۆن و ڕادیۆ و سینەما و شیعر و ڕۆمانانە هەڵدەپەڕین: "کۆشکی سوڵتانی خۆمان، چەند گەورە و چەند بەشکۆیە..." ڕۆژنامەکانی مێروولەکان، پڕاوپڕ بوون لە وەسفی ژیانی بەڕەڵای سوڵتان و ئەوانەی لە قوتابخانەکان بوونەتە فیل و بە پلەی فیلێتی گەیشتوون، لە ژیانی پاشای پەرییەکانیان دەچواند و مێروولەکانیش بۆ ئەم ژیانە دوورەدەستانە سوێیان دەبووەوە. مێروولەکان پڕیان دەدایە ئەم ڕۆژنامانە، کە ژیانی ئەوانیان دەخوێندەوە و خۆیانیان لەبری ئەوان دادەنا، خەیاڵی فیلبوون هەڵیدەگرتن.

سوڵتان، فیلەکان و پەپووەکان، بە جۆش و شەوقەوە بە پیر ڕووداوەکانەوە دەچوون و مەست و شەیدا دەبوون. ئەم داهێنانە نوێیانە ئیتر مێروولەتییان بە یەکجاری لە بیر مێروولەکان بردبووەوە. هیچ مێروولەیەک ئەو ڕۆژەی بە بیر نەدەهاتەوە کە مێروولە بووە. مێشکیان شۆردرابووەوە. شەیپوورەکان، ڕادیۆکان، سینەماکان، تەلەڤزیۆنەکان و ڕۆژنامەکان هەر ڕۆژە و ئەوانیان لە قالبێکی نوێ دەدا. مێروولەکان لەگەڵ مێروولایەتیدا، گۆرانیی مێروولەکان، بەیتی باووباپیران، ئەفسانەکان، بەڕەکان، ماڵەکان، کۆشکەکان

و ڕێ و ڕێبازی خۆیشیان لە بیر چووبووەوە. سەیر ئەوە بوو ئیتر هیچ مێروولەیەک نەیدەتوانی هیچ شتێک بخولقێنێ. ئەم داهێنانە نوێیانە، خولقێنەرییان لە چنگ مێروولەکان دەرهێنابوو. هەر مێروولەیەک ئیتر بووبووە مەکینەیەک و بۆ سوڵتانی فیلەکان بەدوای ئاوی حەیات، شیلەی گوڵ و جۆرەکانی خواردندا دەگەڕا، کۆشکیان بۆ دروست دەکرد و کورسییان بۆ دادەتاشی. ئیتر بە هیچ شێوەیەک بیریان نەدەکردەوە.
ڕادیۆکان، ڕۆژنامەکان، تەلەڤزیۆنەکان و سینەماکان تا دەهات زیاتر پەرەیان دەسەند و ڕۆژانە بیستوچوار سەعات بێ ڕاوەستان هاواریان دەکرد: "لەپێناو ئازادی و یەکسانی و برایەتییدا." لە دونیادا هەموو شتێک بۆ ئازادی مێروولەکان بوو. ئەوان مێرووگەلی یەکسان و سەربەخۆ بوون. مێروولەکان لە وشکی بۆیان دەخوارد و لە تەڕی بۆی دەنووستن. چونکە تەلەڤزیۆنەکان، ڕادیۆکان، ڕۆژنامەکان و سینەماکان دەیانگوت مێروولەکان سکیان تێر و جێیان نەرمە، ئەوان باوەڕیان دەکرد. مێروولەی بێچارە، هەروەها باوەڕیان دەکرد بەختەوەرن. ئەم داهێنانانە ئەوانیان ئەفسوون کردبوو...
ئەگەر ڕۆژێک تەلەڤزیۆنەکان گوتبایان شەڕ خاسە، سەرجەم مێروولەکان بەو بڕوایە دەگەیشتن کە شەڕ باشە و هەر مێروولەیەک خۆی بە خودای شەڕ دەزانی. ڕۆژی دواتر، بە مێشکی سوڵتانی فیلەکاندا دەهات کە شەڕ خراپە، تەلەڤزیۆنەکان، ڕادیۆکان و ئەوانی تر

دەیانگوت شەڕ خراوە، ئەمرا مێروولەکان بە جاری دەبوونە دوژمنی شەڕ، خودای شەڕیان دەست بکەوتایە ئەنجن ئەنجنیان دەکرد.
سولتان هەر کاتێ پێی خۆش بوایە، دەیتوانی وا لە مێروولەکان بکا بڵێن: ئێمە مرۆڤین، ماری بواین، تیمساحین، شەهێنین، ئاخر مێروولە و شەهێنیان گوتووە، ئەسپین، ڕێوین، ماسین، ئەخر مێروولە و ماسییان گوتووە، نەهەنگین، کەرگەدەنین، زەڕافەین، ئاخر مێروولە و زەڕافەیان گوتووە، فڕۆکەین، شەمەندەفەرین، کەشتیین، ئاخر مێروولە و کەشتییان گوتووە؟
هەمدیس زستان هاتەوە. پێش هاتنی وەرزی زستان، مێروولەکان کۆشکێکی بلوورینی تریان بۆ سولتان بەرز کردبووەوە کە لە کۆشکەکەی دی بەشکۆتر بوو. بە خۆری دەگوت تۆ دەرمەکەوە ئیتر، من هەم.
کورسییەکی پەمەیشیان بەو ئەڵماسانە داتاشیبوو کە لە نێوەڕاستی ئەرز دەریانهێنابوون. کورسییەکە تیشکی پەمەیی دەهاویشت، سولتان بە ڕادەیەک کورسییەکەی بەدڵ بوو کە لەسەر ترۆپکی چیای دانا و هەفتەیەک بێ ئەوەی دەم لە خواردن و خواردنەوە بدا، چاوی تێبڕی.
لە بینینی کورسییەکە تێر نەدەبوو و نەیدەتوانی چاوی لەسەر هەڵبڕێ. مێروولەکان عەمبارەکانی بن چیاکەشیان لیپاولیپ بە خواردەمەنی ئاخنیبوو.
عەمبارەکان تەژی بوون لە نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی

دونیـــــا. پەپووەکانیشـــــیان فەرامـــــۆش نەکردبـــــوو، عەمبارەکانی ئەودیوی چیایان بۆ ئەوان تا بن میچی پڕ کردبوو.
جـا باسـی بـاخچە تـایبەتییەکەی سـولتان هەر بە زار خۆشە، لەوەتەی دونیا دونیا بوو باخچەیەکی وا تایبەت نەبینرابـــوو. تەنـــانەت بەهەشـــت نەدەگەیشـــتەوە ئەم بـاخچەیە. سـولتان بە بـاخچەکەی سـەرخۆش بووبـوو. سـولتانی فیلەکـان کە خـاوەنی بـاخچەیەکی ئـاوا بـێ، نامرێ، نابێ بمرێ.
سولتان کە سامی مەرگی ڕێ نیشتبوو، هاواری کرد:
"ئەم ئاوی حەیاتە بوو بە چی؟"
فیلەکان، مێروولەکـان، پەپووەکـان و بوونەوەرەکـانی تـر کە گوێیان لە دەنگی بوو، لە جێی خۆیان ڕەق بوون و وەک مێوژۆکە هەڵەرزین.
"هەمـوو شـتێکم هەیە، هەمـوو شـتێک. ئەم دونیـایە هیـی منە. ئاوی حەیاتی من کوانێ؟"
ســـــەرکردەی پەپووەکـــــان لە کاتێکـــــدا بە دەوری قۆرتمەکەیدا دەفڕی، گوتی:
"بەدوایدا دەگەڕێن."
ئەو کاتـــانەی ئـــاوا هەڵـــدەچوو، جـــگە لە ســـەرکردەی پەپووەکان کەس زاتی نەدەکرد لێی نزیک بێتەوە.
"بـــۆچی هێشـــتا نەیانـــدۆزیوەتەوە، لە کـــوێ بەدوایـــدا دەگەڕێن؟"
پۆپەبەرز گوتی:

"گوایە لە بەهەشت هەیە. ئاوی حەیات جگە لە بەهەشت لە شوێنی تر نییە. سوڵتانم، مێروولەکانی عەبدیشت تازە بە تازە توانیویانە ڕێگەی چوونەبەهەشت بدۆزنەوە. بەڵام بەهەشت هێند دوورە نەبێتەوە... مێروولەکان دەمێکە وەڕێ کەوتوون، بەرەو بەهەشت کەوتوونە ڕێ، ئیتر کەی دەگەنێ، کەی ئاوەکە دەدۆزنەوە و دەیهێنن، بەس خوا دەزانێ."

سوڵتانی فیلەکان ئەهوەن بووەوە، خۆشحاڵ بوو ئاوەکەیان دۆزیوەتەوە. گرنگ ئەوە بوو شوێنی ئاوی حەیاتیان بۆ دۆزیبووەوە، دەیانزانی لە کوێیە، مێروولە بەندەکانی هەرچۆنێک بوایە، هەزار ساڵی تریش بوایە، ئاوی حەیاتیان بۆ دێنا.

"هەتا ئەو ئاوە دێ، ئەمن نامرم، وا نییە پەپووی برام؟"

"بۆچی دەبێ بمری سوڵتانم، با دوژمنەکانمان بمرن!"

سوڵتان گوتی:

"زۆر خۆشحاڵم شوێنی ئاوەکەیان دۆزیوەتەوە. باشە، تۆ بۆچی ناچیتە بەهەشت ئاوی حەیات هەڵگری و بیهێنی؟ خۆ تۆ چل ڕۆژ ڕێگەی مێروولە بە چاوترووکانێک تێپەڕ دەکەی."

"هەق بە تۆیە سوڵتانم، بەڵام بەس مێروولەکان و مردووەکان دەتوانن بچنە بەهەشت."

"ئەی کەواتە بۆچی مێروولەکان هەڵناگری و تا بەر دەرگەی بەهەشتیان نابەی؟"

"تەنیا و تەنیا مێروولەکان دەتوانن شوێنی بەهەشت و دەرگەکەی بدۆزنەوە، ئەویش دەبێ بە تەنیا بن."
سولْتان بە بیستنی سەرجەم ئەم ڕوونکردنەوانە شاگەشکە دەبوو. بەرگەی دەگرت، ئاوی حەیات کەی دێ با بێ، ئەو نامرێت و چاوەڕێ دەبێ.
کە زستان هات ڕێگەوبان هەمووی گیران. خواردنێکی ئەوتۆ لەسەر ڕووی زەوی چنگ نەدەکەوت. سولْتانی فیلەکان هێشتا کارگەکانی مرۆڤستانی نەدزیبوو. حالّی حازر پێویستی بەو کارگانە نەبوو. پێویستیش نەبوو لاسایی هەموو شتێکی مرۆڤستان بکاتەوە! مێروولەکان دیسان کاریان نەما، لەسەر شۆستەی شارەکان دەست لەنێو گیرفاندا دەسووڕانەوە. ئێستا ئەو خواردەمەنییە کەمەی فیلەکان پێیان دابوون، بەشی ژیانێکی مەمرەومەژیی دەکرد. سەیرە، ڕۆژێک لەپڕێکا بە بیریان هاتەوە فیلن، خۆیان گەیاندە دارستان و کەفەڵیان بە دارەکان خوراند. وەی کە دونیا خۆشە! ڕۆژێک فیلبوون یەکسانە لەگەڵ ژیانی هەزار ساڵی مێروولەیەک.
مێروولەکان بەمەشەوە نەوەستان، هێندەیان لاڕان خوراندبوو، لەخۆ چووبوون، مەست بووبوون و دیسان وەک فیلەکان هەنگوین، شیلەی گوڵ و گەنمیان داوا کرد. کە سولْتانی فیلەکان گشت ئەمانەی گوێ لێ بوو، دیسان لە ڕقان لە دین دەرچوو، دڵسارد بووەوە و هاواری کرد:

"ئەم مێروولانە چاک نابن، چاک نابن. دیارە دەیانەوێ دیق بکەم."
پۆپەبەرز خۆی تێهەڵقورتاند و بە ئاڵۆزکاوی گوتی:
"دەخیلە سوڵتان، دەخیلە سوڵتان، ئارام بە."
چاوەکانی سوڵتان دەرپەڕیبوون و ڕەگەکانی ملی هەڵمسابوون.
"چما تێناگەی سەرکردەی پەپووەکان، ئەم مێروولانە شێت بوون... هار بوون. ئاخر پار بەوانم نەگوت برادەران، مێرووڵە مێرووڵەیە و فیل فیلە. ئاخ، چەندە شەیپوور، تەلەڤزیۆن، سینەما و ڕۆژنامە و کتێبم خستە بەر دەستی ئەم سپڵانەوە. ئەمانە چ بوونەوەرگەلێکی بێمێشکن! چ بێمێشکن... ئەمانە نابنە فیل. سەیر کە، پەپووی برام، ئاخۆ من میلیارد میلیارد لەو تەنگدەستانە بەخێو ناکەم، ئەگەر من خواردەمەنیان پێ نەدەم ئایا وەک ساڵی پێشوو لە برسان نایەنەوە لام؟ نانبڕاویان دەکەم، با بزانم چ گوویەکیان پێ دەخورێ."
"ئەمان سوڵتانم، لەسەرەخۆ بە. قەی چی دەکا، هەندێک هەوای فیلبوون بەسەریاندا زاڵ بووە."
سوڵتان هاواری کرد:
"نابێ! نابێ! مار بە بچووکی دەبێ سەری پان بکەیتەوە. ئەمانە ئەگەر لە ئێستاوە وا خوو بە کەفەڵخوراندنەوە بگرن، شیلەی گوڵ داوا بکەن، سبەی چاو دەبڕنە کورسی و کەلـلەسەری من. ئەمانە، ئەم مێرووڵە

هیچوپووچانە چاک نابن، دەبێ هەموویان دەسبەجێ بکوژین.‌"
"نابێ بیانکوژین سوڵتانم."
"بۆچی نابێ بیانکوژین؟"
"چونکە ئەگەر ئەوان نەبن ئێمە ئیتر لەم دونیایە بژیوی خۆمان بۆ دابین نابێ سوڵتانم. ئێمە بە حازرخۆری ڕاهاتووین. ئەوان لە گۆڕێ نەمێنن، ئێمەش لە برسان دەمرین."
سوڵتان گوتی:
"قەت بیرم لەوە نەکردبووەوە. کەوایە وەک ساڵی پار بەشەخۆراکەکەیان لێ دەبڕم. دەنگوباسی ئاسنگەرە شەلەی؟"
"هەواڵێکی نەگەیشتووە سوڵتانم، ئەو مێرووە زەردانەی چوون، هیچ کامیان نەگەڕاونەتەوە. ئێمە ناتوانین وەک پار بەشەخۆراکەکەیان لێ ببڕین، نابێ لێیان ببڕین سوڵتانم."
"تۆ بڵێی چ بەسەر مێروولە قارەمان و لێهاتووەکانم هاتبێ؟"
"سوڵتانی خۆمان، پێم وا بێ نیشانەیەکی باش نییە کە ماوەیەکی وا دوورودرێژ بێ هەواڵ ماونەتەوە. لە خەفەتان خەریکە بمرم. ناتوانم هەواڵێکیان لێ بزانم. تۆ بڵێی چ بەسەر مێرووە زەردەکانمان هاتبێ؟"
"ئەمەم قەت بەدڵ نەبوو سەرکردەی پەپووەکان. دەبوایە تا ئێستا هەواڵێکیان بگا، وا نییە؟ وا دیارە لە

دۆخێکی دژواردان. ناتوانین هیچ یارمەتییەکیشیان بدەین، وا نییە؟"

"ناتوانین سوڵتان، بە شوێنەکەیان نازانین. مێرووە شەلە بەرەو شوێنێکی وا هەڵکشاوە کە لەگەڵ سەرجەم پەپوولەکانم بە ڕۆژان بەدوایاندا گەڕاین و نەماندۆزینەوە."

"دەمەوێ شتێکت لێ بپرسم، سەرکردەی پەپوولەکان."

"فەرموو سوڵتانم."

"ئەم مێروولانەی عەبدی من لە هەموو گۆشە و قوژبنێکی جیهان گوڵ، تۆوی گوڵ، نەمام و شەتڵی نەمامیان هێناوە و جوانترین و سەرسامهێنەرترین باخچەی تایبەتیان بۆ دروست کردووم، وا نییە؟ چیم ویستبێ، بەجێیان هێناوە، وا نییە؟"

"بەجێیان هێناوە سوڵتانم."

"کەوایە بۆچی هێشتا ئاوی حەیاتیان بۆ نەدۆزیومەتەوە، مەرگی من بە ئاوات دەخوازن، وا نییە؟"

"ئەگەری مەرگی تۆ بە مێشکی ئەم بوونەوەرە وردیلانە ناگا سوڵتانی من. ئاوی حەیاتت بۆ دەدۆزنەوە سوڵتانی من. بێت و ئەگەری مەرگی تۆیان بە مێشک بگا، ڕەنگە مەرگی تۆ بە ئاوات بخوازن سوڵتانی من. تۆ لە چاوی ئەوانەوە وەک خوداوەندێک نەمری، سوڵتانی من."

سوڵتان، بەم قسانەی سەرکردەی پەپوولەکان شاگەشکە بوو و قاقا پێکەنی:

"کەواتە قەت ئەقڵیان نایبڕێ کە منیش دەمرم، هەهەهە هەهەهە!"
"نایبڕی سوڵتانم، لە سۆنگەی ئەوانەوە چۆن ئەم ئاسمان و چیا و دەریا و ئاوانە نەمرن، فیلە زەبەلاحەکانیش بەم جۆرە نامرن."
"هەهە هەهەهە، دەی ئێستا چ لەو مەسەلەی کەفەڵخوراندنە بکەین؟ کەواتە ئەقڵیان نایبڕێ کە منیش دەمرم ها... باشە، باشە، زۆر باشە. ئاسنگەرە شەلەش ئەگەر زیندوو بێ، بڕوا بە مردنی من ناکا، وا نییە؟ مێرووە ڕیشسوورەکانی تریش، وا نییە؟"
"وایە سوڵتانم."
"فرە خاسە! سەرجەم مێرووله و پەلەوەر و جرِوجانەوەرەکان پێیان وایە من نەمرم، قەت نامرم، وا نییە؟"
"وایە سوڵتانم. ئێستا پێشنیارێکم بۆ تۆ هەیە سوڵتانی خۆم."
"بێژە سەرکردەی پەپووەکان، برای دلێر و بەجەرگ و ئاقڵم، تۆ نەبوایەی من لەم دونیایەدا بە تاقی تەنیا چیم دەکرد، بێژە."
"سوڵتانم، واز لەو مێروولانە بێنن. باشە خۆیان پێ فیلە، وەک فیل هەڵسوکەوت دەکەن و لاسای فیلەکان دەکەنەوە... مێروولەکان بوونەوەرگەلێکی یاخین، لاساییکردنەوەی فیلەکان دەسەلمێنێ کە ئەوان سەرجەم خەسڵەتەکانی خۆیان لەدەست داوە. نیشانەی ئەوەیە

پرتووکاون، دڵیان ڤالا بووە و ناخیان ڕزیوە... من زۆر کەیفخـــۆش و بەخـــتەوەرم ئەوان بەم دۆخەی ئێســـتا گەیشتوون. خۆبەفیل زانین سـەرباری هەموو شتێک تا ئەو ئاســتەی بەرەنگـاری تـۆ ببـنەوە، نیشــانەی ئەوەیە ئیــدی ئەوان تــا ڕۆژی قیــامەت بە بیریــان نــایەتەوە مێـروولەن، تـا ڕۆژی قیـامەتیش گـوێڕایەڵی تـۆ دەبـن. هەموو ویست و داخوازییەکی ئێمەش هەر ئەوە بوو، وا نییە؟ بۆ ئەم مەبەستە فێری زمانی فیلەکانمـان نەکردن؟ بــۆ ئەوەی خۆیــان و مێرووولایەتــی فەرامــۆش بــکەن، شــــەیپوورمان لە چیاکــــان، لەســــەر درەخــــت و ڕێگەوبانەکــان دانەنــا؟ بــۆ ئەم مەبەســتە تەلەڤزیــۆن، ڕادیـۆ، ڕۆژنــامە، ڕۆمــان و ســینەمامان لە مرۆڤەکــان نەکـڕی؟ بـۆ ئەوەی قەت بە بیریـان نەیە کە ڕۆژێـک لە ڕۆژان مێرووولە بـوون، بە کـۆمەڵ کـاری قورسـمان پـێ نەســپاردن؟ ئەوەتــا مێرووولەکــان وەپــێش ویســت و چـاوەڕوانیی ئێمە کەوتـوون، لەوە بترازێ وەک فیل نـا، بەڵکو وەک مێرووولە بوونەتە فیل."

سـوڵتان بە بیسـتنی ئەم قسـانە دیسـان کەیلـی خۆشـی بـوو. ئەگەر ئێسـتا پێیـان گوتبـایە ئـاوی حەیاتیـان بـۆ هێناوە، هەر ئەوەندە خۆشـحاڵ دەبوو.

"باشـە، زۆر باشـە. بە دڵـمە. هەر ئەوەمـان دەویسـت. بـا شـەیپوورەکان، تەلەڤزیـۆن و ڕادیـۆ و ڕۆژنامەکـان هەر ئێسـتا وەگەڕ بخەیـن... پەیتاپەیتـا سـەبارەت بە گرنگیـی کەفەڵخوراندن قسە بکەن و سـەدان و هەزاران فیلم لەم

بـارەوە بەرهەم بێـنن. هەمـوو شـەوێ ئەمـانە بـۆ مێروولەکان نمایش بکەن. با هەم کەفەڵیان بخورێنن و هەم فیلم ببینن."

"ئەمە دوایـین زەبـرە لە مێروولایەتیـی مێروولەکـان سـوڵتانی مـن. لەمەوبەدوا هـیچ مێـروولەیەک تەنـانەت وشەی مێروولە ناهێنێتە زمان."

سوڵتان گوتی:

"وەرە، وەرە پۆپەبەرزی برام، وەرە با لەو شـەرابە ئاڵە بخۆینەوە کە مێروولەکانم دڵۆپ دڵۆپ لە مرۆڤەکانیان دزیـوە و بەرمیلەکـانی منیـان پـێ پڕ کـردووە، وەرە با مەست بین. ئەمڕۆ خۆشترین ڕۆژی ئێمەیە."

لە بـــاخچە تـــایبەتەکەی کۆشـــک کە لە بـــاخچە هەڵواسراوەکانی بابل جوانتر بـوو، سـوڵتان و پۆپەبەرز پـێکەوە دەسـتیان بە خـواردنەوەی ئەو شـەرابە ئـاڵ و گەشە کرد کە تامی ئیکسیری دەدا.

شەو بوو، مانـگ تـریفەی دەهاویشـت. مێروولەکانی نێو دارسـتان ئەوەنـدەی تـر بە تـریفەی مانـگ دڵخـۆش بووبـوون، کەفەڵیـان پەیتاپەیتـا بە دارەکانـدا دەهێنـا و دەیانخوراند. شـەیپوور، تەلەڤزیـۆن، ڕادیـۆ و سـینەما و ڕۆژنامەکانی سوڵتان کـاریگەرییەکی بەرچاویـان لەسـەر مێروولەکـان دانـابوو. چیـی وای نەمـابوو کەفەڵـی مێروولەکان بە زۆر خوراندن بۆ هەمیشە لەناو بچێ. بە جۆش و شەوقەوە کەفەڵیان بە دارەکاندا دەهێنا. کتوپڕ، لە دوور ڕا، لە داوێنی چیاوە دەنگێک پێل بە پێل بەرەو

ئەوان هات. مێروولەکان ئەم دەنگەیان، ئەم گۆرانییەیان لە سەردەمانی کۆنەوە دەناسی، بەڵام لە بیریان چووبووەوە. گوێیان بۆ دەنگەکە ڕاداشت. دەسبەجێش، لەگەڵ بیستنی گۆرانییەکە خێرا کەفەڵیان لە دارەکان دوور کردەوە. گۆرانییەکە تا دەهات بەرزتر دەبووەوە. دەنگەکە لە ڕۆژهەڵات، ڕۆژئاوا، باشوور و باکوورەوە دەهات. لە ئەرزی نەدەما و لە ئاسمانەوە دەهات. لە گژوگیا، لە گوڵ، لە گەڵا و لە ئاوەوە دەهات، بەرەو کوێ ئاوڕیان داباوە، ڕوویان لە کوێ بکردایە، دەنگەکە لەوێوە دەهات، لە ئەستێرەکان، لە ئاگر و لە مژی سەرووی دارستانەکەوە دەهات. ئەم سترانە هەندێک شتی بە بیر ئەوان دەهێنایەوە. شتێکی لە دەروون و دڵی ئەواندا دەورووژاند. گۆرانییەکە تەواو نەدەبوو. دۆخێکی سەیر بەسەر مێروولەکاندا زاڵ بووبوو، هاتنەوە سەر خۆ، دەستیان کرد بە هەوڵدان، وەجموجوڵ کەوتن... چ ڕووی دەدا؟ خودی مێروولەکانیش نەیاندەزانی چ باسە، بەس هەستیان دەکرد گۆڕانکارییەکیان تێدا دروست دەبێ. گۆرانییەکە هەر وا بەردەوام بوو. مێروولەکان دەتگوت لە مۆتەکەیەکی قووڵ و تاریک ڕادەچەنن. تا بەرەبەیان، نە خۆیان خوراند و نە خەوتن، لە دارستان چاوەڕێ مانەوە و گوێیان بۆ ئەو گۆرانییە شل کرد کە لە هەرچوار لاوە دەهات. گۆرانییەکە دەیگوت ئەم مێروونە. سەردەمانێک ئەم وەک مێروو، مێروولە

بوویـن، ئێمەش وڵاتەیل و شـارگەلی وەک بەهەشـتمان هەبوو. خۆمـان کارمـان دەکرد و خۆمـان دەمـانخوارد. وەک یەک بووین، ئازاد بووین. ئەودەم مێروولە بووین، مێروولە! هیچ کاممان بەم جۆرە فیلی ساختە نەبووین. وا گاڵتەجـاڕ و گـرگن و لاسـاکەری فیلەکـان نەبـووین. سـەردەمانێک بە هـیچ شـێوەیەک سـووکایەتیمان بە یەکتـری نەدەکـرد و ئیزنمـان نەدەدا کەسـیش سـووکایەتیمان پـێ بکـا. وا پەسـت و زەبـوون و کـوێلە نەبووین. سەربەخۆ بووین، ئاشتییانە دەژیـاین، یەکسـان بووین. گۆرانییەکە دەیگوت چی هەبوایە پێکەوە بەشمان دەکرد، خـواردن و خواردنەوەمـان پێکەوە بوو، فەرق و جیاوازیمـان لەنێواندا نەبوو. گۆرانییەکە وای دەگوت و بە زمانی مێروولەکان بوو، مێروولەکانیش کە پێیـان وا بوو زمـانی خۆیـان بیـر چووەتەوە وەک جـاری جاران لێـی تێدەگەیشـتن. وێـڕای گـۆرانییەکە، کڵـپەی تاسـە بەرەبەرە لە ناخیانـدا گـڕی دەسـەند: پێکەوە گۆرانیمـان دەچڕی، پێکەوە تۆڕەکەمـان لە ئـاو دەردەهێنـا، پێکەوە ئاسنمان دەتواندەوە، پێکەوە زەویمان دەکێڵا. بە یەکەوە هەنجیـری بە هەنگوین، شـیلەی گوڵ، هەنـوێن و دەنـکە گەنممـان کـۆدەکردەوە، دروێنەمـان دەکـرد و بەیەکەوە نانمان دەخوارد. یەخسیر و کوێلە نەبووین. گۆرانییەکە دەیگـوت بەر لەوەی ئـاوا ببیـنە کـوێلە و یەخسـیر و ژێردەسـتەی فیلەکـان، پێکەوە شـارەکانمان ئـاوا دەکـرد، بەیەکەوە وڵاتمـان دەڕازانـدەوە. گـۆرانییەکە دەیگـوت

کۆشـــکی ســـوڵتانی فیلەکـــان دەڕوخێنـــین، هـــێلانەی پەپوولەکان دەشێوێنین، وەچەی زەردەڵەکان لەبن دێنین.
مێروولەکان هێزی بوون و نەبوونیان هەیە. گۆرانییەکە دەیگـوت لەم گەردوونەدا هێزێـک لە سـەرووی هێـزی مێروولەکـانەوە بەدی نـاکرێ. کـێ کۆشـکی سـوڵتانی دروسـت کـردووە؟ کـێ ئەهرامەکـانی سـاز کـردووە؟ بـاخچە هەڵواسـراوەکانی بابل کـاری کێن؟ ئەو هەمـوو شـــار و وڵاتە دەســـتکردی کـــێن؟ مێروولەکـــان... گـۆرانییەکە دەیگـوت بەو هێـزەوە، بەو هێـزە زۆرەوە دەرەقەتـــی فیلەکـــانیش دێـــن. گـــۆرانییەکە دەیگـــوت... گۆرانییەکەش لە چیاکان و دەریاکانەوە دەهات، لە خـاک و دارستان و ڕووناکییەوە فیچقەی دەکرد. مێروولەکان ئەم دەنـگە، ئەم گۆرانییەیـان بـاش دەناسـی و هێنـدەی تینی دڵەکانیان شارەزای بوون.
هەموو تێکڕا، لە کاتێکدا سپێدە وەک گوڵی شۆق بەسـەر دونیادا دەپشکووت، هاواریان کرد:
"مێروولە، مێروولە."
ئەوسـا دارسـتانیان بەجـێ هێشـت و بەرەو شـــار و وڵاتەکانیان کەوتنە ڕێ. ئیتر هەموویان هەمدیس بیریان لەوە دەکردەوە کە ئێمە مێروولەین. ئەسـەفیان دەخـوارد و لەبەر خۆیانەوە دەیانگوت چۆن وا خێرا بووینە فیل، ئەویش فیلێکی ورد و بچووکی بەقەد نووکەدەرزییەک.

دیســـــان بووبـــــوونەوە بە مێـــرووولە، گـــۆرانییەکە مێرووولایەتیـی لە نـاخی ئەوانـدا ژیانـدبووەوە، بەڵام بە هیچ کلووچێک ئەقڵیان بڕی نەدەکرد فیلەکان ببەزێنن.

پەپووەکـان یەکسـەر سـوڵتانیان ئاگـادار کـردەوە و گوتیان:

"مێرووولەکـان دارسـتانیان بەجـێ هێشـتووە و بەرەو وڵاتەکانی خۆیان دەگەڕێنەوە."

سوڵتان:

"چ باسە پۆپەبەرزی برام؟"

سەرکردەی پەپووەکان:

"سـەرم سـوورماوە مێرووولەکـان دارسـتانیان بەجـێ هێشـتووە. ئـاخر ئەوان زۆریـان دڵ بە فیلبـوون و کەفەڵخوراندنی وەک فیلەکان خۆش بوو."

"دەبێ چ رووی دابێ؟"

"پرسیم و لێکۆڵینەوەم کرد، بەڵام هیچم دەست نەکەوت سوڵتانم. گوایە شـەوێک، یـان ئێوارەیەک یـان نیوەی شـەو، کتـوپڕ کەفەڵیـان لە دارەکـان هەڵبڕیـوە. لەنێـو دارستان فزەیان لێ براوە و لە جێی خۆیان رەق بوون. وەک ئەوە وا بـووە گـوێ بـۆ شـتێک بگـرن، بەڵام هـیچ دەنگێکیش نەبیستراوە."

سوڵتان گوتی:

"سەیرە. ئەم مێرووولانە سەیرترین بوونەوەرەکانی سـەر رووی زەوین. راست و چەپیان هیچ دیار نییە..."

"عەرزی سوڵتانی خۆم بکەم، پاشان لەگەڵ گزنگی خۆرەتاو لە دارستان دابڕاون سوڵتانم و بەرەو وڵاتەکانی خۆیان ملی ڕێگەیان گرتووە."
"شتێک لە گۆڕێیە سەرکردەی پەپووەکان. ئەگینا هیچ کەس لەم دونیایە بە خورتوخۆڕایی واز لە کەفەڵخوراندن ناهێنێ. سەرجەم بوونەوەرەکانی دونیا بەس بۆ کەفەڵخوراندن هاتوونەتە دونیا. بوونەوەرێک ئەگەر جارێک هەلی کەفەڵخوراندنی بەدەست هێنا، ئیتر بۆ هەتاهەتایە وازی لێ ناهێنێ. شتێک لە گۆڕێیە، ئەم مێروولانە بەڵایەکمان بەسەر دێنن ئەمان بەڵا."
"ئەمنیش بەپەرۆشم سوڵتانم."
"هیچ هەواڵێکی مێرووە شەلەتان نییە، ئەی هیی مێرووە زەردەکانی خۆمان؟"
پۆپەبەرز هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی:
"نەخێر. بەداخەوە نەخێر سوڵتانی خۆمان."
سوڵتان، قەدەرێکی زۆر سەری شۆڕ کردەوە و لە گژ فکران ڕۆچوو، ئەمڕا قۆرتمەکەی بەسەر پشتیدا سووڕاند، بەرەو درەختەکان هەنگاوی نا، کەفەڵی بە نێوقەدی دارچنارێکەوە نا، مەکینەی خوراندنی بە کەفەڵیەوە نا و بیری کردەوە.
"چەند مەلت بۆ چاودێریی مێروولەکان ناردووە؟"
"حەوسەد و حەفتاوحەوت مەل، سوڵتانم."
"ئاخۆ ئەم ژمارەیە بۆ چاودێریکردنی ئەوان بەسە پۆپەبەرزەکەم؟"

"ئەم مەلانە زۆر تیژفڕن سوڵتانم، زۆر بەدەستوبردن. ئەو پەپوانەن تازە بوونەتە فیل."
"حەوسەد و حەفتاوحەوت مەلی تریش هەڵفڕێنە، خۆیشت بەدوای ئەواندا بچۆ، زوو هەواڵی نوێم بۆ بگێڕەوە."
"بان سەرم سوڵتانم."
پۆپەبەرز خێرا لەگەڵ حەوسەد و حەفتاوحەوت مەلی تر هەڵفڕی، گەیشتە وڵاتی مێرووولەکان. لە دووررا، لە شارەکانەوە هاواری ڕقی بیست. کە نزیکتر بووەوە، لە دەنگەکان تێگەیشت. دەنگەکان تێکڕا دەیانگوت:
"ئەم مێرووولەنە، ئەم مێرووولەنە. ئێمە هەڵخەڵەتاین، درۆیان لەگەڵ کردین. ئێمە فیل نین، مێرووولەین!"
پۆپەبەرز گوتی:
"ئەی هاوار! ئەوەی نەدەبوو ڕوو بدا، ڕووی دا."
یەکسەر فڕی و هەواڵەکەی بە گوێی سوڵتان گەیاند.
سوڵتان:
"با هەر مێرووولە بن. پێیان دەڵێم مێرووولە یانی چی."
پۆپەبەرز گوتی:
"کەوایە سوڵتانم، یانی ئەو هەمووە شەیپوور، ئەو هەموو تەلەڤزیۆن و سینەما و ڕادیۆ و ڕۆژنامانەی ئێمە بەکەڵکی هیچ نەهاتن؟"
"چۆن بە کەڵکی هیچ نەهاتن، بۆ نەتبینی، ئامادە بوون بمرن، بەڵام واز لە فیلێتی نەهێنن. پێم گوتی ئەم ماستە بێ موو نییە. ئەم ئاسنگەرە شەلە ڕێگەیەکی کاریگەرتر

و بەهێزتری لەم شەیپوور و تەلەڤزیۆن و سینەمایانەی ئێمە دۆزیوەتەوە. نابێ هیچ شتێکی تر لە گۆڕێدا بێ."
"بەڵام سوڵتان، من زۆرم لێکۆڵینەوە کرد، هیچ شتێک لە گۆڕێدا نییە."
سوڵتان وەک ئەوەی فەرمانێک دەربکا، گوتی:
"هەیە. شتێک هەیە، بەم زوانە بۆمان دەردەکەوێ."
ڕێک لەم کاتەدا پەپوویەک بە پەلەپەل، بە پۆپە و باڵی شێواو گەیشتە جێ، لەسەر لقی دارچنارەکەی نزیک قۆرتمەکەی سوڵتان نیشتەوە و گوتی:
"ئەمانە سوڵتانم، هەموو مێروولەکان گوێیان لە گۆرانییەک بووە. گۆرانییەکە پێیان دەڵێ ئێمە مێروولەین، نابێ کوێلە بین."
سوڵتانی فیلەکان بە فیزەوە گوتی:
"دەبا کوێلە نەبن بزانم. با پێنج تا دە فیلێک ڕەوانەی وڵاتی مێروولەکان بکەم، لەو دەرگەوە وەژوور بکەون و لەو دەرگەی ترەوە بێنە دەرێ، مێروولەکان وەک هەویر لە بن پێدا پان بکەنەوە، ئەودەم دەیانبینم، با هەر نەبنە کوێلەی فیلەکان. با دیسان خواردەمەنییان لێ ببڕم... بڕۆ پێیان بڵێ مێروولایەتیم لێ قەدەغە کردوون. هەر ئێستا بەرەو وڵاتی مێروولەکان هەڵفڕن و پێیان بڵێن هیچ مێروولەیەک بۆی نییە بڵێ من مێروولەم."
پەپووەکان گوتیان:
"بان سەرمان سوڵتانی خۆمان."

ئەوسا بەرەو وڵاتی مێروولەکان هەڵفڕین، فەرمانی سوڵتانیان بە سەرجەم مێروولەکان ڕاگەیاند.
ئێستا ئیتر گۆرانییەکە بە هەموو وڵاتەکان و بە هەموو شارەکاندا بڵاو بووبوووە. لە هەموو شوێنێک دەبیسترا. لە خاک، لە ڕووناکی، لە تاریکی، لە هەورەکانەوە، لە هەموو شوێنێک، لە هەموو شوێنێک دەبیسترا، مێروولەکان لە خەو و هۆشیاریدا هەر ئانوساتێ گوێیان لەم گۆرانییە دەبوو. دەیانبیست و هەموو پێکەوە، بە یەک زار گۆرانییەکەیان دەگوتەوە.
ڕێک ئەو شەوە، ڕێک ئەو ساتە، گۆرانییەکە لە بنکەی ڕیشسوورەکانیش بیسترابوو. مێرووە ڕیشسوورەکانیش بە جۆشێکی لە وەسف نەهاتوو، بە ڕاوەستان و لەسەرخۆ چوونەوە گوێیان بۆ گۆرانییەکە ڕاداشتبوو.
لەو ڕۆژەوە بەدوا گۆرانییەکە بێ ڕاوەستان دەگوترایەوە. دەنگی گۆرانییەکە لە هەموو شوێنێکەوە دەهات، لە ئاسمانەوە، لە تاشەبەردەکانەوە، لە گوڵ و دەوەنجارەوە. لەو دەمەوە گۆڕانییەکە بیسترابوو ڕیشسوورەکانیش هاوکات دەیانگوتەوە. گۆرانییەکە بڕانەوە و کۆتایی بۆ نەبوو، وەک ڕووبارێکی بەخوڕ، چەشنی فورات و نیل و دانووب لە سەرچاوەی ڕەسەنی مێرووولایەتییەوە هەڵدەقوڵی و دەخرۆشا.
مێرووە شەلەی ڕیشسوور کە لە خۆشیان ڕیشەکانی تاڵ تاڵ بریسکەیان دەهات، لە فەرماندەی پرسی کە لە تەنیشتی ڕاوەستابوو:

"ئەم گـــۆرانییە دەبیســـــی، ئەم گـــۆرانییە کـــۆنەی مێرووولەکان؟"
فەرماندە بە سەرسوورمانەوە پرسیی:
"کام گۆرانی؟"
ئەوەی ڕاســـتی بـــێ ئەو نەک هەر گـــۆرانی، بگـــرە بچووکترین دەنگی نەدەبیست.
ئاسنگەری شەل گوتی:
"ئەو گۆرانییە. گرنگترین گۆرانیی ڕابردوو و داهاتووی مێرووولەکان."
"کێیە گۆرانییەکە دەچڕێ؟"
مێرووە شەلە گوتی:
"هەمـــوو گەردوون. چیاکـــان، بەردەکـــان، ئاســـمانەکان، ئەستێرەکان و خۆر ئەم گۆرانییە دەچڕن. ماسیی نێو ئاو، ماری وشکایی و جڕوجانەوەر دەیچڕن."
ئاسنگەر وای گوت و خۆیشی گۆرانییەکەی گوتەوە.
فەرماندە گێل گێل لێی دەڕوانی، بەس دەیبینی ئاسنگەر جارجـــارە لێوەکـــانی دەبزوێنـــێ، بچـــووکترین ســـرتەی نەدەبیست.
"گۆرانیی مێرووولەکان لە یاسای فیلەکان بەهێزترە، تێدەگەی جەنابی فەرماندە، ئەم دەنگە دەبیستی؟ گۆرانیی مێرووولەکان وەک یاساکانی سروشت وایە، هێندەی یاساکانی سروشت پتەوە، خورتە، ئەم دەنگە دەبیستی؟"
فەرماندە گوتی:
"گوێم لێ نییە."

ئاسنگەر گوتی:
"تۆ غەزەبت لێ گیراوە."
فەرماندە گوتی:
"ڕاستە. من مێرووە ڕیشسووریکی غەزەب لێ گیراوم، ئەگەر غەزەبم لێ نەگیرابێ، فیلەکان بەم جۆرە ماڵ و هێلانەی منیان دەشێواند؟"
گۆرانییەکە هەر وا بەردەوام بوو. ئاسنگەری شەل، هەموو شتێک و فەرماندەکەی تەنیشتیشی لە بیر چووبووەوە، گۆرانییەکەی دەگوتەوە و ئاگای لە خۆی نەمابوو.
بەم ڕەنگە چەند ڕۆژ و چەند شەو لەگەڵ گەردوون ئەم گۆرانییەیان گوتەوە، ڕیشسوورەکان سەرەدەریان لێ دەرنەکرد، ئاسنگەرە شەلەیش هەر وا. بەرەبەیانێک بینییان کە بەشێک لە ڕیشسوورەکان بۆ خوارێ، بۆ دەشت، بەرەو وڵاتەکانیان شۆڕ دەبنەوە.
ئاسنگەرە شەلە بە ترسەوە گوڕاندی:
"بۆ کوێ، بۆ کوێ؟"
ئەوانی تر خوێنسارد و لەسەرەخۆ گوتیان:
"کۆیلایەتی ئیتر بەسە. تا کەی ئاوا چاوەڕێ دانیشین؟ سەد هەزار ساڵیش چاوەڕوان بین، هیچ شتێک ڕوو نادا. ئێمە دەڕۆین."
ئاسنگەری شەل پرسیی:
"بۆ کوێ باشە؟ بێ پرسی من بۆ کوێ ملی پێوە دەنێن؟"

"دەچینەوە وڵاتەکانی خۆمان."
"فیلەکان دەتانکوژن لەوێ."
فەرماندە لە پشت ئاسنگەر ڕا هاواری کرد:
"ناتوانن بتانکوژن. ناتوانن بتانکوژن."
"دەچین خەندەق بە چواردەوری وڵاتەکاندا لێ دەدەین و خەندەقەکان پڕ دەکەین لە ئاو. فیلەکان ناتوانن بەسەر ئەم خەندەقانەدا باز بدەن و پێ بنێنە وڵاتەکانمانەوە، ئێمەش بەم جۆرە لەژێر چنگی فیلەکان ڕزگارمان دەبێ."
ئاسنگەری شەل گوڕاندی:
"مەحاڵە، فیل گوێیان بە خەندەق نابزوێ، بەسەریدا باز دەدەن."
فەرماندە لە پشت وی ڕا هاواری کرد:
"فیلەکان ناتوانن خەندەقەکان تێپەڕێنن، ئێوە بڕۆن و خۆتان ڕزگار بکەن."
بەم جۆرە خەندەقچییەکان کەوتنە ڕێ.
پاشان دەستەی فشەکەرەکان لەو لا ڕا هات و بەدەم ڕێوە دەیانگوت:
"دەیسووتێنین، دەیڕوخێنین، وڵاتی فیلەکان لەگەڵ خاکدا یەکسان دەکەین."
ئاسنگەری شەل گوتی:
"بۆ کوێ، بۆ کوێ؟"
فشەکەرەکان وەڵامیان دایەوە:
"بەرەو ڕزگارکردنی نەتەوەی مێروولەکان."

بەدوای ئەوانیشدا مێروولە نووسەکەکان هاتن. ئەمانە دەیانویست بە فیلەکانەوە بنووسێن و لە بەردەم جموجوولیان ببنە ئاستەنگ. دوای ئەوان، چاودەرهێنەرەکان تێپەڕ بوون، ئەمانە دەیانویست بچنە نێو چاوی فیلەکانەوە و چاویان هەڵبکۆڵن. بەدوای چاودەرهێنەرەکاندا، بیرهەڵقەنەکان پەیدا بوون کە بەتەما بوون چاڵ لێ بدەن بۆ ئەوەی فیلەکان بکەونە ناوی و بمرن. بەدوای ئەوانیشدا بزمارژەنەکان دەرکەوتن، ژمارەی بزمارژەنەکانیش کەم نەبوو، ئەوان دەیانویست دەوروبەری وڵاتەکانیان بزمارڕێژ بکەن و گەرەکیان بوو بەم جۆرە مێروولەکان ڕزگار بکەن. بەدوای بزمارژەنەکاندا، تەفرەدەرەکان تێپەڕ بوون، ئەمانە کەسانێک بوون دەیانگوت نا بۆ ڕیشسوور و فیلەکان، بەڵێ بۆ مێروولەی ئازاد و سەربەخۆ. بەم قسانە بەنیاز بوون بەشێک لە فیلەکان هەڵبخەڵەتێنن، فیلەکان دژ بە یەکتر دنە بدەن و لەگەڵ ئەو فیلانە ببنە یەک کە لایەنگری مێروولەکانن و نەتەوەکان بگەیەننە کەناری ئازادی و سەربەخۆیی. زۆر دەستەی تری مێروولە هاتن و چوون، مێرووە شەلەش لەسەر ڕێگە ڕاوەستابوو و لە هەموویانی دەپرسی:

"بۆ کوێ، بۆ کوێ، هاوڕێیان بۆ کوێ؟"

مێروولەکانی تر دەیانگوت:

"بەرەو ئازادی."

جگە لەمە هیچی تریان نەدەگوت.

بەم جـــۆرە لە مـــاوەی چەنـــد ڕۆژێکـــدا بـــنکەی ڕیشســـوورەکان چـــۆڵ بـــوو، تەنیـــا ئەو مێـــرووولانەی ئاسنگەری شەلیان خۆش دەویست، متمانەیـان پێی بوو و بڕوایان پێ دەکرد، لە لای مانەوە، هەروەها فەرماندە و بەشێک لە پیاوەکانی فەرماندەش.

مێرووە ڕیشسوورە شەلەی ئاسنگەر زۆر خەفەتی بەم ڕووداوانەوە خوارد. دەیزانی چ بەسەر مێروولەکان دێ و خوێن لە دڵی دەچۆڕا.

کە پەپووەکـان هەواڵەکەیـان بە گـوێی سـوڵتان گەیانـد، سوڵتان زۆر خۆشحاڵ بوو. بە پێکەنینەوە گوتی:

"بێـــدەنگ بـــن، نقەتـــان لێـــوە نەیەت. بـــا خەنـــدەق بە چـواردەوری وڵاتەکانیانـدا لـێ بـدەن، منـیش دوو فـیلان دەنێرم، تەختەیەک لەسـەر خەندەقەکە دابنێن و بیکەنە پـرد، جـا ئەوجـار بـزانن چـۆن دیسـان شـار و وڵاتیـان خاپوور دەکەمەوە، هەهە هەهە."

مێروولەکـــان بە جۆشوخرۆشـــەوە، شـــەو و ڕۆژ بە دەوری شـار و وڵاتەکانیانـدا خەندەقیان هەڵدەقەند و بە ئـاو پڕیـان دەکـردن. کە کارەکەیـان تەواو بـوو، چـوونە لای سوڵتان و گوتیان:

"ئێمە ئیتر دەمانەوێ ئازاد و سەربەخۆ بژیین."

سوڵتان گوتی:

"بەڕاست، ئاوا گەلحۆکانم؟ کەواتە دژی من ڕادەپەڕن؟"

"بەڵێ ڕادەپەڕین، دەی جا چییە؟!"

سوڵتان گوتی:

"یانی، یانی پێتان وایە نەتەوەکانی مێروولە دەتوانن دژی ئەو فیلە زەبەلاحانە ڕاپەڕن؟"
مێروولەکان گوتیان:
"پێمان وا نییە، ڕادەپەڕین، دیارە ڕاپەڕیوین."
سوڵتانی فیلەکان یەکبەخۆی پێکەنی، دەستی بە سکی گرت و پێکەنی، وا پێکەنی تەنانەت ئاسنگەری شەلیش گوێی لە قاقای پێکەنینەکەی بوو. مێرووە شەلە بە بیستنی ئەم قاقایە گوتی:
"ئەی هاوار، مێروولەکان ئەوەی نەدەبوو بەسەریان بێ، بەسەریان هات. سوڵتان تەنانەت مێروولەیەک لەسەر ڕووی زەوی ناهێڵێتەوە، ڕەگوڕیشەمان لەبن دێنێ. من لەمێژە ئەم پێکەنینە دەناسم، نیشانەیەکی باش نییە."
سوڵتان پاش ئەوەی تێر تێر پێکەنی، گوتی:
"دەی فیلەکانم، عەسکەرەکانم، دەی پەپووەکانم، مەلەکانم، دەی، ئەمڕۆ ئیتر نابێ لە وڵاتی مێروولەکان بەرد لە سەر بەرد و سەر لە بان جەستە بهێڵنەوە."
فیلەکان خەندەقەکانیان ڕوخاند، وەک ئاوخواردنەوە بەسەریاندا تێپەڕ بوون و چوونە نێو وڵاتی مێروولەکانەوە. گرموهۆڕ و شین و ڕۆڕۆ بەرز بووەوە، تەپوتۆز لەو ناوە ڕابوو. هەر فیلە و بە جارێک بە میلیۆن مێروولەی لە بن پێیەکانیدا پان دەکردەوە، خۆڵ خەڵتانی خوێن بووبوو.
تاوێک دواتر مێرووەکان دەستەوداوێنی سوڵتان بوون و گوتیان:

"ئێمە خەتایەکمان کرد، تۆ مەیکە سولّتانم. بمانبوورە. بمانبوورە بۆ ئەوەی تا ڕۆژی قیامەت کۆیلە و غولامی تۆ بین. نەمانزانی مێروولەکان هیچ کات دەرەقەتی فیلەکان نایەن. فریوی ئەم ڕیشسوورانەمان خوارد، ئازادیی ئێمە، تۆین، سەربەخۆیشمان هەر وا..."
دیسان سەرکردەی پەپووەکان ناوبژیوانی کرد، فیلە توورە و ڕقهەستاوەکانی ئەهوەن کردەوە و باقیی مێروولەکانی لە مردن ڕزگار کرد.
ئەو مێرووە ڕیشسوورانەی تر کە هەڵاتبوون و خۆیان گەیاندبووە سەر گۆپکەی درەختێکی بەرز، گوتیان:
"ئێمە هەڵەمان کرد، با تێکەڵ بە دەستەی چاودەرهێنەران بین، چاوی فیلەکان هەڵبکۆڵین و تۆڵەی خۆمان بکەینەوە."
ئینجا مێروولەکان بۆ ئەوەی چاوی فیلەکان دەربێنن، پەلاماری فیلستانیان دا. یەکسەر خۆیان بە چاوی فیلەکاندا کرد. چوونە لای سولّتان و گوتیان:
"ئێمە ئازاد و سەربەخۆین. ئێستا چاوی سەرجەم فیلەکان هەڵدەکۆڵین."
سولّتانی فیلەکان یەک بە خۆی پێکەنی، دەستی بە سکی گرت و قاقا پێکەنی. کە ئاسنگەری شەل گوێی لە قاقای پێکەنینەکەی بوو، گوتی:
"ئەی هاوار، ئای، وەیش، دیسان چەند وڵاتێکی مێروولە لەگەڵ خاکدا یەکسان دەبن."
ئەمرا سولّتانی فیلەکان دەستوری بە فیلەکان دا:

"قۆرتمەکانتـان پـڕ بـکەن لە ئـاو و بە چـاوی یەکتریـدا بڕشێنن."
فیلەکان وایان کرد.
فیلەکـــان هەمـــدیس پەلامـــاری وڵاتەکانیـــان دا و مێرووڵەکان دیسان دەستەوداوێنی سوڵتان بوونەوە.
دیســان هەنــدێک مێــرووڵە کە خۆیــان لەنێــو گەڵاکــانی دارێکـــی بەرزدا حەشـــار دابـــوو، ئەمجـــارە تـــێکەڵ بە دەســـتەی مێـــرووڵە نووســـەکەکان بـــوون. مێـــرووە نووســـەکەکانیش یەک یەک و دوو دوو بە ئەســـتوورایی بستێک بە فیلەکانەوە نووسان و سوڵتانی فیلەکان دیسـان لە قاقـای پێکەنینـی دا، کاتێـک مێـرووی شـەل گـوێی لە پێکەنینەکەی بوو، کسپەی لە جەرگی هەستا و گوتی:
"وەی، وەیـش، ئـاوا بـڕواتە پـێش سـەرجەم وڵاتەکـانی مێرووڵە وێران دەبن."
سوڵتانی فیلەکان ئەمری بە فیلەکانی کرد:
"خۆتان بە ئاوێدا بدەن، ئاوی چۆمێ."
فیلەکان بەرەو ئاوی چۆمی ڕایان کرد، خۆیان هاویشتە نێو قووڵایی ئاوەکانەوە. ئاو، مێرووە نووسەکەکانی لێ کردەوە و لەگەڵ خۆیدا بردنی.
دیـــارە پێشـــتر فیلێـــک چیاگەڕەکـــانی لە دەشـــت پـــان کردبووەوە. ئەوان نەیانتوانی جارێکی تر پشتیان ڕاست بکەنەوە و لە چیاکان بدەن.
سـەرجەم تاقیکردنەوەکـان مـایەپووچ بـوون، سـوڵتانی فیلەکـان بە هەر تـاقیکردنەوەیەک پێکەنـی، ئاسـنگەری

شەل گوتی وەیش، چەند ولاتێکی مێروولەکان خاپوور بوون، مێروولەکان هانایان بۆ سوڵتان هێنا و پۆپەبەرز ناوبژیوانی کرد و سوڵتان لێی بوورین.
لە ئاکامدا ئەو ڕیشسوورانەی زیندوو مابوونەوە، نەخۆش، سەقەت، ماندوو، بێهیوا، دەست لە پێ درێژتر گەڕانەوە شوێنی خۆیان. لە ڕوویان هەڵنەدەهات سەیری مێرووە ڕیشسوورە شەلەی ئاسنگەر بکەن. لە کاتی ڕۆیشتندا ئەمانە چەندەیان جنێو بە ئاسنگەری شەل دابوو. مێرووە شەلەی بێچارەیان بە خیانەتکار و نانەجیب و ترسنۆک لەقەڵەم دابوو. ئاسنگەری شەل گشت ئەمانەی فەرامۆش کرد، بە هاوکاریی مێروولەکانی دی، برینەکانی ئەوانی پێچایەوە و دڵخۆشیی دانەوە. ئیتر هەوڵێکە، هەر هەوڵێکیش ئەگەری سەرنەکەوتنی هەیە. هەرچی بێ شکستیان خواردبوو.
بەڵام سوڵتانی فیلەکان لە خۆشیان شاگەشکە بووبوو. ئیتر هیچ مێروولەیەک، بەتایبەت پاش ئەو هەموو تاقیکردنەوەیە، جارێکی تر تەنانەت زات ناکا بیر لە ڕاپەڕین بکاتەوە. لەوە بترازێ مێروولەکان تەواو بووبوونە دوژمنی ڕیشسوورەکان. ئەگەر لە شوێنێک ڕیشسوورێکیان ببینیبا، یەکسەر خوێن بەری چاوی دەگرتن و لە چاوترووکانێکدا ئەو ڕیشسوورەیان هەنجن هەنجن دەکرد. لەنێو مێروولەکاندا ئیتر تەنانەت ڕیشسوورێک نەیدەتوانێ هێلانە بکا. هەڵبەت ئەم

تـاقیکردنەوەیە دیسـان خەسـاری گەورەی بە فیلسـتان گەیانـدبوو. گەلەک لە ولاتـانی مێـرووولە خـاپوور بووبـوون، بە میلیـارد مێـرووولە مردبـوون. ئەمە بەو مانـایە دەهـات کە مێروولەیەکـی کەمتـر کاریـان بـۆ فیلەکان و پەپووەکان دەکرد.

سەرکردەی پەپووەکان گوتی:

"خەمت نەبێ سوڵتانم. زاوزێی ئەم مێرووولانە لە سـەرجەم بوونەوەرەکانی گەردوون زیاترە. لە ماوەی چەند ساڵێکدا ڕەنگە هەزار قاتی ئەم کوژراوانە بێننە دونیا."

سوڵتان پێکەنی و گوتی:

"ئـاوا؟ زۆر باشـە! ئەوە ڕەگـی ڕیشسوورەکانیشـمان وشک هەڵگەڕاند، جارێکی دیکە نە دەتوانن مێروولەکان هەڵبەخەڵەتێـنن و نە دەتـوانن یەک بگـرنەوە. بەڕاسـتی ئەو ڕیشسـوورانە بـوونەوەرگەلێکی سـاویلکە و بوودەڵەن. بەشێکیان ویستبوویان فیلەکان لە دژی ئێمە دنە بـدەن. فیلەکانیشـمان پـێش ئەوەی هەواڵەکەم پـێ ڕابگەیەنـن، هەموویـان پـان دەکەنەوە... هەهەهە، هەهەهە..."

ئاسنگەری شـەل گوێی لەم پێکەنینەش بـوو، لە داخـان مرد و زیندوو بووەوە و گوتی:

"ئێستاش لەبەر سەرکەوتنەکەی پێدەکەنێ. ئاخ، ئەوانەی ئێمە چەند گەمژە بوون."

"جـا لەمەوبەدوا شـەپیوورەکان، تەلەڤزیۆنەکـان، ڕۆژنامەکـان، ڕۆمانەکـان و بەتـایبەتییش ئەو

ڕۆشنبیرانەی لە قوتابخانەکانی بە فیلکردنی مێروولەکان خوێندوویانە، ڕۆڵیان دەبێ. نەتەوەکانی مێروولە ئیتر هیچ ترووسکەیەک بەدی ناکەن. نائومێدی سەرچاوەی ژێردەستییە. نائومێدی دایکی کۆیلەتییە. نائومێدی کرمی دڵە. پەرە بە نائومێدی دەدەین. دوانزە مانگی ساڵ، شەو و ڕۆژ، ئەو ڕۆشنبیرانەی لە قوتابخانەکانی بەفیلکردنی مێروولەکان خوێندوویانە و بوونەتە بەڕێوەبەری ڕادیۆ، سینەما، تەلەڤزیۆن و ڕۆژنامەکان، پەیتاپەیتا نائومێدی دووپات دەکەنەوە."

"لە ئێستاوە دەستمان پێ کردووە..."

"ئەی دەنگوباسی زەردەڵەکان؟"

"ئەوان لە لای ڕیشسوورەکانن. یەکە یەکە چاودێریی ڕیشسوورەکان دەکەن، تەنانەت گوێ لە هەناسەیان دەگرن و بە منی ڕادەگەیەنن."

"ئەی دەنگوباسی ئاسنگەری شەل؟"

پۆپەبەرز گوتی:

"نازانم."

سوڵتانی فیلەکان گوتی:

"لەمەوبەدوا ئاسنگەری شەل تەنانەت ئەگەر زیندووش بێ، پارەیەکی چرووک ناهێنێ، هیچی پێ ناکرێ. لێرە بەدواوە چیی لەدەست نایە... کام مێروولە جارێکی تر بەپێی گەلحۆیی وی هەڵسوکەوت دەکا و دژی ئێمە ڕادەپەڕێ؟"

پۆپەبەرز گوتی:

"مێرووه شەڵه مردووه. ئەگەر نەمردایه، ڕێگەی نەدەدا مێروولەکان وا گەمژانه بجوولێنەوه."
سوڵتانی فیلەکان یەکبەخۆی و له ناخی دڵەوه پێکەنی. پێکەنینەکەی چیا و چیا دەنگی دایەوه. ئاسنگەری شەل هەمدیس گوێی له دەنگی پێکەنینەکەی بوو و له نووکی پێ تا تەوقی سەر هەڵلەرزی.

ئەو مێروولانەی بووبوونە ڕیشسوور، پۆل پۆل خۆیان دەگەیانــدە بــنکەی ئاســنگەری شــەل. تۆقــاو، ناهومێــد، مانــدوو و مــردوو. بــنکەکە لە مــاوەی چەنــد مانگێکــدا مێرووڵەی تری نەدەگرت و مێرووڵەکان دیسان بەرد و شاخ و دۆڵ و داوێنەکانیان داپۆشی.
مێرووڵەکان بە گەردنکەچی، بێ جووڵە لە چیا خۆیان لەبەر تــاوێ هەڵخســتبوو، متەقیــان لێــوە نەدەهــات و بیریـــــان دەکـــــردەوە. لە خـــــوارێ ڕا، لە وڵاتـــــی مێرووڵەکـــــانەوە، ئەوانەی وەک خۆیـــــان بووبـــــوونە ڕیشســـوور لە شـــاخیان دەدا و بە هەواڵـــی نـــاخۆش و دڵـــــتەزێن و ڕقبـــزوێنەوە دەهـــــاتن. ئیتـــــر لە بـــــنکە، مێرووڵەکـــان هێنـــدە زۆر بـــوون وەســـەر یەکتـــری کەوتبوون.
لە وڵاتەیلــی مێرووڵەکــان دۆخەکە تــا دەهــات ئــاڵۆزتر دەبوو. هەر فیلە و کۆشکێکی بۆ خۆی بە دروستکردن

دابــوو. هەر کــام لە فیلەکــان لەو کۆشــکەی خۆیانــدا کورســییەک وەک کورســییەکەی ســوڵتانیان بە داتاشــین دابوو. هەروەها ڕێک وەک بـاخچە تـایبەتەکەی سـوڵتان، لە سەرجەم دار و گوڵەکانی دونیا باخچەی تایبەتیان بە دروستکردن دابوو... هەتا مێروولە زیـاتر پێشکەشـیان بکـردایە، ئەوان زیاتریـان دەویسـت. چییـان بە مێشـک بگەیشتایە، حەزیان لە چی بوایە، ئیشتای چیان بکردایە، وەک دەسـتوور بە مێروولەکانیـان ڕادەگەیانـد. سـوڵتان حەوت کۆشکی تر و شانزە کورسیی ڕەنگاوڕەنگی تری بـۆ خـۆی بە دروسـتکردن دابــوو. ســەرجەم چیــا و دۆڵەکــان و قەراغ دەریــا گەورەکــان پــڕ بووبــوون لە کۆشـک و سـەرا و باخچەکـانی سـوڵتان. مێروولەکـان هـێلانەی وایـان بـۆ هەر کـام لە پەپووسـلێمانەکان چـێ کردبوو کە لەوەتەی مەلەکان مەل بوون هـێلانەی وایـان بە چاو نەبینیبوو. هێلانەکان لەسـەر گۆپکەی بەرزتـرین چنارەکـان بـوون. مێروولەکـان خواردنیـان بـۆ دەبـردنە سـەر گـۆپکەی چنارەکـان و نێـو هێلانەکانیـان. ئەگەر ئاوی حەیاتیشیان بۆ سوڵتان دۆزیباوە و بۆیان هێنابـا، پاش چل شەو و چل ڕۆژ جەژن و ڕەشبەڵەک سوڵتان ئـاوەکەی دەخـواردەوە و نەمـر دەبـوو. بەدوای ویـدا، فیلەکـانی تـر و پەپووەکـانیش داوای ئـاوی حەیاتیـان دەکـــرد و مێروولەکـــان دیســـان وێـــڵ و عەوداڵ، ڕووتوڕەجـاڵ دەکەوتـنەوە ڕێ. خـوارەوەی چیاکـان و گردەکـان هەمـووی بووبـووە عەمبـار و عەمبارەکـانیش

لیپاولیپ بوون لە خواردەمەنی جۆراوجۆر. مێروولەکان دیســـان عەمبـــاری دیکەیـــان دروســـت دەکـــرد و بە خواردەمەنییە نایابەکانی دونیا دەیانئاخنین. مێروولەکان ســاڵ دەری دوانـزە مانـگ کاریـان دەکـرد، نەیانـدەزانی وەســـتان و ڕاوەســـتان چیـــیە. کـــوا ئەو ڕۆژانەی ڕایانـدەکردە دارسـتان و لاسـایی فیلەکانیـان دەکـردەوە، کــوا ئەو ڕۆژانەی داوای هەنگــوین و شــیلەی گــوڵ و گەنمیـان لە سـوڵتانی فیلەکـان دەکرد، کوا وەک جـاران دەتـوانن چاویـان بە ڕووی سـوڵتان بـکەوێ؟ تەنـانەت سـاڵێ جارێـک دەیـانتوانی پـۆپەبەرز ببیـنن. سـەرجەم خەزێنەکـانی سـەرزەوی و ژێرزەوییـان بـۆ فیلەکـان و پەپووەکان گواسـتبووەوە... سـەرەڕای ئەمەش هـیچ فیـل و پەپووەیەک تەنانەت لەوانـی نەدەڕوانـی. ڕۆژانـی پێش شکسـت و کۆکـوژی بـۆ مێروولەکـان بووبـووە خەون و خەیاڵ.

هەتـا مێروولەکـان زیـاتر داواکـانی ئەوانیـان بەجـێ دێنـا، فیلەکان و پەپووەکان پتر و پتر و پتریان دەویست. ئیتـر هـیچ مێـروولەیەک خەو و پشــووی نەمــابوو. بەرامــبەر بەم کــارە تاقەتپڕووکێنــانە، فیلەکـان بەس ئەوەنــدەیان خــواردەمەنی پــێ دەدان کە نەمــرن. عەمبارەکــان پــڕ بووبوون و لێیان دەڕژایەوە، خواردەمەنییەکان دەڕزین. بەڵام فیلەکان تەنانەت تۆسقاڵێک زیاتر لە بەشـەخۆراکی ڕۆژانەیـان پـێ نەدەدان. چ حیکمەتێکـی تێـدابوو کە ئەم مێرووە برسی و ڕووتەڵانە کە لەبەر کارکردن تەنـانەت

دەرفەتـــی ســــەرخورانـدنیان نەبـــوو، وەک خیزوخـــۆڵ زاوزێیان دەکرد؟ مێرووە مێیەکان پەیتاپەیتا بە ملیارد هێلکەیـان دەکـرد. ئەمەش تـا بڵێی بە قـازانجی فیلەکـان بـوو. فیلەکــان تــا دەهــات زلتــر و قەڵەوتــر دەبــوون. پەپووەکان بە ڕادەیەک هەڵمسابوون کە وای لێ هـاتبوو نەتـوانن هەڵبفـڕن. هەڵـۆ ڕەشــەکان لە ترسـی فیلەکـان نەبــوایە، بە چێــژ و تــامەوە ئەو پەپووەسـلێمانانەیان دەخــوارد، هەر ڕۆژە و هەزار پەپــووی تەڕ و تازەیــان وەبەر دەنـدووک دەدا. کـاتێ هەڵوکـان پەپووەکانیـان وا چەور و قەڵەو و بـێ جموجـووڵ دەبینـی، ملیـان شـۆڕ دەبووەوە و ئاویان لە زار دەهاتە خوار.
ســـوڵتان، بە کۆشــک و مەزرا و خەزێــنە و عەمبــار و باخچەکانیـدا دەگەڕا و دەیگـوت: "ســاڵی داهــاتوو دەبـێ داهاتمـان دە قـاتی ئەمســاڵ بێ." سـاڵی داهـاتوو، داهـات بیســت قـات زیـاتر دەبـوو، ســەرباری ئەمەش سـوڵتانی نێوچەوانی تێک دەنـا و دەیگـوت: "سـاڵی داهـاتوو دەبێ سـەد قـات بـێ." مێروولەکـان پـێش ئەوەی تـووڕە بـن، سـەریان سـووڕ دەمـا. ئەو هەمـووە خـواردەمەنییە، ئەو هەمـووە مـاڵ و موڵـک و خەزێـنەیە بەشـی سـوڵتان و نەوە و نەتـیجە و سـەد وەچەی وی دەکـرد، تـا قیـامەت بەس بوو، بگرە زیاتریش بوو... ئەگەر تا قیامەتێک و تـا پێنج قیـامەت ژیابـا، دیسـان ئەم خواردەمەنییـانە بەشـی فیلەکــانی دەکــرد. ئــێ کەواتە ئەم فیــل و پەپــوانە چ دەردێکیــان هەیە، بــۆچی بەم جــۆرە شــتەکان کەڵەکە

دەکەن. مێرووە ڕیشسپی و ژیرەکان بیریان بۆ ئەوە دەچوو کە ئەم فیل و پەپووەسلێمانکانە تووشی پەتای کەڵەکەکردن بوون. تێرنەخۆر و نەدیوبدی بوون... تا ئێستا لەنێو بوونەوەرەکانی تردا بوونەوەری وا چڵەک و تێرنەبوویان نەبینیوە. سەرجەم بوونەوەرەکانی سەر ڕووی زەوی لە ئاژەڵی درندەوە بگرە تا پەلەوەر، لە مێشومەگەزەوە بگرە تا جڕوجانەوەر، لە مارەوە بگرە تا چەقەڵ، هەر هەموویان واقیان وڕ مابوو و لە حاند ئەم بوونەوەرە نوێیانە بە یەکجاری حەپەسابوون. ئەم پەپوو و فیلانە، ئەم زگهوڕ و نەخۆشانەی کەڵەکەکردن تەواو شێت بووبوون. بوونەوەرەکان نەیاندەزانی بەرامبەر بەمانە چی بکەن.

لەوە بترازێ ئەم ماڵکۆکردنەوەیە بە چ نرخێک دەستەبەر دەبوو! بە نرخی مەرگ، نەخۆشی، سەقەتبوون، هەژاری و برسێتیی ملیارد ملیارد مێروولە. فیلەکان دڵیان بەم مێرووڵانە نەدەسووتا، هەروەها ئەوانیان خۆش نەدەویست و لە هەر دەرفەتێکدا سووکایەتییان پێ دەکردن. سەرەتا سوڵتان دەیگوت مێروولەکان لە ڕەگەزی ئێمەن و ئەوانیش بڕوایان کردبوو. لەپێناو هەر پارووپەکی ئەوان کە لە چاوترووکانێکدا هەڵیاندەقورتاند، ملیۆنان مێروولە گیانیان دەسپارد. بۆ ئەو خواردەمەنییەی لە عەمبارەکاندا دەڕزا و ئەو بەرهەمەی زیادەی بێ ئەوەی تۆسقاڵێکی بە مێروولەکان بدرێ، دەخرایە نێو

دەریاکانەوە، بە میلیارد مێروولە ڕەنجیان چەشتبوو، خوێنیان ڕشتبوو و گیانیان سپاردبوو.
مێرووە ڕیشسوورە شەلەیش گوێی لەو هەوالانە دەگرت کە لە خوارەوە، لە فیلستان و ولاتی مێروولەکانەوە دەهاتن و لە داخان خەریک بوو شێت بێ، بەلام چیی لەدەست دەهات...
پەیتاپەیتا دەیگوت:
"ئەمانە شێت بوون، شێت بوون. دواجار لە دونیادا ئەم چاخی شێتییە، ئەم چاخی زەبوونییە، ئەم چاخی نەوسنی و خۆپەرستییەش بەسەر دەچێ، بەلام تۆ بلێی کەنگێ؟" دەپەشۆکا و خەفەتی دەخوارد. ئەو هەمووە شێتی، خۆپەرستی و زولم و پەستییەی تەنانەت شایانی فیلەکان و شایانی هیچ گیانەوەر و هیچ بوونەوەرێک نەدەبینی. ئەو کاتەی مێروولەکان ڕزگاریان بێ، فیلەکان و وەچەی فیلەکانیش شانبەشانی مێروولەکان بەختەوەر دەبن. ئەو هەمووە پەلەقاژە، خۆپەرستی، زەبوونی و زولم و ئەشکەنجەیە لە پای چی؟ ئەم فیلانە شێت بووبوون، بەلام شێتیش سنوورێکی هەیە. فیلەکان و پەپووەکان کە ئەم زولم و زۆردارییەیان لەسەر مێروولەکان پەیڕەو دەکرد، لە ترسان شێت دەبوون. مێروولەکانیان بچووکتر لە مێروولەیەک دەبینی، بەلام لەگەل ئەوەشدا لە ترسان خەو لە چاویان نەدەکەوت. گرفتاری گەورەترین غەزەبی دونیا، واتە غەزەبی ترس بووبوون. ئەگەرچی بارستای سەد سال خواردن لە

عەمبارەکانیان دابوو، بارتەقای هەزار ساڵ، دە هەزار ساڵ عەمبارەکان تەژیی زیڕ بوو، دیسان لەوە تۆقیبوون سبەی برسی بمێننەوە. لە بای هەڵکردوو، لە ئاوی ڕەوان، لە تیریژی ڕۆژێ، لە ئاسمان، لە زەوی، لە بۆنوبەرامەی دونیاگری گوڵ و لە باڵی ناسکی پەپوولە دەترسان، دەترسان و شتیان کەڵەکە دەکرد، شتیان کەڵەکە دەکرد و دەترسان.

لە وڵاتی مێروولەکان و لە بنکە ئیتر هەموویان وە زاڵە هاتبوون. ئەو مێروولانەی بووبوونە ڕیشسوور و لە وڵاتەکانەوە هاتبوون، بێ پسانەوە سمێڵیان لە سمێڵی یەکتری دەخشاند. بەردەوام دەیانگوت چ بکرێ باشە، چ بکرێ باشە، چ بکرێ باشە؟ چ بکرێ باشە، چ بکرێ باشە؟

مێرووە ڕێشسوورە شەلەیش بەردەوام هەم پرسیاری لە خۆی و هەم لە هەر ڕیشسوورێک دەکرد کە تووشی ببوایە، چ بکرێ باشە، چ بکرێ باشە، کێرد گەیشتووەتە ئێسک، چ بکرێ باشە؟

دوای ڕووداوە گەورەکە، یانی پاش ئەو تێکچوون و کۆکۆژییە، سەرجەم مێروولەکان بە ڕیشسوور و ئەوانی ترەوە، متمانەیان بە مێرووە شەلە و هاوڕێیانی، مێرووە ڕیشسوورە دەست قرتماغە بەستووەکان کە لەگەڵ وی لە بنکە مابوونەوە و شەڕی فیلەکانیان نەکردبوو، پەرەی سەندبوو. لە قسەی ئەوان لایان نەدەدا.

مێرووه شەلە شەو و ڕۆژ دەیخوێندەوە، گوێی لەو مێروولانە دەگرت لە وڵاتی مێروولەکانەوە دەهاتن، لە ڕیشسوورەکان بەگشتی و مێرووە دەست قرتماغە بەستووەکان بەتایبەتی و ڕاوێژی لەگەڵ دەکردن و بیری دەکردەوە. ئەوەی ڕاستی بێ ئیتر سەرجەم مێروولەکان بە مەبەستی دۆزینەوەی ڕێگەیەک بۆ ڕزگاربوون لەو دۆخە بیریان دەکردەوە و لە لێگەڕیندا بوون.

مێرووە شەلەی ئاسنگەر هەر لە ڕۆژانی سەرەتاوە دەیگوت دەبێ چاوەڕێ بین ئاوەکە هەڵبچێ، مێروولەکانی دیکە هیچ لە بیرۆکەی ئاوهەڵچوون نەدەگەیشتن و پێیان ڕادەبوارد. دەیانگوت ئاوی چی و مێروولەی چی. چی بەسەر زاریاندا بهاتایە، چەندەش نەفامانە هەڵسوکەوتیان بکردایە، مێرووە شەلە لە بیرۆکەی هەڵچوونی ئاو پاشگەز نەدەبووەوە.

ڕۆژێک سەرجەم مێروولەکان لە مەیدانەکە کۆبوونەوە و داوایان کرد چاویان بە ئاسنگەری شەل بکەوێ. مەیدانەکە تەنانەت جێگەی یەک لە هەزاری ئەو مێروولانە نەدەبووەوە. تەنانەت بەو یەک لە هەزارەش، ئەگەر لە مەیدانەکە دەرزیت بهاویشتا، وە ئەرزێ نەدەکەوت.

مێرووە شەلە هات، ئەمجارەیان چووە سەر لقی دارمازوویەک، قسەی بۆ ئاپۆرایەکی قەرەباڵغتر دەکرد، بۆیەش دەبوو ئەو دارەی دەچێتە سەری، بەرزتر بێ. هێشتا شوێن پێی قایم نەکردبوو کە ئاپۆراکە تێکڕا هاواری کرد:

"تێگەیشتین، تێگەیشتین، تێگەیشین."
ئاسنگەری شەل لێی پرسین:
"چی تێگەیشتن؟"
"هەتا ئاوەکە هەڵنەچێ..."
"مادام لەمە تێگەیشتوون، بە زووترین کات ڕێگەی بەزینی فیلەکان دەدۆزینەوە. تێگەیشتن لەوەی ئاوەکە دەبێ هەڵبچێ، نیشانەی ئەوەیە ئاوەکە هەڵچووە. هەتا ئاو هەڵنەچێ، هیچ شتێک ناکرێ."
مێروولەکان لە ناخی دڵەوە هاواریان کرد:
"تێگەیشتین، هیچ شتێک ناکرێ."
"کە ئاوەکە قوڵتی دا، دۆزینەوەی ڕێگەی بەزاندنی فیلەکان ئاسانە."
مێروولەکان بەوپەڕی متمانەوە گوڕاندیان:
"ئاسانە. دەدۆزرێتەوە، دەدۆزرێتەوە، دەدۆزرێتەوە!"
زایەڵەی دەنگیان لە چیا و دەشت و زنار و چۆم و دارستان و ئاسمانەکانەوە بیسترا.
تیشکی هیوای نێو دڵی مێرووە شەلەی ڕیشسووری ئاسنگەر زیاتر بریسکەی دا، کەیلی شادی لە سەر دارەکە هاتە خوارێ و بەرەو هێلانەکەی بووەوە. دەبوایە زوو خۆ بگەیەنێتە کتێبەکانی. گەورەترین و کۆنترین کتێبی لە ڕەفەکە دەرهێنا و تا ویستی لاپەڕەکانی هەڵبداتەوە، فەرماندە لە بەردەمی قووت بووەوە و پرسیی:
"مەسەلەی ئەم ئاوهەڵچوونە چییە؟"

مێرووە شەلە ئەوی هەر لە بیر چووبووەوە. قەدەرێک لە سیمای فەرماندەی ڕوانی، بەدوای هەندێک شتدا دەگەڕا، بێ ئەوەی قسەیەک بکا، بەسەر کتێبەکەیدا شۆڕ بووەوە و زوو زوو لاپەڕەکانی هەڵدایەوە.
کتوپڕ گۆرانییەک لە دڵیدا دەستی بە چڕین کرد... سەری لە بان کتێبەکەی هەڵبڕی، گوێی ڕاداشت و لە دەوروبەری خۆی ڕوانی. قەدەرێکی زۆر گوێی لە دڵی ڕاگرت و پاشان گۆرانییەکە تەشەنەی سەند و ئیتر لە هەموو لایەکەوە دەبیسترا. دەنگی گۆرانییەکە لەنێو کتێبەکەش ڕا دەهات. لەو مێروولانەی خەوتبوون، لە زارکی هێلانەکە و لە دیوارەکانەوە دەهاتە دەر. فەرماندەکە تاوێک بوو خەوتبوو، ئاسنگەرە شەلە گوێی لێ گرت، گۆرانییەکە لەوەوە نەدەهات. ڕۆیشتە دەرێ و گوێی بۆ گۆرانییەکە شل کرد، دەنگی گۆرانییەکە لە ئەستێرە، مانگ، شەو، زنار، گیا، ئاو، با، ئاسمانی شین و بن ئەرزەوە دەهات. لە مەیدانەکەی ڕوانی، مێروولەکان مەیدانەکەیان ئاخنیبوو، وەک چۆن هەنگ خەڵیفەکەی پڕ دەکا، پێکەوە لکابوون، ڕاوەستابوون، بێ ئەوەی مووی سەریان ببزوێ، بێ ئەوەی هەناسە بدەن، وەک بەرد لە جێی خۆیان ڕەق بووبوون. ئاسنگەری شەل بەرەو ئەوان هەنگاوی نا، لێیان نزیک بووەوە، ئەوان وەک ئەوەی گیانیان لە جەستە دانەبێ، جووڵەیان لێوە نەهات. ئاسنگەری شەل گوتی:
"چ بووە؟ بەو نیوەشەوە لێرە چ دەکەن؟"

مێروولەکـان وەڵامیـان نەدایەوە، نە جـوولانەوە و نە وایان نواند کە گوێیان لە دەنگی بووە.
ئاسـنگەری شـەل پرسـیی و پرسـیی، بینـی وا لە گـژ فکـرەوە چـوون، کەس نـقەی لێـوە نـایە. پاشـان بەنێـو ئاپۆراکەدا گەڕا و یەکێکە لە کۆنە هاوڕێکانی دۆزییەوە، یەکێـک بـوو لە مێـرووە ڕیشسـوورە قرتمـاغە بەستووەکان... دەستی بە قۆڵیدا کرد:
"ئـادەی پـێم بڵـێ لێـرە چ ڕووی داوە هـاوڕێ؟ مـن بە درێژایـی تەمەنـم شـتی وام لە مێروولەکـان نەبینیـوە، ئادەی پێم بڵێ لێرە چ ڕوو دەدا؟"
ئەوی تـر بە هێمنـی، بە دەنگێـک کە دەبیسـترا و نەدەبیسترا گوتی:
"ووووست، ووووست، گوێمان بۆ گۆرانی ڕاداشتووە."
مێرووە شەلە پرسیی:
"کێ ئەم گۆرانییە دەچڕێ؟"
هاوڕێکەی بە سەرسووڕمان و گومانەوە سەیرێکی کرد:
"چۆن، تۆ گوێت لەم گۆرانییە نابێ، هـاوڕێی ئاسنگەرم؟ چۆن، کەواتە گوێت لێ نـابێ، تۆ لەکنەخۆ سـەرکردەی ئـێمەی، دڵ و مێشـک و بیـری دەسـت قرتمـاغە بەسـتووەکانی. ئەم گـۆرانییە لە هەنـاو و لە هـزری ئێمەوە دێ. ئەم گۆرانییە..."
مێرووە شـەلە بزەیەکی هـاتێ، بـزەکەی لەژێر تـریفەی مانگەشـەودا هێنـدەی هێـوا گەش و جـوان بـوو. ئەوسـا پرسیی:

"چ گۆرانییەکە؟"
هاوڕێکەی پێی گوت:
"لە دڵت بپرسە. گوێ لە دڵت بگرە، گوێ لە تریفەی مانگ بگرە، گوێ لە ئاپۆرای مێروولەکان بگرە، دونیا بەو گۆرانییەی ئێمە پڕ دەبێ لە خونچەگوڵ، گوێ لە دونیا بگرە، گوێ لە ئاوی ڕووبار بگرە، سەرجەم بوونەوەرەکانی دونیا... ئێستا هەموو بوونەوەرەکانی گەردوون لەسەر پێن..."
دوو هاوڕێکە دڵخۆشانە باوەشیان بە یەکدا کرد. گۆرانییەکە تا دەهات زیاترە پەرەی دەسەند و خۆشتر دەبوو.
گزنــگ لە ســەرانی دا، بەو هیــوایەی گزنــگ ڕۆژی هەموومان ڕووناک بکاتەوە، لە کاتی تاوهەڵاتندا، خۆر وەک گوڵێکی سوور لەنێو ئاسماندا دەپشکووت.
مێرووە شەلە بەسەر دارمازووەکەدا هەڵزنا. لەژێر تیشکی خۆردا دارەکە هێدی هێدی خۆی دەشوشت و دەبزووت. مێرووە شەلە دەستی لەسەر دڵی دانا و بەم جۆرە هاتە گۆ:
"دۆستان، هاوڕێیان، نەتەوەی مێروولەکان ئازارێکی زۆریان چەشت. لەوەتەی دونیا دونیایە نەتەوەی هیچ بوونەوەرێک ئەو ئازارەی نەچەشتووە کە ئێمە چەشتوومانە، ئەو زوڵمەی نەبینیوە کە ئێمە بینیومانە."
گۆرانییەکە تا دەهات بڵاو دەبووەوە و لە هەموو گۆشە و قوژبنێکی دونیاوە دەبیسترا. ئەم گۆرانییە وەک دڵ

دەپشــكووت، ئەم گـۆرانييە وەک خۆشەويســتی، تــين، دۆسـتايەتی، جـوانی، برايەتـی، يەكسـانی و ئاشـتی، وەک شـكۆدارترين گـوڵی دونيـا دەپشـكووت. ئـازادی وەک گزنگـی بەرەبەيـان دەپشـكووت. ئـازادی دەپشـكووت و ئەم گـۆرانييە دونيـا و تەواوی ئاسـمانی دەگـرتە خـۆ و ڕووناكی دەكردنەوە.

"هاوڕێيان، باژێر و وڵاتی مێروولەكان..."

ئاپۆرای قەرەباڵغی مێروولەكان كە لەنێو يەک خزابوون و تێک ئاڵابوون، هاودەنگ گوتيان:

"دەزانين، دەزانين."

"بن وڵات و شارەكان..."

ئاپۆراكە هاواری كرد:

"بن ئەرزی هەڵدەكۆڵين، بن ئەرزی هەڵدەكۆڵين."

"كەوايە هاوڕێيان پێشنيارێكم بۆ ئێوە هەيە."

"پێشنيارەكەت لەسەر چاومان وەستا."

"مێرووەيەكی فەرماندە لە خوارەوەيە، بيهێنن بۆ لای من، دەبێ لێرە وەڵامی يەک دوو شتم بداتەوە."

چــوار مێــروولەی گەنــج چــوونە ســەر فەرمانــدە و دەسـتوبرد بە دارمـازووەكەدا وەسـەريان خسـت و لە لای فەرماندەيان دانا.

"ئێسـتا بــێ ئەوەی چـاو بتــرووكێنن، ســەيری مــن و فەرماندە بكەن."

دەستی ڕاستی ڕاداشت، دەستەكانی زل و بەهێز بوون، پـڕی دايە ڕيشـە گەشـەكەی فەرمانـدە و خێرا ڕايكێشـا،

ڕیشە درێژەکە لەگەڵ دەستی هات. لە بن ڕیشە سوورەکە، ڕیشێکی زەرد زەرد دەشنایەوە.

ئاسنگەری شەل گوتی:

"بینیتان؟ فیلەکان مێرووە زەردەکانیان تەنانەت ناردبووە لای منیش، بینیتان؟"

ڕیشسوورەکان بە یەک قورگ هاواریان کرد:

"بینیمان."

"ئێستا هەمووتان لا بکەنەوە و ڕیشی یەکتری بکێشن. هەر کەسەو ڕیشی ئەوی تر ڕابکێشێ."

هەر مێروولەیە و ڕیشی ئەوی تری ڕاکێشا. لە بن ڕیشی سووری زۆر لەو مێرووولانە ڕیشی زەرد بەدەرکەوت.

"مێرووە ڕیشزەردەکان بە ڕیش بگرن."

مێروولەکان هاواریان کرد:

"گرتوومانن."

"سەری ئەو مێرووە زەردانە بپەڕێنن، بیانهێنن لە بن ئەم دارە کۆیان بکەنەوە."

خۆیشی هەر ئەو کاتە ڕیشی زەردی فەرماندەکەی تەنیشتی گرت، سەری لە جەستەی جیا کردەوە و فڕێی دایە بن دارەکەوە. لە بن دارەکە تەپۆڵکەیەک بە کەللەسەری مێرووە زەردەکان هەڵچنرا.

"جا ئێستا پێم بڵێن، بن وڵات و شاری مێروولەکان چۆن هەڵکۆڵین، بە کام هێز، ئاخۆ هێزی ئەوەمان هەیە بن ئەرزی بکۆڵین؟"

مێرووڵەکان هەموو بە یەک زار وەڵامیان دایەوە:
"ئەو هێزەمان هەیە! ئەگەر سەرجەم مێرووڵەکانی سەر ڕووی زەوی یەک بگرن..."
ئاسنگەری شەل وەک تیشکێک بریسکەی هات و گوتی:
"ئەگەر سەرجەم مێرووڵەکانی سەر ڕووی زەوی یەک بگرن..."
مێرووڵەکان، زەوی، خاک، ئاو، ئاسمان و بوونەوەرەکان بوونە گۆرانی و پەیتاپەیتا ئەم وشانەیان دەگوتەوە.
ڕیشسوورە شەلەی ئاسنگەر:
"دەی کەواتە بکەونە ڕێ، بە شار و وڵاتاندا بڵاو ببنەوە، با گۆرانییەکەتان لە دونیادا دەنگ بداتەوە. با گوێچکەیەک نەمێنێ نەیبیستبێ، چاوێک نەمێنێ نەیبینێ، دڵێک نەمێنێ پێی خۆش نەبێ، مێشکێک نەمێنێ بڕوای پێ نەکا. گشت مێرووڵەکانی سەر ڕووی زەوی یەک بگرن."
دونیا دەنگی دایەوە:
"گشت مێرووڵەکانی سەر ڕووی زەوی یەک بگرن."
ئەمرا مێرووڵەکان ملی ڕێگەیان گرت، دەشت، دەریا، دارستان و ئاوە قووڵەکانیان تێپەڕاند و ئەم گۆرانییە هەرە خۆش و هەرە ژیرەیان بە گوێی دووردەستترین سووچی دونیا گەیاند. بوونەوەرێک نەما نەیبیستبێ، مێرووڵەیەک نەما، بڕوای پێ نەهێنابێ... سوڵتانی فیلەکان، پۆپەبەرز و فیلەکانی تریش بیستیان.

سوڵتان بە پێکەنینەوە گوتی:
"هەهەهە هەهەهە، ئەمە گۆ و ئەمە مەیدان مێروولەکان!
گوایە سەرجەم مێروولەکان یەک دەگرن و بن ئەرزی
دەکۆڵن، دە بیکۆڵن بزانم."
پۆپەبەرزیش بەم گەمژایەتییەی مێروولەکان تووڕە
بووبوو.
"دەبا بن ئەرزی بکۆڵن، ڕاوەستن با وایان لێ بکەین
جارێکی تر نەتوانن سەر بەرز بکەنەوە."
سوڵتانی فیلەکان گوتی:
"دەڵێن مێروولە تا باڵی لێ نەڕۆێ، لەناو ناچێ."
پۆپەبەرز وەڵامی دایەوە:
"ئەمانە باڵیان لێ ڕواوە."
"وس‌س‌ست، با کەس هەست پێ نەکا کە ئێمە زانیومانە
ئەوان دەیانەوێ بن ئەرزی بکۆڵن. با ئەم دوا
ئومێدەشیان لە چنگ دەربێنین، پاشان ئیتر تەواوە. پاش
ئەوەی ئەرز کون بوو، ئەو مێرووە شەلەش دەگرین.
وست پۆپەبەرزی برام، وست."
پۆپەبەرز گوتی:
"با بێدەنگ بین."
پۆپەبەرز کە قەڵەو و قورس بوبوو، بە شێنەیی لە
شەقەی باڵی دا و بەسەر وڵاتی مێروولەکاندا هەڵفڕی.
لە خوارێ ڕا دەنگی گۆرانییەکی سەیر دەبیسترا، بە
شێوەیەک کە دەیتوانی دڵی وییش نەرم بکا، گۆرانییەکی
گەرم و دۆستانە و دڵنشین، گۆرانییەک کە ئەویشی

بانگهێشتی جوانی دەکرد. پۆپەبەرز زۆری نەمابوو دڵ بەم گۆرانییە بسپێرێ، بڕوا و جارێکی دیکە نەگەڕێتەوە لای سوڵتان.
خێرا لەوێ دوور کەوتەوە و گەڕایەوە فیلستان، بە هیچ شێوەیەک باسی ئەم گۆرانییەی بۆ سوڵتان نەکرد. گۆرانییەکە کاری تێکردبوو و گۆڕیبووی. بۆی هەبوو سوڵتانیش ڕۆژێک گوێی لەم گۆرانییە ببێ و بەم پێیە بیر بکاتەوە. پۆپەبەرزی بێچارە چۆن زانیبای سوڵتان هەرگیز گوێی لەم گۆرانییە نابێ!
"هەهە هەهەهە!"
سوڵتانی فیلەکان پێدەکەنی، چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوو دوایین زەبر لە مێروولەکان بدا. مێرووە شەلەش وەک هەمیشە ئەم قاقا دووردرێژانەی سوڵتانی بیست، ئەویش بە چوار چاو چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بوو بن ئەو وڵاتانە هەڵبقەنرێ. دەیزانی، دەیزانی ئەوان نەیاندەتوانی بن‌ئەرزی هەموو هەڵکۆڵن، بەڵام با دەستیان پێ بکردایە...
مێروولەکان هاتن و چوون، بە درێژایی شەش مانگی ڕەبەق سەریان بە سەرجەم وڵات و شارەکانی مێروولەکانی سەر ڕووی زەویدا کرد. سەرجەم مێروولەکان دروشمی "گشت مێروولەکانی جیهان یەک گرن"یان گوتەوە. ئەم دروشمەش وەک گۆرانییەک لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوا، بە باشوور و باکووردا بڵاوبووەوە... مێروولەکانیش یەکیان گرت و دەستیان

به هەڵکـۆڵینی بـن ئەرزی کـرد. به نـۆره بـن وڵات و شـــارەکانیان کـــۆڵی. ئەو گـــۆرانییه بەرزەی له دڵەوه دەهاته دەر و شاخوداخ، ئاو و خـاک، ئاژەڵ و پەلەوەر، جرِوجـانەوەر و مرۆڤەکـان دەیـانگوتەوە، هێـزی پـێ دەبەخشین.

پـۆپەبەرز و پەپووەکـانی تـر هەمـوو رِۆژێ، لەگەڵ دەرکەوتنـی خـۆردا، به شـار و وڵاتـی مێروولەکانـدا دەگەرِان، بەسـەر ئەو شـار و وڵاتـانەدا هەڵـدەفرِین و هەواڵ و رِووداوەکانی ئەوێیان به سوڵتان رِادەگەیاند.

به گـوێرەی قسـەکانی پـۆپەبەرز شـارەکان چۆڵوهـۆڵ بـوون، مێروولەکـان یەکیـان نەگرتبـوو و نەیـانتوانیبوو دەست بەکار ببن. سوڵتان خەفەتی بەمەوه دەخوارد.

مێروولەکانیش بۆ ئەوەی هیچ شتێک دیار نەبێ، به رِۆژ کاریان بۆ سـوڵتان دەکرد و شـەوانەش بۆ خۆیـان، ئەو خـۆڵەی لەژێر ئەرز دەریـان دەهێنـا، دەیانشـاردەوه. ئەو هەمووه خۆڵەیان دەبردە کوێ، ئەمەش خـۆی نهێنییەک بوو.

له مـــاوەیەکی کەمـــدا مێروولەکـــان بـــن وڵات و بـــن شارەکان و بن دونیایـان هەڵکەند. بەم جۆره سـەلمێنرا که مێروولەکان له گشت بوونەوەرەکانی تر بەهێزترن و گۆرانییەکەشیان له سەرووی هەموو یاساکانەوەیە.

مێروولەکان بن سەرجەم شارەکان و وڵاتەکانیان بەتـاڵ کرد و به هەڵگیرساندنی ئاگرێکی گەوره لەسـەر دونـدی چیـایەکی سـەرکەش هەواڵەکەیـان به مێـرووه شـەلەی

ئاسنگەری ڕیشسوور ڕاگەیاند. وەستای ئاسنگەر هەر وا لە بن ئەرزی کاری دەکرد، هێشتا لە خواریێ یەک دوو بێڵچە خۆڵ مابووەوە فڕێی بدا، ئەو برە خۆڵەشی دەرهێنابـا، ئیتـر کـارەکەی تەواو دەبـوو. کتـوپڕ گۆرانییەکی شاد کە جوانییەکەی لە وەسف نەدەهات کەوتە نێو دڵیەوە. یەکسەر ڕای کردە دەرەوە و بینیی ئەو ئاگرە لەسەر دوندی چیاکە دایسێ، تا دێ گەورەتر و گەورەتر دەبێ و وەکو خۆر تیشک و گڕی بە دونیادا بڵاو دەکردەوە.

مێرووە شەلەی ئاسنگەری ڕیشسوور بە مێروولەکانی دەوروبەری گوت:

"کەللەسەری ئەو مێرووە زەردانەم بۆ بێنن. ئەوانەی لە چیا سەرمان پەڕاندبوون و ڕامانگرتبوون..."

دیارە کەللەسەری مێرووە زەردەکان ئامادە بوو، لە سەرێ لەنێو کەندالێکدا کۆ کرابوونەوە.

ڕێک لەو کاتەدا کوترێکی بە وێنەی تیشک درەوشاوە لە ئاسمانەوە بەرەو خوارێ خووشی. مێرووە شەلە بەرەو کۆترەکە ڕایکرد و یەکتریان لە باوەش گرت. ئاسنگەری شەل پێی گوت:

"چاوەڕێت بووم، بەخێر بێی برام. چۆن زانیت بن ئەرز بەتاڵ کراوە و چۆن بوو هاتی؟"

کۆترەکە:

"تەقینەوەی پرشنگی سەر دوندی چیاکەم بینی، گۆرانییەکەشم گوێ لێ بوو، لە شەقەی باڵم دا و هاتم."

ئاسنگەری شەل سواری باڵەکانی بوو و گوتی:
"ئەو کەللەسەرانەم پێ بدەن. کەللەسەری ئەو مێرووە زەردانە..."
کەللەسەرەکانیان پێ دا و کۆترەکە هەڵفڕی.
پۆپەبەرز لە باخچەی کۆشکی سوڵتان تووشی بە تووشی ئاسنگەر و کۆترە سپییەکە بوو، دەسبەجێ ئاسنگەرە ڕیشسوورەکەی ناسییەوە. ئەم ماستە بێ موو نییە، دەبێ چ ڕووی دابێ، بەتایبەت کە ئاسنگەر بە سواری کۆتر هاتبوو.
ئاسنگەری شەل گوتی:
"دەمەوێ سوڵتان ببینم."
پێشبەندە سوورەکەی کردبووە ئاڵا و لە باڵی کۆترەکەی چەقاندبوو. ئەم پێشبەندە سوورە وەک شکۆدارترین ئاڵای دونیا، گەرم و جوان و پڕ هیوا لە شەکانەوەدا بوو.
پۆپەبەرز کە خێرا چووبووە لای سوڵتان و گەڕابووەوە، گوتی:
"فەرموون بۆ ناو کۆشکێ. سوڵتان چاوەڕێتانە."
مێرووە شەلە:
"ئێمە ناچینە ژوورەوە، با ئەو بێتە دەرێ."
مێرووە شەلە لەوە دەترسا لە ناوەوە بەڵایەکی بەسەر بێ.
پۆپەبەرز ڕۆیشتەوە ناو کۆشک و هەموو شتێکی بۆ سوڵتان گێڕایەوە. سوڵتان قورس و گران، دەم بە پێکەنین و دڵخۆش لە کۆشکەکە هاتە دەرێ.

ئاسنگەری شەل گوڕاندی:
"با بڕیاری مێرووولەکانت پێ ڕابگەیەنم هۆ سوڵتان!"
سوڵتان بە پێکەنینەوە بە ئاسنگەرە شەلەکەی سەر باڵی کۆترەکەی گوت:
"بێژە. ئەتۆ کێی؟"
مێرووە شەلە گوتی:
"من ئاسنگەری شەلم. ئێمە لە ئێستاوە سەربەخۆیی خۆمان ڕاگەیاندووە. سەرجەم وڵاتەکانی مێروولە بڕیاریان داوە ئیتر هیچ مێرووولەیەک بۆ تۆ، بۆ فیلەکان و پەپووەکان کار نەکەن. وڵاتی مێرووولەکان هی مێرووولەکانن و ئێمە ئازاد و سەربەخۆین."
سوڵتانی فیلەکان پرسیی:
"باش بیرتان لەمە کردووەتەوە؟"
بەدەم پرسیارەکەوە بۆ ماوەیەکی درێژ قاقا پێکەنی.
مێرووە شەلە گوتی:
"بیرمان لێ کردووەتەوە. هەروەها مێرووولەکان دیارییشیان بۆ ناردووی."
"ئادەی بزانم چ دیارییەکیان ناردووە."
سوڵتان کە ئەم قسانەی دەکرد هەر وا پێدەکەنی و گوێچکە چارۆکەئاساکانی دەلەرینەوە.
مێرووە شەلە سەرەتا کەللەی فەرماندەی فڕێ دایە بەردەم سوڵتان. پاشانیش کەللەسەری سەرجەم مێرووە زەردەکان و پەیتاپەیتا دەیگوت:

"بگـره، بگـره، بگـره. ناسـيتنەوە، ئەم كەلـلەسەرانەت ناسييەوە، بگرە بگرە بگرە!"
كاتێک پۆپەبەرز بە سولتانی ڕاگەیاند ئەم كەللەسەرانە هيـی كـێن، سـولتان دەرهەڵ بـوو، كەف لە زاری هەڵدەچۆڕا:
"فيلەكـانم، پەپووەكـانم، عەسـكەرەكانم، بەرەو ولاتـی مێروولەكـان بـكەونە ڕێ، بەرد لەسـەر بەرد و سـەر لەسـەر جەستە مەهێڵنەوە، وەڕێ بكەون!" دەنگی هێند تووڕە ديار بوو، تەنانەت چياكان مچووڕكيان بە پشتدا هات. "ئەم شەلەش دەسبەجێ بگرن و كەللەی بپەڕێنن."
كۆتری سـپی بە بيسـتنی ئەم قسـەيە وەک تيـر فـڕی و ڕۆيشت. ئەو پەپووە قەڵەوانەی نەياندەتوانی باڵەكانيان بجووڵێننەوە، چۆن دەگەيشـتنە سـەر ئەو هەورەتريشـقە سپييە؟
"بۆ پێشەوە، بۆ پێشەوە، بۆ پێشەوە!"
فـيلە عەسـكەرەكانيش بەم سـەربزێوييەی مێروولەكـان زۆر تێـک چووبـوون. لە خـۆڕا ئەو دۆخە ئاسـوودەيان لـێ شـێوابوو. بە ڕقێكـی بێهاوتـاوە پەلامـاری ولاتـی مێروولەكانيـان دا، هەر فيلێـک دەگەيشـتە ئەوێ، ڕمـب بەنێـو ئەرزيـدا ڕۆدەچـوو... هەر فيلێـک گەيشـتبايە، دەكەوتە خـواری. بەم جـۆرە، گشـت ئەو فـيلانەی هێرشـيان كردبـووە سـەر ولاتـی مێروولەكـان، لە ماوەيەكی كەمدا بەو ئەرزەدا ڕۆچوون كە مێروولەكان بنەكەيان بەتاڵ كردبوو.

کاتێک پۆپەبەرز ئەم شکستە تاڵە و ڕاستیی سامناکی لەنێوچوونی سەرجەم فیلەکانی بە سوڵتان ڕاگەیاند، سوڵتان لە داخی ئەم هەواڵە باوەڕپێنەکراوە و لە تووڕەییان، بەقەد بالآی مرۆڤێک بۆ حەوا بەرز بووەوە و هاتە خوارێ. هەروەها بۆیان دەرکەوت کە ئەو ناوە خراپتر لەو کاتانەی بوومەلەرز دێ، دەلەرزێ، هەر کە ویستیان دەم بکەنەوە و بێژن چ باسە، بینییان خاکی بن پێشیان ڕۆدەچێ. کتوپڕ، خاک زاری لێک کردەوە و کۆشک، باغی تایبەت و سوڵتانی فیلەکانی هەڵلووشی. ئەو کاتەی مێروولەکان بن ولآتەکانیان بەتاڵ دەکرد، لە بیریان نەچووبوو بن کۆشکی سوڵتانیش بەتاڵ بکەن.
کورت و کرمانجی، ئەگەر مێروولەکانی سەرانسەری زەوی یەک بگرن...